# نەشتەرگەری شێت

یورگن توروالت

و بۆ فارسی: زەبیحوڵڵا مەنسووری

و بۆ کوردی: شەریف فەلاح

**پێناسی کتێب**

ناوی کتێب: نەشتەرگەری شێت

بابەت: ڕۆمان

و بۆ فارسی: زەبیحوڵڵا مەنسووری

و بۆ کوردی: شەریف فەلاح

نووسینی: یورگن توروالت

شوێنی چاپ: چوارچرا

تیراژ: (١٠٠٠) دانە

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی(١٩٣١ ) ٢٠١٣ راوە.

## بەرایی

کتێبێك کە ئێستا بۆ خوێندنەوە لەبەر دەستت دایە، لە نووسینی پیاوێکی ئەڵمانییە بەناوی "یورگن تورواڵت" کە ساڵی ١٩١٦ی زایینی لە هەرێمی "راین" کە ئەمڕۆکە بەشێکە لە هەرێمی ئەڵمانیای رۆژئاوا لەدایك بووە و دوای خوێندنی سەرەتایی بواری پزیشکیی هەڵبژارد و لە وڵاتانی ئەڵمانیا، فەرەنسا و بریتانیا رشتەی پزیشکیی درێژە پێدا، بەڵام پیشەی پزیشکیی وەك کار هەڵنەبژارد.

یورگن تورواڵت ساڵی ١٩٣٩ی زایینی کە ئەڵمانیا هێرشی کردە سەر هەنگاریا و شەڕی دووەمی جیهانی دەستی پێکرد، رۆیشتە ناو هێزی دەریایی ئەڵمانیاوە و بیرەوەرییەکانی خۆی و رووداوی شەڕە ژێردەریاییەکانی بۆ رۆژنامەکانی ئەڵمانیا دەنووسی.

دوای ئەوەی شەڕی دووەمی جیهانی کۆتایی پێهات و "یورگن تورواڵت" دەورانی سەربازیی کۆتایی پێهێنا، دەستی کرد بە نووسین و لە سەرەتادا بیرەوەرییەکانی خۆی لەبارەی شەڕی دووەمی جیهانی لە چەند کتێبێکدا بڵاو کردەوە و دواتر بڕیاری دا ژیان و بەسەرهاتی "زائربروخ" پزیشکی گەورەی ئەڵمانی لەم کتێبەدا کە خوێنەران لەگەڵی ئاشنا دەبن، بنووسێتەوە.

کاتێك یورگن تورواڵت سوور بوو لەسەر ئەوەی بەسەرهاتی "زائربروخ" لە کتێبێکدا بڵاو بکاتەوە، ئەو نەشتەرگەرە ناودارە کۆچی دوایی کردبوو، ئەویش ناچار بوو بۆ نووسینەوەی ژیان و بەسەرهاتی ئەو پزیشکە پەنا بەرێتە بەر یاریدەدەرەکانی و ئەو نەخۆشخانانەی کە "زائربروخ" تێیاندا کاری کردووە و بەتایبەت نەخۆشخانەی "شاریتی" لە بەرلینی رۆژهەڵات.

یورگن تورواڵت نەیدەویست لەم کۆمەڵەیەدا کتێبێکی پزیشکی بنووسێت، بەڵام لەبەر ئەوەی کتێبەکەی بەسەرهاتی نەشتەرگەرێکی گەورەیە، سروشتییە کە زانیاریی زانستی پزیشکی ژینگەناسی دێنە نێواخن و پێکهاتەی کتێبەکەوە و خوێنەر سوود لەو زانیارییانەش وەردەگرێت.

قارەمانی سەرەکیی ئەم کتێبە، یانی "زائربروخ" لە کۆتاییەکانی تەمەنیدا تووشی شێتی دەوەیی و فەرامۆشی بوو و ئەم گرفتە لە ساڵانی کۆتایی تەمەندا بەرۆکی هەندێ لە پیاوان و ژنان دەگرێت و ئاسایی ترینیان فەرامۆشیی قۆناغی پیرییە کە بەشێك لە بەساڵاچوان تووشی دەبن و تەنانەت ئەو گرفتە ئاساییە بۆ کەسانی دەوروبەریش بەدەر لە مەترسی نیە، چونکە لەوانەیە ژن یان پیاوێکی بەساڵاچوو وادە و بەڵێنییەك کە بە خەڵکی داوە لەبیری بچێت و تووشی سەرلێشێوان و مەترسییان بکات.

ئەزموون دەریخستووە ئەو کەسانەی کە هەتا کۆتایی تەمەنیان هەموو خانەکانی مێشکیان

بەکار بهێنن، تووشی فەرامۆشیی قۆناغی پیری نابن و مامۆستایانی زانستگا لەو دەستە کەسانەن، لەبەر ئەوەی لە قۆناغی بەسەڵاچوویدا چەشنی دەورانی لاوێتی لە بیرەوەریی خۆیان کەڵك وەردەگرن، تووشی فەرامۆشیی قۆناغی پیری نابن.

"زاتربروخ" لەبەر ئەوەی پیاوێکی بیرمەند بوو و چەشنی بیرمەندانی دیکە، لە قۆناغی پیریدا کتێبی دەخوێندەوە و نەیدەهێشت بیر و ئەندێشەی کورت بێنێ، لە هەوڵی ئەوەدا بوو تووشی فەرامۆشی نەبێت کە ببێتە هۆی شێتیی قۆناغی پیری، بەڵام دۆخی رۆحیی "زاتربروخ" دیاردەیەکی دەگمەن بوو و پیاوێکی وەکوو ئەو نەدەبوا لە کۆتایی تەمەنیدا تووشی شێتی و فەرامۆشیی قۆناغی پیری ببێت و بەهۆی ئەو شێتییەوە، ئێستا ئەم کارەساتە لەم کتێبەدا بخوێنینەوە.

یورگن توروالت نووسەری ئەم لێکۆڵینەوەیە ئێستا پیاوێکی شەست و نۆ ساڵەیە و لە هەرێمی "باویر" هەڵکەوتوو لە ئەڵمانیای رۆژئاوا دەژی و خێزاندارە و خاوەن کچ و کوڕێکی گەنجە کە هەر دوویان خێزاندارن.

**زەبیحوڵڵا مەنسووری**

# پێرست

## بەشێك لە كارە گرنگەكانی نەشتەرگەرێك

لە وڵاتی ئەڵمانیا، لە رابردووە ئەو كەسەی كە بەرپرسایەتیی كاروباری ماڵیی كۆلیژێكی پزیشكیی لە ئەستۆ بوو، بەناوی راوێژكار ناوی لێ دەبرا و دوای شەڕی دووەمی جیهانی كە ئەڵمانیا بە دوو وڵاتی ئەڵمانیای رۆژهەڵات و رۆژئاوا دابەش بوو، پیشە و پۆستی راوێژكاری كۆلیژی پزیشكی و نەشتەرگەریش لە ئەڵمانیا وەلا نرا.

سەرەڕای ئەوەی كەلە ئەڵمانیای رۆژهەڵات زانستگاكان وەكوو پێشوو سەربەخۆ نەبوون و هەموان لەژێر ركێفی حكومەتی ئەڵمانیای رۆژهەڵاتدا بوون، لە هەر كۆلیژێكی پزیشكی و نەشتەرگەریدا (راوێژكارێك) بە كاروباری ماڵیی كۆلیژەكە رادەگەیشت.

رێكەوتی پازدەیەمی مانگی مەی ساڵی ١٩٤٨ی زایینی راوێژكارێكی كۆلیژی پزیشكی و نەشتەرگەریی (هاڵ) لە شاری بەرلین چووە ژووری لێپرسراوی تەندروستییەوە.

لەو كاتەدا هێشتا حكومەتی ئەڵمانیای رۆژهەڵات بە شێوەی فەرمی دانەمەزرابوو و شاری بەرلین لەلایەن چوار وڵاتی یەكێتیی سۆڤیەت، ئەمریكا، بریتانیا و فەرەنساوە بەڕێوە دەچوو و بەرنامە و پێڕەوێكی تایبەتی هەبوو، بەڵام بەرلینی رۆژهەڵات كە ئەمڕۆكە وەك پایتەختی ئەڵمانیای رۆژهەڵات دێتە ئەژمار، وەك پایتەختی نافەرمیی ئەڵمانیای رۆژهەڵات دادەنرا.

لە ئەڵمانیا، هەر لەمێژە وا باو بووە ئەو پزیشك و نەشتەرگەرانەی كە بۆ نەخۆشخانە گشتییەكان هەڵدەبژێردران، لەلایەن دایرەی تەندروستییەوە دەستنیشان دەكران و راوێژكارانی كۆلیژە پزیشكییەكان و نەشتەرگەریش لە هەڵبژاردنی پزیشك و دكتۆرانی نەخۆشخانە گشتییەكان (ئەو نەخۆشخانانەی كە بە بوودجەی دەوڵەت یان شارەوانی بەڕێوە دەچوون) رۆڵیان هەبوو، لەو رۆژەدا دكتۆر هاڵ چووە ژووری لێپرسراوی تەندروستیی ئەڵمانیای رۆژهەڵاتەوە هەتا لەبارەی هەڵبژاردنی نەشتەرگەرێكەوە پێكەوە گفتوگۆ بكەن.

دوای ئەوەی كە دكتۆر هاڵ چووە ژووری لێپرسراوی تەندروستییەوە و دانیشت، وتی هاتووم هەتا لە پێوەندیی لەگەڵ یاریدەدەرێكی تازە كە دەبێ لە نەخۆشخانەی شاریتی دابمەزرێت و كار

بکا لەگەڵتان قسە بکەم.

سەرپەرستی تەندروستی وەڵامی دایەوە منیش بیستوومە کە دەبێ دکتۆر "ولفرید" لەو نەخۆشخانەیە کار بکات. دکتۆر هاڵ گوتی: ئاخۆ دەزانن کە دکتۆر ویلفرید ئەندامی حیزبی نازی بووە؟ سەرپەرستی تەندروستی وەڵامی دایەوە لەم مەسەلەیە ئاگادارم، بەڵام پرۆفیسۆر زائربروخ ئەوی وەکوو یاریدەدەری خۆی دەست نیشان کردووە.

دکتۆر هاڵ گەنج بوو و بە باشی "زائربروخ"ی نەدەناسی، هەر بۆیە رایگەیاند ئاخۆ هەر لەبەر ئەوەی کە "زائربروخ" ئەوی وەکوو یاریدەدەری خۆی هەڵبژاردووە دەبێ هەموو یاسا و ڕێوشوێنەکان بخرێنە ژێر پێ؟ ئاخۆ بیر لەوە ناکەیەوە کە ئەگەر ئێوە بەو دەست نیشانکردنە رازی بن، لە سەرەوە لەبارەی ئەم مەسەلەوە چ دەڵێن؟

سەرپەرستی تەندروستی وەڵامی دایەوە خودی (ئۆلبریخت) بەهۆی کەمیی پزیشك بە کارکردنی دکتۆر ویلفرید لەژێر دەستی زائربروخ رازی بووە.

دکتۆر هاڵ کاتێ لەوە گەیشت کە پێشنیاری دکتۆر زائربروخ بۆ ئەوەی کە دکتۆر ویلفرید، لە پۆستی یاریدەدەردا لەگەڵی کار بکات، لەلایەن لێپرسراوانی باڵاوە هاودەنگیی لەگەڵ کراوە، ئیدی دژایەتیی نەکرد و هەستا و لە ژوورەکە وەدەرکەوت.

***

پرۆفیسۆر (فردیناند ـ زائربروخ) لەو ڕێکەوتەدا پیاوێکی تەمەن ٧٢ ساڵ و لە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات دەژیا کە هەتا ماوەیەکی زۆر لەلایەن زۆربەی پزیشکانی ئەڵمانیاوە ئیرەیی پێدەبرا، بەڵام ئەو لە هەمبەر دیتراندا هێندە بەرجەستە بوو کە پزیشکانی دی بەرەبەرە ئەو ئیرەییەیان فەرامۆش کرد و بە پێچەوانەوە ڕێز و حورمەتێکی زۆریان بۆ زائربروخ دادەنا. کەسانێك هەن کە هێندە سەرکەوتن و چالاکیی سەرنجڕاکیشیان هەیە و بریسکانەوەیان خەڵکانی دەوروبەر سەرسام دەکات و رەقیبەکان دێنێتە سەر ئەو باوەڕەی کە قورِ و لیتە بەو ڕووناکییەدا هەڵسوون هەتا ئەوەی وەکوو خۆیانیان لێ بێت و ڕووناکییان لەناو بچێت.

بەڵام "زائربروخ" لەناو پزیشکانی ئەڵمانیا و ئەورووپا، بە چەشنێك بەرجەستە و دیار بوو، کەس بیری لەوە نەدەکردەوە قورِ و چڵپاویدا پێدا بپرژێنێ، چونکە دەیزانی بەو کارە خۆی خراپ و بەدناو دەبێت و بەڵگەی سووکیی خۆی دەداتە دەستی خەڵکەوە.

بەڵام هێشتا لەناو کۆمەڵەی پزیشکانی ئەڵمانیا، هەبوون کەسانێك کە دوای ئەوەی "زائربروخ" پێی نایە قۆناغی پیریەوە، یانی قۆناغی دوای شەست ساڵی، لەناخی دڵەوە هیوایان ئەخواست کە

رۆژێك دادێت دەستەكانی "زائربروخ" تووشی لەرزین دەبن و ئیدی لەوە و بەدوا ناتوانێ نەشتەری پزیشكی بەدەستەوە بگرێت و لە ژووری نەشتەرگەریدا خۆی بنوێنێ.

بەلام سالانی دوای تەمەنی شەست سالیی "زائربروخ" تێپەرین و هیچ ئاسەوارێكی وەكوو لەرزین لە دەستەكانی ئەو نەشتەرگەرە بلیمەتە نەهاتنە دەرنەكەوتن. دوای ئەوەی كەلە ئالمانیا نازییەكان دەسەلاتیان بەدەستەوە گرت، هیتلەر ویستی زائربروخ بەرێتە ناو حیزبی نازییەوە، لەبەر ئەوەی پێگەی هێندە بەرز و دیار بوو كە ئەگەر رۆیشتبایەتە ناو حیزبی نازییەوە، وەكوو پێگەیەكی قورس و قایم دەهاتە ئەژمار، بەلام "زائربروخ" ئامادە نەبوو بچێتە ناو حیزبی نازییەوە. "زائربروخ" لەناو كۆمەلگادا هێندە خاوەنی رێز و حورمەت بوو كە كاتێك نازییەكان كەمتەرخەمیی ئەویان لە هەمبەر حیزبەكەیان دیت، پێچەوانەی ئەو كردەوانەی كە لەگەل كەسانی دیكە دەیان كرد، بریاریان نەدا ئازار و ئەزیەتی بدەن.

هەلكەوتەیی و ناوداریی پزیشكێكی نەشتەرگەر، پێوەندیی بە رێژەی ئەو نەشتەرگەرییانەوە نیە كە ئەنجامی داوە، بەلكوو بەوەوە بەستراوەتەوە كەلە پیشەی نەشتەرگەریدا چە داهێنانگەلێكی خولقاندووە و چ بیرۆكەیەكی تازەی هێناوەتە ئاراوە، "زائربروخ" هێندە رێكاری تازەی لە پیشەی نەشتەرگەریدا داهێنا كە تەنیا یەك لەوانە بەس بوو كە ناوبراو بەناوبانگ بكات و ناوی بۆ هەمیشە بێنێتەوە. یەكەم كەس كەلە سەدەی ئێمەدا نەشتەری پزیشكیی لەناو دلی مرۆڤ خستە گەر، "زائربروخ" بوو كە بە سەركەوتنەوە نەشتەرگەریی دلی ئەنجام دا و بۆ ئەوەی لە كاتی نەشتەرگەریدا خوێن بگاتە جەستەی نەخۆشەكە لە دلی دەسكرد كەلكی وەرگرت.

دلی دەسكردی "زائربروخ" كە یەكێك لە داهێنانەكانی خۆیەتی، وەكوو دلە دەسكردەكانی ئەمرۆ كامل و بێكەمایەسی نەبوو، بەلام سەرەرای ئەوەش بەباشی خوێنی دەگەیاندە لەشی نەخۆش و هەر نەخۆشێك كە نەشتەرگەریی دلی بۆ بكرێ و چاك بێتەوە و درێژە بە ژیان بدات قەرزداری "زائربروخ"ە، چونكە ئەو بوو رێگای بۆ نەشتەرگەر لە دلدا كردەوە. بەرلە "زائربروخ" ئۆلسر گەدە (برینی گەدە)یان بە نەشتەری پزیشكی چارەسەر دەكرد و ئەو پزیشكە بلیمەتە بۆ یەكەم جار، بۆ تیماری ئۆلسر گەدە، تراو (مایع)ی ساردی بەكار هێنا و لە رێگای بۆرییەكی دوو سەرەوە، نەختێ ئەلكول كە رێژەی ساردییەكەی بیست پلەی ژێر سیفر بوو كردییە ناو گەدەی نەخۆشەوە، بە چەشنێك كە لەگەل برینی گەدا وێك بكەون و دووبارە لە بۆریی دووەمەوە هێنایە دەرەوە و دوای ئەوەی كەلە ماوەی چەند رۆژدا و بۆ چەندین جار ئەو كارە دووپات دەبۆوە و برینی گەدەی نەخۆش لە پەنای ئەلكولدا دەمایەوە، برینكە لەناو دەچوو و نەخۆش لە نەشتەرگەری بۆ

دەرمانی برینی گەدە رزگاری دەبوو.

"زائربروخ" یەکەم نەشتەرگەرە بوی لەوە کردەوە کە وێنە لەناو گەدە هەڵبگرێت، بەڵام نەك لە رێگای تیشکی نادیارەوە، بەڵکوو بە کامێرایەکی بچووکی وێنەگری کەلە رێگای سورێنچك (مری)ییەوە دەینارده ناو گەدە و ئەو کامێرایە بە شێوەی راستەوخۆ و لە نزیکەوە وێنەی ناو گەدەی هەڵدەگرت. پێش لە "زائربروخ" نەخۆشیی شێرپەنجەی سورێنچك (بۆرپیی قورگ) بە دەرمان بوو و دەبووە هۆی هیلاك و مردنی نەخۆش.

بەڵام "زائربروخ" ئەنجامدانی نەشتەرگەریی سورێنچکی داهێنا و ئەو بەشەی سورێنچك یان قورگ کە تووشی شێرپەنجە ببوو، بڕی و فڕێی دا و دوای ئەوەی کە گرفتێك نەیەتە ئاراوە، ئەو دوو بەشە براوەی پێکەوە پێوەند دا. ئەمرۆکەش پزیشکان کەمتر نەشتەرگەری بۆ بۆرپیی قورگ دەکەن، بە چەشنێك هێشتا شێرپەنجە نەخۆشییەکی چارەسەرنەکراوە و هۆکاری نەخۆشییەکەش، ئەجوینی خۆراك و قووت دانی خواردنی تیژ و بۆ وێنە نانی برێشتەیە و زائربروخ دەیگوت سەرەڕای ئەوەی کە نانی برێشتە (توست) لەباری تەندروستیی کۆئەندامە هەرسەوە لە نانی هەویر باشترە، من پێم باشترە نانی هەویر بخۆم هەتا تووشی شێرپەنجەی قورگ نەبم. یەکێکی دیکە لە شاکارە نەشتەرگەرییەکانی "زائربروخ" ئەوە بوو لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا چەندین جار، دەست و لاقێك کە بە تەواوەتی لێك جیا کرابوونەوە پێکەوەی پێوەند دان، بۆ وێنە نەشتەرگەریی بۆ سەربازێك ئەنجام دا کە دەست و لاقی بە تەواوەتی لێك جیا ببوونەوە و هەتا کۆتایی تەمەنی وەکوو مرۆڤی ئاسایی ژیا.

رۆژێك کە "زائربروخ" دەست و لاقی بڕاوەی پێکەوە پێوەند دا، دەوا و دەرمانی ئەمڕۆیی وەکوو دەرمانەکانی "ئانتی بیوتیك" لە گۆڕێدا نەبوون و هەروەها تەقەڵ و دروونەوەکانی ئێستا کە لەناو برینەکەدا دەتوێنەوە، نەبوون و "زائربروخ" دەست یان پای جیا بووەی بە فرێت و کشتەکی بەناو (کات گوت) کەلە ریخۆڵەی گیانلەبەران ساز دەکران و جۆرێك ژێی باریك کە شوێنی برینەکەی پێ تەقەڵ دەدا و دواتر مەترسیی تەشەنە و چڵك کردنی برینکە هەبوو. بەڵام کاری نەشتەرگەریی "زائربروخ" هێندە ورد و خاوێن بوو و کە هیچکات برین تووشی ئاوسان و کیم کردن نەدەبوو. لەو سەردەمەدا پزیشکان، پێش لە ئەنجامدانی نەشتەرگەری لە ترسی ئالوودە بوونی برینی نەخۆش لە رێگای دەستی خۆیانەوە، بۆ ماوەی ١٥ خولەکی بەردەوام هەر دوو دەستیان بە ئاو و سابوون و ئاوی ئاهەك دەشوت کە میکرۆبەکانی دەست لەناو بچن، لە حاڵێکدا پزیشك ئەمڕۆ جووتێك دەستکێشی لاستیکی یان پلاستیکیی گەرمابەری کراو و خاوێن لەدەست دەکات و

بە دڵنیاییەوە لەوەی کە برینی نەخۆش بە دەستەکانی ئالودە ناکات، دەست دەکا بە نەشتەرگەری.

"زانربروخ" یەکەم پزیشکە کەلە رێگای نەشتەرگەری لەناو سیپەلاك، سیلی سیپەلاك کە نەخۆشییەکی کوشندە بوو، چارەسەری کرد و بە نەشتەرگەری، پل (لوب یا قاچ)ی لە سیپەلاکی نەخۆش کە بەهۆی سیل (دەردەباریکە)وە بریندار ببوو، هەڵدەگرت و نەخۆشی سیلداری سیپەلاکی لە مەرگ رزگار دەکرد.

دەرهێنانی تومۆر، بەرزەك (غدە سرتانی) لەناو سیپەلاك یان جەرگ، لەلایەن "زانربروخ"ەوە وەکوو نەشتەرگەرییەکی ئاسایی دەهاتە ئەژمار و ئەگەر متازتاز (یانی گواستنەوەی شانەی شێرپەنجەیی لە بەشێکی لەشەوە بۆ بەشێکی دیکە کە ئەگەر ئەو کارە نەکرێت، لەو بەشەکەی دیکەشەوە تومۆری شێرپەنجەیی سەرهەڵدەدات ـ و: ف) سەری هەڵنەدابایە نەخۆشێك کە لەناو سیپەلاك یان جەرگیدا تووشی تۆمۆر و بەرزەکێك دەبوو، دەرمان دەکرا و لە مەرگ رزگاری دەبوو.

داهێنەری دەرکێشانی تومۆری شێرپەنجە لە سیپەلاك و جەرگیش هەر زانربروخ بوو، هەرکەس لە هەر گۆشەیەکی ئەم جیهانە بە نەشتەرگەریی تومۆری شێرپەنجە یان سیپەلاکەوە گیانی رزگار ببێت، ئەگەر تەمەنی سروشتی تێپەڕ بکات و تووشی متازتاز (بچووك بوونەوەی شانەی شێرپەنجە) نەبێت، بۆ بەدەستهێنانەوەی لەشساغیی قەرزداری "زانربروخ"ە. "زانربروخ" لە نەشتەرگەریی پلاستیك، یانی جوانکاریی کەسەکانیشدا داهێنەر بوو و شێوازێکی نوێی بۆ جوان کردنی ئەو کەسانەی کە سەردانییان دەکرد، داهێنا.

ئەو دەیتوانی وەکوو پزیشکانی دیکەی بواری جوانکاری لووت، گوێ، گۆنا و دەموچاو بگۆڕێت، بەڵام هونەری ئەو نەشتەرگەرە بلیمەتە، لەوەدا بوو کە بە دەستێوەردان و دزە کردنە ناو تراوشتی تومۆرە دەروونییەکانییانەوە، بۆ هەمیشە جوانی رادەگرتن نموونەکەشی "مارلن دیتریش" هونەرمەندی شانۆکاری سینەمای ئەڵمانیایە کە ئێستا لە ئەمریکا سەرقاڵی چالاکیی هونەرییە و سەرەڕای ئەوەی کە زیاتر لە هەشت ساڵ تەمەنیەتی، بەڵام هەرکەسە ببینێت پێی وایە ژنێکی تەمەن بیست و پێنج یان شەش ساڵانە و کەس نازانێ تەمەنی گەیشتۆتە سی ساڵ، چ بگات بە ژنێکی تەمەن هەشتا ساڵ و ئەو یەك لەو کەسانەیە کەلە رێگای نەشتەرگەریی "زانربروخ"ـەوە جوانی و گەنجێتیی هەتاهەتایی پێگەیشتووە.

چەندین ساڵ لە مەرگی "زانربروخ" تێدەپەڕێ و هێشتا هیچ پزیشکێکی جوانکاری پەیدا نەبووە لەم بەشەدا، یانی جوان کردنی خەڵك لە رێگای دزە کردنە ناو تراوشتی تومۆری ناوکییەوە

ئەو کارەی "زائربروخ" درێژە پێ بدات. بە بۆچوونەوە دەتوانین بڵێین کەلە زۆربەی لقەکانی نەشتەرگەریی سەدەی بیستەم کە ئێستا چوار لەسەر پێنجی گوزەراوە، (ئەو ڕێکەوتە ئەم بەرهەمە لەسەر "زائربروخ" نووسراوە و: ك) ئاسەواری داهێنان و لە هەندێکیاندا بلیمەتیی "زائربروخ" بە جوانی دیارن و چەندین کەس لە لێپرسراوانی نێودەوڵەتی لەلایەن "زائربروخ"ەوە نەشتەرگەرییان بۆ کراوە کە یەکیان "ستالین" بوو کە پاش شەڕی دووەمی جیهانی "زائربروخ" سەفەری یەکیەتیی سۆڤیەتی کرد و نەشتەرگەریی بۆ ئەنجام دا، هەرچەند ئێستاش دیار نیە کە نەخۆشینەکەی چی بووە، چونکە هەندێك وتوویانە بۆ نەشتەرگەریی (بنە ڕیخۆڵە) ئاپاندیسی ستالین سەفەری یەکیەتیی سۆڤیەتی کردووە و هەندێکی دیکەشیان وتوویانە کە نەشتەرگەرییەکی ئاپاندیس پێویستی بەوە نەدەکرد کە پزیشکێکی وەکوو "زائربروخ" ببەنە یەکەیتی سۆڤیەت و لەوێ زۆر پزیشکی شارەزای لێ بووە و دەیانتوانی نەخۆشیی ئاپاندیسی ستالین چارەسەر بکەن و ئەوانە دەڵێن "زائربروخ"یان بۆ نەشتەرگەریی تومۆرێکی شێرپەنجەی ستالین بردۆتە یەکیەتیی سۆڤیەت و خودی "زائربروخ" هەتا ئەوکاتەی زیندوو بوو، نەیدرکاند کە چە نەشتەرگەرییەکی بۆ ستالین کردووە، چونکە بەپێی سوێندی بوقرات، باوەڕی وابوو کە پزیشك دەبێ نهێنی و رازی نەخۆش بپارێزێ.

"ئالفونس سێزدەیەم" پاشای پێشووی ئیسپانیاش لەلایەن "زائربروخ"ەوە نەشتەرگەریی بۆ کراوە. بەرلە شەڕی دووەمی جیهانی باس لەوە کرا کە بۆ نەشتەرگەریی "ڕەزا شای پالەوی" سەفەری تاران بکات، بەڵام لەبەر ئەوەی کە ئەوکات لە تاران کەلوپەلی نوێی پزیشکیی هاوچەرخی وەکوو بەرلین نەبووە و هەروەها گواستنەوەشی جۆرێك نەبووە کەلە چەند مانگدا جێبەجێ بکرێت، "زائربروخ" داوای لە شای ئەوکاتی ئێران کرد کە بڕواتە بەرلین هەتا نەشتەرگەریی بۆ بکات. بەڵام کاتێك بە تەما بوو سەفەری بەرلین بکات، "هیتلەر" هێرشی کردە سەر لێهستان (هەنگاریا) و شەڕی دووەمی جیهانی دەستی پێکرد و ئەو سەفەرەش هەڵوەشایەوە.

## دەسکاریی تومۆرە دەروونییەکان

تومۆر و بەرزەکە هەناوییەکانی جەستەی مرۆڤ، لە زاراوەی نێودەوڵەتیی پزیکشیدا بە تومۆرە (انـدو کـرین)ەکـان ناسـراون، "ئەنـدوکرین" وەکـوو زۆرێکـی دیکـە لـە زاراوە نێودەوڵەتییـە پزیشکییەکان لە بنەچەکی یۆنانییەوە وەرگیراوە و ئەم زاراوەیە دوو ریشەی یۆنانیی هەیە یـەکیان "ئەندوون" و ئەوەی دیکەشیان "کری نن"ە، "ئەندوون" لە زمانی یۆنانیدا یانی دەروونی و "کری نن" یان تراوشت و بەگشتی یانی ئەو تومۆرانەی کەلـە نـاوەوەی جەسـتەوە تراوشـت دەکـەن. لـە زمانی فارسیدا بۆ ئەوەی کەلە تومۆرەکانی دیکـەش کـە تراوشـت دەکـەن، جیـا بکرێنـەوە، بـە "تومۆرە دەروونییەکان" ناسراون، چونکە کاریگەریی تراوشتیان لەسەر ئەرکەکانی جەستەی مرۆڤ، خراپ و رووخێنەرترە لە تراوشتی تومۆرەکانی دیکە بۆ وێنە گەدە کە ئەویش بـۆ خـۆی تراوشـتی هەیە. سەرەڕای ئەوەی کـە زانـستی پزیـشکی لـە سـەدەی شـازدەیەمەوە پێـی ناوەتـە قۆنـاغی پێشکەوتنەوە، هەتا نیوەی سەدەی نۆزدەیـەم هیـچکەس زانیـاریی لەسـەر کاریگـەریی تراوشـتی تومۆرە دەرونییـەکان لەسـەر ئەرکـەکانی جەسـتەی مـرۆڤ نـەبوو و دوای ئـەوەی کـە زانیاریـیان بەدەستهێنا، دیسان بۆ ماوەیەك نەیاندەتوانی ئەرکی تومـۆرە دەروونییـەکانی جەسـتە لەڕاسـتای دابین کردنی تەندروتسیی خەڵکدا بەکار بهێنن. لەبـەر ئـەوەی ئـەو تومۆرانـە کـەمتر یـان زیـاتر تراوشت نەکەن، کەس نەیدەتوانی نەشتەرگەری بۆ تومۆرە ناوکییەکانی جەسـتە بکـات. مێـژووی نەشتەرگەری دەرینەخستووە کە هەتا سەدەی بیستەم کەسێك نەشتەرگەریی تومۆرە دەروونییەکانی جەسـتەی کردبێـت و یەکـەم پزیـشك کـە تـوانی لـە رێگـای نەشـتەرگەرییەوە لەسـەر تومـۆرە دەروونییەکانی جەستە کار بکات، "زاثربروخ" بوو.

هێندێ لە بیرمەندان ئەرکەکانی جەرگ (گەورەترین ئەندامی ناوکیی لەش لەلای راسـتەوە) کـە سەفرا تراوشت دەکات و هەروەها لەوزەلمەعیدە (ئەنـدامێکی بـادامی لـەژێر و پـشتی گـەدە کـە سـەرەکەی بە دوازدە گرێ و بنەکەی بە سـپڵەوە بەندە) کە ئەنسۆلین تراوشت دەکـات، وەك بەشـێك لە تومـۆرە ناوکییـەکان دێنـە ئـەژمار، بـەڵام زۆربـەی شـارەزایانیش ئـەم دووە وەکـوو تومـۆرە ناوکییەکانی لە قەڵەم نادەن. چونکە بەڕای ئەوان تومۆرە ناوکییەکان بە پلەی یەکەم، "هیپـۆفیز"

و "تیرۆئید" و "سورنالْ"ن، کە تومۆری یەکەم لە خوارەوەی مێشك جێگای گرتووە و تومۆری دووەم، لە گەردن و لەو شوێنەیە کە زڕپی یان قۆقزیی ژێر گەردن، یان بە قەولی ئەورووپاییەکان "سێوی ئادەم و حەوا" لەو شوێنەیە و سورنالْ دوو تومۆرە کە هەرکامەیان لەسەر یەکێك لە گورچیلەکان هەڵکەوتوون.

(زانستی شیکاری لە جەستەی مرۆڤدا حەڤدە تومۆری ناوکیی شی کردۆتەوە کە ناوهێنانیان دەبێتە هۆی درێژبوونەوەی باسەکە و: ف)، تراوشتی ئەم سێ تومۆرە لە زۆرێك لە دیاردەکانی ژیانی مرۆییدا، واتە لە کاتی لەدایك بوونەوە هەتا مردن کاریگەریی هەیە و ئەوانەی کەلە سەرەتای ئەم سەدەیەوە هەتا ئەمڕۆ، بۆ درێژەدان بە تەمەنی هەر مرۆڤێك توێژینەوە دەکەن یان مەیل و هۆگرییان بەوە هەیە کە جوانیی سەردەمی گەنجێتی هەمیشە بهێڵنەوە، چاویان بڕیوەتە تراوشتی ئەو سێ تومۆرە ناوکییەی جەستە. کۆمەڵێك لە دیاردەکانی ژیانی مرۆڤ راستەوخۆ پێوەندییان بە تراوشتی ئەو تومۆرانەوە هەیە و بەشێکی دیکەش بۆ وێنە باڵابەرزی، کورتەباڵایی قەڵەوی و کزی ناڕاستەوخۆ، پێوەندییان بە تراوشتی ئەو تومۆرانەوە هەیە و ئەگەر تراوشتی بەجێی ئەو تومۆرانە نەبێت، باڵای مرۆڤ هەڵنادات و هێندێ لە بەرەمەندانیش پیربوونی خێرا بە تراوشتی هەندێ لەو تومۆرانە دەزانن.



رێکەوتی سێیەمی مانگی ژوئەنی ساڵی ١٩٤٨ی زایینی، "زائربروخ" وەکوو رۆژانی دی کاتژمێر ٧ی بەیانی لە خەو هەستا. وەك کاروباری رۆژانەی ریشی دەتاشی و حەمامی دەکرد و دواتر نانی بەیانیی دەخوارد، هەمیشە بەیانییان هێلکە و تەماتە و پەرداخێك قاوەی دەخوارد، خواردنی هێلکە لە بەیانیاندا هەر لە دەورانی منداڵییەوە لەلای زائربروخ ببووە خوویەك، لەبەر ئەوەی بنەماڵەکەی دەستەنگ بوون لە ئەڵمانیا، هێلکە یەکێك لە هەرزانترین خواردنەکان بوو و چینی هەژار لە ئەڵمانیا بەیانییان هێلکەیان دەخوارد. لە رۆژانی دوای شەڕدا هێلکە لە بەرلینی رۆژهەڵات کە ژانبڕ و سەروێنەری "زائربروخ" بوو جیرەبەنی کرابوو و ئەو پزیشکە مەزنە کە نەیدەتوانی ناشتایەکی دیکە بخوات، هەر رۆژە و بە هێلکەیەك قەناعەتی دەهێنا، "زائربروخ" دوای خواردنی ناشتا بەرەو نەخۆشخانەی شاریتی کەوتەڕێ هەتا کارە رۆژانەکانی دەست پێبکات و دەبوا بەیانیی هەمان رۆژ بۆ نەشتەرگەری بۆ پیاوێك بەناوی "هنریخ ـ گریف" بکات کە کەسێکی تەمەن ٣٩ ساڵان و شانۆکار بوو. هەموو بەیانییەك لە نەخۆشخانەی شاریتی یاریدەدەری لەمێژینەی "زائربروخ" رایدەسپارد کە ژووری نەشتەرگەری ئامادە بکەن و کاتێك "زائربروخ"

دەهاتە بەشی نەشتەرگەرییەوە، هەموو شتێك بۆ نەشتەرگەری ئامادە بوو و ئەو رۆژە بێجگەلە یاریدەدەری پێشووی، یاریدەدەری تازەی "زائربروخ"یش هەروەك گوتمان بۆ دیاریکردنی رەخنەیان دەگرت، حزووری هەبوو. نەخۆشەکە کەلە بەشی تەختایی مێشکی تومۆرێك دەرهاتبوو، برایە ژووری نەشتەرگەری کە دەبوا "زائربروخ" نەشتەرگەریی بۆ بکات، زائربروخ بە یارمەتیی فەرمانبەرانی بەشی نەشتەرگەری جلوبەرگی تایبەتیی لەبەر کرد و دەستەوانەی نەشتەرگەریی لەدەست کرد و چووە ژوورەکەوە. لە باس کردن لە ژووری نەشتەرگەری و ئەو کەسانەی کە کاتی کار (ئەویش نەشتەرگەرییەکی ورد لەناو مێشك) لەناو ژوورەکە هەبوون و هەرکامەیان ئەرکێکیان لەسەرشان بوو خۆ دەبوێرین، چونکە ئەمڕۆ بە پەرەسەندنی تەلەفزیۆن و بە پیشاندانی دیوی نەشتەرگەری بۆ بینەران، هەموان دەزانن کەلە نەشتەرگەرییەکی گەورەدا، ژوورەکە چۆنە و چ کەسانێك تێیدا کار دەکەن. ئەو رۆژە دوای ئەوەی نەخۆشەکەیان بێهۆش کرد، لە حاڵێکدا دوو یاریدەدەری پێشوو و تازەی لەملاو لەولای نەشتەرگەری مەزنەوە راوەستابوون، "زائربروخ" دەست بەکار بوو. دەستەکانی ئەو پیاوە ٧٢ ساڵەیە، لە کاتی نەشتەرگەریدا بە چەشنێك خێرا دەجووڵان و کاریان دەکرد کە دەڵێی ژەنیارێکی بیست ساڵەیە کە بە قامکەکانی سەرقاڵی ژەنینی چەنگە و تومۆری خراپ و لەکارکەوتوو کە لەنێو مێشکی نەخۆشدا بوو لەسەر دەستی ئەو نەشتەرگەرە گەورەیە لە میشك دەرهێنرا و خرایە زەرفی زێلەوە و دوای ماوەیەك یاریدەدەرانی "زائربروخ" کە چاویان لە شوێنی نەشتەرگەرییەکە هەڵنەدەگرت، بینییان کە نەشتەرەکەی "زائربروخ" لەسەر تومۆری "هیپۆفیز"یش کەوتە کار. ئەو نەشتەرگەرییە هیچ پێوەندییەکی بە تومۆری "هیپۆفیز"ەوە نەبوو و پزیشك نەدەبوا دەست لەو تومۆرە وەربدات.

سەرەڕای ئەوەی کە هەر دوو یاردیدەدەری "زائربروخ" دیتیان کە نەشتەرەکەی لەسەر تومۆری هیپۆفیز کەوتە کار و دەست دان لەو تومۆرەیان بە پێویست نەدەزانی، بەڵام هیچ دەنگیان نەکرد و وەبیریان نەهێنایەوە کە نابێ دەست لەو تومۆرە بدات. هەتا کەسێك خوێندکاری کۆلیژی پزیشکی نەبێت و قۆناغی خوێندن و هەروەها خولی راهێنانی نەشتەرگەری لەلای پزیشکێکی شارەزا تێپەڕ نەکات و دواتر نەبێتە یاریدەدەری پزیشکێکی گەورە، لەوە ناگات کە رێزی ئەو کەسانەی کە لەبەر دەستی نەشتەرگەرێکی مەزندا کار دەکەن، بۆ ئەو نەشتەرگەرە لە کارە زانستی و پزیشکییەکاندا چەندەیە. پزیشکێکی نەشتەرگەر لە روانگەی قوتابی و یاریدەدەرانیەوە چەشنی خودا گەورە و توانایە و هیچکات بە بیری خوێندکار و تەنانەت یاریدەدەریشدا نایەت کە رەخنە لە پزیشك و مامۆستایەکی نەشتەرگەر بگرێت. هەر بۆیە دوو یاریدەدەری "زائربروخ" سەرەڕای ئەوەی کە

دیتیان نەشتەری پزیشك نەدەبوا بەرەو تومۆری هیپۆفیز بڕوات و ئازاری بدات، بەڵام ئاگادارییان نەکردەوە و ڕەخنەیان لێنەگرت، چونکە بە شێوەی ڕەها دەیانزانی توانایی، زانست و کردەی زائربروخ و پێیان وابوو نەشتەرگەری لەسەر تومۆری هیپۆفیز لەلایەن ئەو مامۆستا بلیمەتەوە، پێوەندیی بەو پێویستییەوە هەیە کە ئەوان لێی ئاگادار نین.

نەشتەرگەرییەکە کۆتایی پێهات و بڕیاری دورینەوەی برین لەلایەن پزیشکەوە درا. خوخدەی پزیشکانی گەورە ئەوەیە کە پاش تەواو بوونی نەشتەرگەری لە دیوی کار دێنە دەرەوە و دەستەوانەی نەشتەرگەری لە دەست دادەکەنن و لە سەتڵی زبڵی دەهاوێن، چونکە پلەی و پێگەی خۆیان لەوە بە بەرزتر دەزانن کە دوای تەواو بوونی نەشتەرگەری لە ژوورەکە خۆیان بە دورینەوەی برینی نەخۆشەکەوە سەرقاڵ بکەن و برینەکە لەلایەن یاریدەدەران و بە یارمەتیی ئەو کەسانەی کەلە ژووری نەشتەرگەری حزووریان هەیە تەقەڵ دەدرێت، بەڵام "زائربروح" دوای نەشتەرگەری دەستبەجێ ئەو شوێنەی بەجێ نەدەهێشت و رادەوەستا هەتا برینەکە بە برینپێچ داپۆشرێ و دوای ئەوەی کە برینەکە بەسترا، هێشتا نەخۆشەکە نەهاتبووەوە هۆش خۆی و کاتێك لە ژووری نەشتەرگەری دەیانبردە دەشت، بە یاریدەدەرەکانی گوت کە بۆ بە هۆشهێنانەوەی پەلە نەکەن.

نەخۆش چوار کاتژمێر دوای هێنانە دەرەوەی لە ژووری نەشتەرگەری وەهۆش هاتەوە بەبێ ئەوەی کە هەست بە ژانەسەر بکات. ئەو نەشتەرگەرییەی کە "زائربروخ" ئەنجامی دا لە مێشکی نەخۆشدا بوو و مرۆڤیش هەموو ئێش و ژانەکان لە ڕێگای مێشکەوە هەست پێدەکات و ئەگەر شتی وا روو بدات کە مرۆڤێك بەبێ مێشك زیندوو بمێنێ و وەکوو کەسێکی ئاسایی درێژە بە ژیان بدات، هەست بە هیچ ژانێك ناکات و ئەمەش بۆ خۆی یەکێك لە ڕاستییە سەرسووڕهێنەرەکانە کە ئەگەرچی لە ڕێگای مێشکەوە هەست بە تەواوی ئازارەکان دەکات، بەڵام خودی مێشك، لەمەڕ ئەو نەشتەرگەرییانەی کە لەسەری دەکرێت بێ هەستە، یانی هەست بە ئازار ناکات و لەبەر ئەوەی چەق و ناوەندی هۆش و تێگەیشتنە و هۆش و بیری لە گشت خانە (سلول)ەکانی جەستەی مرۆڤ زیاترە، هەرکە هەستی بەوە کرد کە مەرگی مرۆڤ نزیکە، ئیدی لە ڕێگای دەمارە هەستیارکانەوە ئازارەکانی برین و نەخۆشی بە مرۆڤ ناگەیەنێ. چونکە دەزانێ مەرگ نزیکە، ئیدی پێویست بەوە ناکات لە ڕێگای ژانەوە ئازاری مرۆڤ بدات هەتا ناچاری بکات پێش بە مەرگ بگرێت.

پێویستیی هەست بە ئازار کردن لە جەستە، بەهۆی مێشکەوە ئەوەیە کە مرۆڤ تێبگات و هەوڵ بدات پێش بە مەرگ بگرێت و ئەوکاتەی کە مێشك زانی مەرگی مرۆڤ نزیکە و کۆتایی ژیانی حاشاهەڵنەگرە، ئیتر بڕیار بە دەمارە هەستیارەکانی جەستە نادات کەلە جەستەدا هەست بە ژان

بکرێت و له خولەکەکانی پێش له مەرگ، هەست کـردن بـه هەرچەشـنه ژانێـك لـەناو دەچـێت و پزیشکان له پێشوودا بەم راستیەیان نەدەزانی و به پێچەوانەوه پێیان وابوو پێش لـه مـەرگ مـرۆڤ تووشی ژاناوی و توندترین نازارەکان دەبێت. بەڕای ئەوان جەزرەبه و چێشتنی نازاری زۆر، دەبێتـه هۆی ئەوەی که مرۆڤ خێراتر گیانی دەربچێت، (جەزرەبەی گیان کەنشت) کەلـه قـسەی ئاسـایی و رۆژانەی خەڵکدا جێگای گرتبوو، ئەو زاراوەیه که پزیشکانی پێشوو خەڵکیان فێر کردبوو.

لەبەر ئەوەی که مێشك، بەهۆی هیچ چەشنه نەشتەرگەرییەکەوه هەست بە ژان ناکات (هنریخ ـ گریف) دوای ئەوەی که وەهۆش هاتەوه له مێشکیدا، هەستی بە ژان نەکرد، بۆیە ئەو کەسەی کـه نەشـتەرگەریی مێـشکی بـۆ دەکرێـت، ئەگـەر بەشـێکی دیکـه لـه ماسـوولکەکانی جەستەشـی نەشتەرگەری بۆ دەکرێت و دوای ئەوەی که وەهۆش هاتەوه، ماسوولکەکانیـشی هەسـت بـه نـازار دەکەن، بەڵام دەستی کارامه و لێزانی "زائربروخ" به چەشـنێك ماسـوولکەکانی ئـەو شـانۆگەرەی بڕیبوو که ناوبراو له ماسوولکەکانیشیدا هەستی به ژان نەدەکرد.

له هیچ کۆلیژێکی پزیشکیدا شـێوازی بـەکارهێنانی نەشـتەر لـه کـاتی نەشـتەرگەریدا فێـری خوێنـدکار ناکـەن و تـەنیا دوای ئـەوەی کـه خوێنـدکار، ئەڕواتـه هـۆڵی توێکـاری و جەسـتەی مردوویەکی دەخەنه ئیختیار هەتا لێکی بکاتەوه و یەکەم ئەزموونی نەشتەرگەری بەدەست بهێنێ، ئەوکاته مامۆستا چـۆنیەتیی بەدەسـتەوه گرتنـی نەشـتەری پـێ فێـر دەکـات کـه ماسـوولکەی مردوویەك، لەگەڵ ماسوولکەی کەسێکی زیندوو جیاوازیی هەیە و دەبێ نەختێ زیاتر زەخت بخاتـه سەر کێردەکە هەتا ماسوولکەی مردووەکه بپچڕێ.

لەو کاته بەدواوه هەتا ئەو رۆژەی که خوێندکار، قۆناغی توێکاریی لەش دەگـوزەرێنێ و لـەژێر چاوەدێریی پزیشکێکی نەشتەرگەردا دەست دەکات به راهێنان و دواتر خۆی دەبێتـه نەشـتەرگەر و سەربەخۆ درێژه بەکار دەدات، دەبـێ بـۆ بـەکارهێنانی نەشـتەر لەسـەر ماسـوولکه جیاجیاکـانی جەسـته، (له جەسـتەی مرۆڤدا بەپێی پێکهاتەکە، حەوت جۆر ماسوولکەی سەرەکی و نزیك به سی جۆر ماسوولکەی لاوەکی هەیە) ئەزموون بەدەست بێنێ.

بنەمای ئەزموون له بەشێك له ماسوولکەکانی جەستەدا ئەمەیە کـه پێـچەوانەی هاوتـەریبیی ژێیەکانی ماسوولکه کێرد بەکار نەهێنرێت و ئەو کۆمەڵه وردە دەمارانەی که پێکەوه خانەیەك له ماسـوولکه پێك دەهێنن، لەناو گۆشتدا به جوانی دیارن و پزیشك هەتا ئـەوەی بـۆی ئـەلوێ نـابێ لەسەر ماسوولکه جیاجیاکانی جەسته به چەشنێك کێرد بەکار بهێنێت که هێڵی تـەریبی کۆمەڵـه ماسوولکەکان به باری پانایيدا بپچڕێن.

بەڵام لەبەر ئەوەی کە دەماری ورد و زنجیرە ماسوولکە جیاجیاکانی جەستە یەك قەوارە نین، ئەم ڕێوشوێنە گشتیە لە کاری نەشتەرگەریدا، لەگەڵ زۆر گرفت بەرەوڕوو دەبێتەوە.

"زاتربروخ" پزیشکێك بوو کە دەیزانی لە هەر ماسوولکەیەکدا نەشتەر چۆن بخاتە کار، لەبەر ئەوەی کە یەکەم نەشتەرگەرییەکە خێرا ئەنجام بدرێت و دوای ئەوەی کە ئەخۆش برایە ژووری پشوو، هەست بە ژان نەکات. "هنریخ ـ گریف"یش دوای ئەوەی کە وەهۆش هاتەوە، هەستی بە ژان نەدەکرد بەڵام ڕۆژانی دواتر، ئیشتیای بۆ خواردن زیاتر ببوو و هاوکات هەستی بە سستیی جەستەی دەکرد. برینەکانی مێشك و سەر زوو سارێژ دەبن، کەوایە هنریخ گریف دەبوا خێراتر لە نەخۆشخانە مەرەخەس بکرێت.

بەڵام چونکە هەستی بە سستیی زۆر دەکرد و ئەو سستیەش دوای نەشتەرگەری نائاسایی بوو و بەپێی ڕێوشوێنە پزیشکییەکان نەدەبوا بەو چەشنە جەستەی سست بێ، هەر بۆیە لە نەخۆشخانە هێشتیانەوە. ئیشتیای زۆر بە خواردن و چاوەڕوان نەکراوی ئەو پیاوە بووە هۆی سەرسووڕمان و دواتر دۆش دامانی فرمانبەرانی نەخۆشخانەی شاریتی. ئەوان لەبەر ئەوە ناڕەحەت بوون کە زستانی ساڵی ١٩٤٨ ـ ١٩٤٩ بەرلین لەلایەن یەکیەتیی سۆڤیەتەوە گەمارۆی ئابووریی خرابووە سەر و ئیتر لە ڕێگای زەوینی و ئاوییەوە (یانی ڕێگای کاناڵەکانی بەرلین کە وەکوو جادەکان لە پایتەختی ئەڵمانیا کە یەکێکە لە ڕێگا گرنگەکانی پێوەندی و ئاڵوویری بازرگانی) خواردەمەنی نەدەگەیشتە بەرلین.

ئەگەرچی بەرلینی ڕۆژهەڵات، لە بواری ئیداری و خواردەمەنییەوە هەلومەرجی تایبەتی هەبوو و گەمارۆی بەرلین، کاریگەریی خراپی لەسەر جیرەی خۆراکی دانیشتوانی بەرلینی ڕۆژهەڵات دانەدەنا و خەڵك دیسان جیرەی خۆراکیی خۆیان وەردەگرت. بەڵام هەتا ئەوکاتەی کە بەرلین لەلایەن یەکیەتیی سۆڤیەتەوە گەمارۆی نەخرابووە سەر، هەر ڕۆژە ڕێژەیەکی زۆر مادەی خۆراکی لە بەرلینی ڕۆژئاواوە ڕەوانەی بەرلینی ڕۆژهەڵات دەکرا و لە بازاری ئازاددا دەفرۆشرا و ئەوانەی کە خاوەن پارە و دەوڵەمەند بوون و دەیانەویست خۆراکی باشتر بخۆن، لە بازاری ئازاد، مادەی خۆراکی و پێداویستیی خۆیان دابین دەکرد.

دیوارێك کە ئەمڕۆکە لە نێوان بەرلینی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵاتدا هەیە، لەو سەردەمەدا نەبوو و سەرەڕای ئەوەی کە مادە خۆراکییەکانی بەرلینی ڕۆژئاوایان لە بەرلینی ڕۆژهەڵات قەدەغە کردبوو، بەڵام هەر بە نهێنی و قاچاخی ئاڵوویر دەکران. بەڵام دوای ئەوەی کە بەرلینی ڕۆژئاوا گەمارۆی ئابووری درا، بازاری ئازادی خواردەمەنیی بەرلینی ڕۆژهەڵاتیش داخرا. لە نەخۆشخانەی

شاریتی چەند نەخۆشێك هەبوون کە دەیانتوانی لە بازاری ئازاد خواردەمەنی دابین بکەن، بەلاّم دوای داخرانی بازار ئیدی خواردەمەنییان پێنەدەگەیی. "هنریخ گریف"ی شانۆکاریش نەیدەتوانی خواردەمەنی و پێداویستیی خۆی لە بازار دابین بکات.

ئەو خۆراك و خواردنەی کە بە نەخۆشخانە دەدرا، کەم بوو بەلاّم ئیشتیا و فرە خوریی "هنریخ گریف" لەرادەبەدەر و فەرمانبەرانی نەخۆشخانە لەوە سەریان سوور دەما کە ئەو پیاوە لەبەرچی تێر نابێت و سەرەرِای ئەو هەموو خواردنەش دیسان جەستەی سست و بێهێزە و تەنانەت راست بوونەوە لەسەر قەرەویلەش لەلای گران بوو. لە حالێکدا خواردنی خۆراکی زۆر دەبێتە هۆی بەرهەمهێنانی وزە و دەبوا ببێتە هۆی بەهێزی یان لانیکەم هێندە هێزی پێ ببەخشێت کە ئەو پیاوە بتوانێ بە ئاسانی لەسەر قەرەوێلەکە دابەزێت.

رۆژێکیان کە "هنریخ گریف" لە قەرەوێلەکە هاتە خوار، بەوپەری سەرسوورِمانەوە دیتی کە بالاّی کردووە. پەرستای نەخۆشخانەی ئاگادار کردەوە و هاتە لای. نەخۆش پێی گوت ئاخۆ دەزانێت کە بالاّی من چەندە بەرز بووە. ژنی پەرستار چاوێکی لە بەژن و بالاّی "گریف" کرد و وتی من هەست ناکەم کە قەدی ئێوە بەرز بووبێت. دوای ئەوەی پزیشکی کشیکی نەخۆشخانە، وەك نەریت و یاسای هەموو نەخۆشخانەکان، سەرلەبەیانی هاتە ژووری نەخۆشەوە "هنریخ ـ گریف" بەویشی راگەیاند کە قەد و بالاّی بەرز بووە. پزیشك کە هەستی کرد قسەی ئەو پیاوە لەوانەیە لە وەهم و خەیاڵەوە بێت، هەر بۆیە چاوێکی لە پەروەندەکەی کرد.

لە پەروەندەکەیدا بالاّی ئەو نەخۆشە ١/٧٣ مەتر نووسرابوو، بەلاّم دوای ئەوەی کە بالاّیان پێوا، دەرکەوت کە قەدی ١/٧٨ مەترە و لەو ماوە کورتەدا بالاّی ٥ سانتی مەتر زیادی کردبوو!

ئەم مەسەلەیە لە تەمەنی ٣٩ ساڵیدا وەك رووداوێکی دەگمەن و سەرسوورِهێنەر دێتە ئەژمار، چونکە بڵێند بوونی قامەتی مرۆڤ، قۆناغێکی دیاریکراوی هەیە و دوای کۆتایی هاتنی ئەو دەورەیە، ئیتر بەژنی مرۆڤ هەڵنادات و لە قۆناغی پیریدا، بەپێی کەمی و روو لە کزیی ئەو مادانەی کە پێکهێنەری ئێسکەکانی جەستەی مرۆڤن، تەنانەت لەوانەیە بەژنی مرۆڤیش کورت ببێتەوە.

راپۆرتی پزیشکی کشیك بە لێپرسراوی نەخۆشخانەی (شاریتی) راگەیەنرا و بۆ خۆی کە باوەری بەو راپۆرتە نەکردبوو و پێی وابوو هەڵەیە، دەستی دایە لێکۆڵینەوە و دەرکەوت کە بەبێ هیچ دوودڵییەك لەو ماوە کورتەی دوای نەشتەرگەری، بالاّی هنریخ گریف پێنج سانتی مەتر زیادی کردووە و بێگومان سستی و بێهێزییەکەشی پێوەندیی بەم مەسەلەیەوە هەیە.

چەند رۆژ دوای ئەو رووداوە بەژنی نەخۆش لە پێنج سانتی مەتر تێپەڕی و گەیشتە حەوت و هەشت سانتی مەتر، بە چەشنێك کەلە قەرەوێڵەکەیدا جێگای نەدەبۆوە.

## چەند وشەیەك لەبارەی هێلانەی هەڵۆوە

بەرز بوونی باڵای پیاوێـك، بـەهۆی دەسـتكاری لـە تومـۆری هیپـۆفیز، لـە وڵاتـی ئـەڵمانیا، رووداوێكی دەگمەن بوو. بەرلە "زائربروخ" پزیشكانی دیكەی ئـەڵمانیا ئـەو كارەیـان بـۆ بـەرزیی باڵای مرۆڤ (هەڵبەتە پاش قۆناغێك لە تەمەن كە ئیدی باڵا ناكات، نـەك لـە قۆنـاغی منـداڵی و سەرەتای لاوی) بـە ئـەنجامیان گەیانـدبوو بـەو جیاوازیـیەوە كـە پزیشـكانی دی، بـە ئەنقەسـت دەستكاریی تومۆری هیپۆفیزیان دەكرد و "زائربروخ" بێ ئەنقەست و لەخۆڕا كاری لەسەر تومۆری هیپۆفیزی ئەو پیاوە شانۆكارە كرد.

سـاڵی ١٩٤٠ی زایینـی دوای ئـەوەی ئەرتـشی ئـەڵمانیای هیتلـەر، فەرەنـسای تێكـشكان، "هیتلەر" بـەهۆی دنـە و تێگەیانـدنی فەیلەسـووفانی نـازی و بەتایبـەت "روزانـبرگ و ژولیـوس ئەشترایخر" خۆی ئامادە كرد كە ببێتە فەرمانڕەوای جیهان.

ئەو دوو فەیلەسووفە نازییە لە دەمارگرژترین لایەنگرانی "بیرۆكـەی بەسـەرتر زانینـی نـەژادی ئاریایی" بە نیسبەت نەژادەكانی دیكەی مرۆڤەوە بوون و یەكێك لە هۆكارەكانی سەرتری نـەژادی ژنانی ئەڵمانی، باڵایان لە باڵای نـەژادەكانی دیكـە بـەرزترە. بـەپێی ئـەم تیۆریـە، دوای ئـەوەی فەرەنسا لە ساڵی١٩٤٠ی زایینی شكستی هێنا، حكوومەتی ئەڵمانیای هیتلەر لەژێر كاریگـەریی فەیلەسووفانی حیزبی نازیدا هاتنە سەر ئەو باوەڕەی بۆ بەدەستەوە گرتنی دەسەڵاتی جیهان لەلایەن دەوڵەتی ئەڵمانیاوە كە پێیان وابوو بەمزوانە بەسـەر دونیادا سەردەكەوێت، كەسانێك بـار بهێنێـت كـە هێمـا و سـیمبۆلی نـەژادی ئاریـایی و دەربـڕی تایبەتمەنـدی و خەسـڵەتی بەرجەسـتەی دەسەڵاتدارێكی نازی (بەپێی پێناسەی خودی نازییەكان) بن.

بۆ دەستەبەر كردنی ئەم ئامانجە هەزاران كەس لە ژنان و پیاوانی ئەڵمانیا كە لەباری قەڵافەت و بەژنەوە نموونەیەك لە نەژادی ئاریایی (بەپێی پێناسەی فەیلەسووفانی نازی) بـوون، هەڵبـژێردران و لە ناوچەی كوێستانیی "باویر" هەڵكەوتوو لە باشووری ئـەڵمانیا نیـشتەجێیان كـردن و شـوێنی مانەوەیان لە یەكێك لە كێوەكانی (باویر) بوو كە بە "هێلانەی هەڵۆكان" دەناسرا.

ئەو ژن و پیاوانەی كەلە هێلانەی هەڵۆدا جێگایـان گـرت هـەموان بـە دڵخـواز لـەوێ بـوون و بەرنامەی پەروەردەی هێلانەی هەڵۆكانیان بەدڵ و گیان جێبەجێ دەكرد و پێیان وابـوو لـە كۆتـایی ئەو خولە بارهێنانەدا هەركامەیان دەبنە فەرمانڕەوا و دەسەڵاتداری یەكێك لە وڵاتانی جیهان.

یەك لەو کارانەی کەلە فێرگە و ناوەندی پەروەردەی هێلانەی هەڵۆکان ئەنجام دەدرا ئەوە بوو کەلە رێگای دەستکاری کردن لە تومۆری هیپۆفیزەوە قەد و باڵایان بەرز دەکرا.

ئەرکەکانی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ پێوەندییان بە مێشکەوە هەیە و ئەگەر بێت و بە دەستکاری کردنی تومۆری هیپۆفیز قامەتیان بەرز بکرێت، ئەو دیاردەیە، لەسەر هەموو ئەندامە ناوکییەکانی جەستە کاریگەریی دەبێت، کە وایە لە هێلانەی هەڵۆ پزیشك و نەشتەرگەرانی ئەڵمانیا کاریگەریی درێژخایەنی بەرز کردنی بەژنی ئەو کەسانەیان لە رێگای دەستکاری کردنی ئەندامە سەرەکییەکانی جەستە وەکوو دڵ، سیپەلاك جەرگ، گورچیلەکان و گەدە و لەوزەلمەعدە و...یان لەبەرچاو دەگرت.

سەرەڕای ئەوەی کەلە ژمارەی ئەو پزیشك و نەشتەرگەرانەی کەلە هێلانەی هەڵۆدا بوون، زانیارییەکمان لەبەر دەستدا نیە، دەزانین کە "زائربروخ" لە ریزی پزیشکانی هێلانەی هەڵۆدا نەبووە. بەرهەحاڵ، دەستکاری کردنی تومۆری هیپۆفیزی مرۆڤێکی کامڵ و پێگەیشتوو کە دەورانی گەشەی قەد و باڵای گوزەراوە، لە ئەڵمانیا نەشتەرگەرییەکی بێ پێشینە و دەگمەن نەبوو و دکتۆر "ویلفرد" یاریدەدەری "زائربروخ" هەروەك وتمان بە یەکێك لە نازییەکان ئەهاتە ئەژمار، ئاگای لەوە بوو کەلە هێلانەی هەڵۆ، پزیشکەکان بۆ بەزر کردنی قاد و باڵا کاریان دەکرد و ئەگەر کەسێك باڵای لەرادەبەدەر بەرز ببوایەت، بۆ کورت کردنەوەیان قامەتی دەستکاریی تومۆری هیپۆفیزیان دەکرد.

ناوەندی پەروەردە و بارهێنانی هەڵۆ هەتا ساڵی ١٩٤٤ی زایینی بەردەوام بوو، دوای ئەوەی لە مانگی ژوونیەی هەمان ساڵ لە رێگای بۆمبەوە هێرش کرایە سەر هیتلەر هەتا بە لەناو بردنی پێش بە نابووتیی ئاڵمانیا لەلایەن دەوڵەتانی زلهێزەوە بگرن، رێکخراوی هێلانەی هەڵۆکان هەڵوەشایەوە و دواتر دەرکەوت کە سەرۆکی هێلانەی هەڵۆکان لەو کردەوەیەدا بۆ لەناوبردنی هیتلەر دەستی هەبووە و زیاتر لە هەزار کەس لەوانەی بەدەست تێدا بوون لەو کردەوەیە تاوانبار بوون، لە سێدارە دران و هەتا یەك ساڵ دواتر کە هیتلەر زیندوو بوو، دەستی لە کوشتن و راوەدوونانی ئەو کەسانەی کە دەستیان لەو کارەدا هەبوو هەڵنەگرت، هەرکەس کە گومان لە بەشداری کردنی دەکرا، لە سێدارەی دا. تەنانەت بیست و یەك رۆژ پێش ئەوەی کەلە پەسێوگەی کۆشکی "سەدر ئەعزەمی ئەڵمانیا" خۆ بکوژێ، واتە رێکەوتی دەیەمی ئاوریلی ساڵی ١٩٤٥ی زایینی دەریاسالار "کانارێس" لێپرسراوی رێکخراوی دژە سیخوڕیی ئەڵمانیای لە گرتنگەی باسم (فلوسن برك) لە سێدارە دا.

بەم چەشنە دواتر بەرز بوونی بەژنی "هنریخ گریف" لە نەخۆشخانە گەیشتە ئەو ئاستەی کە بووە هۆی ترس و دڵەڕاوکێ، بەرپرسی نەخۆشخانە راپۆرتەکەی ئەم رووداوەی بە لێپرسراوانی بالاّ گەیاند و بە بڕیاری بەرپرسی نەخۆشخانە لەسەر ئەوە ساغ بوونەوە کە جارێکی دیکە لەسەر تومۆری هیپۆفیزی "هنریخ گریف" نەشتەرگەری ئەنجام بدرێت، بەلاّم ئەمجارەیان بۆ ئەوەی کە بەژنی کورت کەنەوە، دکتۆر "ویلفرد" کرایە بەرپرسی ئەو نەشتەرگەرییە. تومۆری هیپۆفیز وەکوو ئەندامانی دیکەی جەستە بە شێوەی ئاسایی خاوەنی دوو دەمارە، یەکیان دەماری هەستیار و ئەوی دیکەشیان دەماری پڕجووڵە و ورووژێنەر.

دەماری دووەم جووڵە و کردارەکانی تومۆر دەگرێتە ئەستۆ، بەلاّم ئەگەر دەماری دووەم لەنێو تومۆری هیپۆفیزدا بپچڕێنن، ئەو تومۆرە لە کار ناکەوێت. ئەگەر بێت و دەماری پڕجووڵەی پا یان دەست بپچڕێنن، لاق یان دەستەکەی دیکە جووڵە، بەلاّم هەرکات دەماری ورووژێنەری تومۆری هیپۆفیز بپچڕێ، ئەو تومۆرە باشتر درێژە بەکار دەدات و زانیروخ دەماری ورووژێنەری تومۆری هیپۆفیزی شانۆکاری تەمەن ٣٩ ساڵی پچڕاندبوو و لە ئەنجامدا کاری ئەو تومۆرە بە چەشنێك رێك خرا کە بەژنی "هنریخ گریف" بالاّی کرد.

دەبێ ئەمەش بزانین دوای ئەوەی کاری تومۆری هیپۆفیز دوای ئەوەی کە پێکەوە گرێ دران، هیچکات لە کاری سەرەکیی خۆی باشتر نابێت. بەلاّم دکتۆر ویلفرد بۆ ئەوەی لە بەرزیی بالاّی ئەو شانۆکارە کەم بکاتەوە، چاوەڕێ ئەوە نەمایەوە هەتا تومۆری هیپۆفیز خۆی لە خۆیدا لە کار کەوێت، چونکە هەتا ئەوکات بەرزیی بالاّی ئەو پیاوە بە قەت قامەتی عوج دەگەیشت، هەربۆیە بڕیاری دا نەختێ لە تومۆری هیپۆفیزی ئەو پیاوە ببڕێت هەتا ئەوەی لە چالاکی و کاری تومۆر کەم بکاتەوە و هەمان کاریشی کرد و جارێکی دیکە راپۆرتەکەی بۆ بەرپرسی نەخۆشخانە رەوانە کردەوە.

یەکەم بەرەنجامی نەشتەرگەریی دووەم لەسەر تومۆری هیپۆفیزی هنریخ گریف ئەوە بوو ناوبراو ئەو ئیشتیا نائاساییەی خۆی کە بۆ فەرمانبەرانی نەخۆشخانە جێگای سەرسووڕمان بوو، لەدەست دا. لە رۆژانی گەمارۆی بەرلین کە لەلایەن دەوڵەتی یەکیەتیی سۆڤیەتەوە خرابووە سەری، ئەمانی ئیشتیای "هنریخ گریف" بۆ ئەو بەشە لە فەرمانبەرانی نەخۆشخانەی "شاریتی" کە لێپرسراوی دابین کردنی خۆراك و خواردنی نەخۆشخانە بوون، وەك سەرکەوتنێك دەهاتە ئەژمار و دکتۆر ویلفرید بە فەرمانبەرانی نەخۆشخانەی راگەیاند کە بە خێرایی لە بەرزیی بالاّی نەخۆشەکە کەم دەبێتەوە.

بەڵام ئەندامانی سەرەکیی جەستەی مرۆڤ لەو پێوەندییەی کە پێکەوەیان هەیە، چەشنی ڕەوان بوونی ئاو لەناو دەفرێکدا پێکەوە گرێ دراون. لە دەفرە هاوچەشنەکاندا، ئاو هەمیشە لە یەك ئاستدا رادەوەستێ و هەر بەم هۆیەشە کەلە تەواوی دنیادا ئاوی دەریا و ئەقیانوسەکان لە یەك ئاستدا دەمێننەوە، مەگەر لە کاتی خێزاو (مەد)ی دەریا و زریان کە حاڵەتێکی دەگمەنە. لە جەستەی مرۆڤدا کاتێك یەکێك لە ئەندامانی سەرەکی تووشی گرفت دەبێت، ئەو کێشەیە کاریگەریی لەسەر ئەندامانی دیکەی جەستە دەبێت چ بگات بە تراوشتی تومۆرە ناوکییەکانی جەستە بۆ وێنە تومۆری هیپۆفیز کە ئەگەر بێت و لەسەر هەموو ئەندامانی سەرەکیی جەستە کاریگەریی نەبێت، لانیکەم کاریگەریی لەسەر زۆربەیان دەبێت.

ڕۆژێك "زائربروخ" لە رووی نەزانییەوە نەشتەرگەریی بۆ تومۆری هیپۆفیزی شانۆکارێك ئەنجام دا و بەرەنجامی ئەو نەشتەرگەرییە لەسەر ئەندامانی دیکەی جەستەی هنریخ گریف دەرکەوتن و ئیشتیای بە خواردن زیادی کرد و خانەکانی جەستە پێکەوە هەراو بوون، بەڵام کاتێك دکتۆر ویلفرد بۆ ئەوەی لە بەژنی ئەو پیاوە شانۆکارە کەم بکاتەوە، نەشتەرگەریی بۆ تومۆری هیپۆفیزی ئەو پیاوە کرد، گەرچی خانە پێوەندیدارەکان بەردەوام پێوەندییان پێکەوە مابوو، بەڵام بۆ وێنە دەکرێت بڵێین کە ئیتر ئاو، لەناویاندا ڕەوان نەبوو هەتا لە دەفرێکەوە بڕواتە دەفرێکی ترەوە. ڕۆژێك کە هنریخ گریف دوای نەشتەرگەریی مێشك لە نەخۆشخانە خەوێنرا، نەخۆشێك بوو چەشنی نەخۆشەکانی دیکە.

بەڵام دوای ئەوەی کە بەژنی زیادی کرد و دواتر نەشتەرگەری بۆ تومۆری هیپۆفیزی کرا هەتا لە بەرزیی باڵای کەم بکەنەوە، بۆ پزیشکانی نەخۆشخانە ببووە "سووژە" و ئەمەش زاراوەیەکی پزیشکییە بۆ میکرۆب، یان خانە یان ئەو کەسەی کە پزیشکەکان بۆ بەدەستهێنانی ئەزموون و زیادکردنی زانیارییەکانی خۆیان توێژینەوەی لەسەر دەکەن. کاتێك شت و دیاردەیەك بۆ پزیشکەکان دەبێتە سووژە، مەسەلەی دەرمان و تیمارکردنی، دەکەوێتە پلەی دووەمی گرنگییەوە و ئەوەی لەلای پزیشکەکان بە پلەی یەکەم گرنگییە ئەوەیە کە بزانن، ئەو "سووژەیە" تووشی چ گۆڕانکارییەك دەبێت.

هەموو پزیشکانی نەخۆشخانە، بە نیسبەت "هنریخ گریف"ەوە بەو هۆیەی لەلای ئەوان ببووە سووژەیەك، هۆگرییان پێ پەیدا کردبوو و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ تاقیکردنەوە و پشکنینیان بۆ دەکرد هەتا بۆیان دەربکەوێت چەندە لە بەرزیی باڵای کەم بۆتەوە، سەرەڕای ئەوەی کە بەباشی دەیانزانی ئەرکە سەرەکییەکانی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ، چەشنی کارکردی پرێزی کارەبا نیە کە بە دەست

لێدانی دوکمەیەك، گلۆپەکە هەڵبێت و پاش ماوەیەك بە دەست لێدانی هەمان دوکمە چراکە بکوژێتەوە، بەڵکوو دەبێ ماوەیەك بخایەنێ هەتا کاریگەریی نەشتەرگەریی لە هەموو ئەندامانی جەستەدا دەربکەوێت. ئەو کەسانەی کەلە"هیلانەی هەڵۆ" نەشتەرگەری بۆ تومۆری هیپۆفیزیان ئەنجام درابوو، پەروەندەی پزیشکییکان نەبوو و ئەگەری ئەوەش لە گۆڕێ دابوو کە دوای ئەوە ڕێکخراوی "هێلانەی هەڵۆ" هەڵوەشایەوە، خودی ئەڵمانییەکان دۆسیەکانیان فەوتاندبێ و لەبەر ئەوەی کە دۆسیەکان نەمابوون، دکتۆر "ویلفرد" و پزیشکەکانی دیکەی نەخۆشخانەی شاریتی، زانیارییان لەو بارەوە نەبوو، لە "هێلانەی هەڵۆ" دوای ئەوەی بۆ ئەو کەسانەی کە لەرادەبەدەر باڵایان بەرز ببوو، لەسەر داوای خۆیان نەشتەرگەری بۆ تومۆری هیپۆفیزیان دەکرا، ماوەیەکی دەخایاند هەتا بەرزیی قامەتیان کورت ببێتەوە.

بەڵام لەمەر "هنریخ گریف"، بەپێی نموونەی سەرەوە، ئیتر ئاو لە دەفری پێوەندیداردا ڕەوان نەبوو و دڵی نەخۆش لەکار کەوت و سەرلەبەیانییەك کاتێك پەرستار هاتە ژووری نەخۆشەکەوە بینی کە نەخۆشکە مردووە. "زانربروخ" ئاگای لە نەشتەرگەرییەکەی دکتۆر "ویلفرد" لەسەر جەستەی "هنریخ گریف" نەبوو، چونکە لە وەرزی هاویندا ڕۆیشتبووە مەرەخەسی و لە ویلایەکی بچووك کەلە ویلایەتی ماگدبورگ (هەڵکەوتوو لە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات) هەیبوو، خەریکی پشوو دان بوو.

ئەوکاتە، هێشتا حکومەتی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات بە شێوەی فەرمی دانەمەزرابوو، بەڵام لە ویلایەتەکانی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات، زەوی و زارە کشتوکاڵییەکان وەك موڵکی نیشتمانی تۆمار و تاپۆ دەکران، بەڵام خانوو و ویلاکان کە شوێنی ژیانی بنەماڵەکان بوو، لێیان وەرنەدەگیرایەوە و وەك موڵك و گەرتی وەبەرهێنان نەدەهاتنە ئەژمار، بەڵام ئەگەر کەسێك خانوو یان ویلاکەی بە کرێ بدایەت، ئیدی وەکوو ناوەند و موڵکی وەبەرهێنان دەهاتە ئەژمار و لێیان دەستاند.

ویلای بچووکی "زانربروخ" هەڵکەوتوو لە ویلایەتی "ماگدبورگ" بۆی مابۆوە و ئەو پیاوە پشووی هاوینی ساڵی ١٩٤٨ی لە ویلاکەی گوزەراند و دوای تەواوبوونی ماوەی پشووەکەی گەڕایەوە بەرلین و بڕیار بوو ئەو پزیشکە مەزنە، نەشتەرگەری بۆ پیاوێك بەناوی "کارل" ئەنجام بدات کە یەکێك لە لێپرسراوانی حیزبی کۆمۆنیستی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات بوو.

کارل دوای ئەوەی کە سەردانی نەخۆشخانەی "شاریتی"ی کرد وتی دەبێ لەلایەن "زانربروخ"ەوە نەشتەرگەریی بۆ بکرێت، نەك پزیشکانی دیکە و لەبەر ئەوەی کە کەسێکی ناسراو و بەپێی هەلومەرجی ئەوکاتیش بەرجەستە بوو، ناچار بوون داخوازییەکەی قبووڵ بکەن. کارل

بەردی گورچیلەی هەبوو و پزیشکەکان نەیانتوانیبوو بە پێدانی دەوا و دەرمان، بەردی گورچیلەکەی دەربێنن و بڕیاریان دابوو کە دەبێ نەشتەرگەریی بۆ بکرێت. ئەو وێنانەی کەلە گورچیلەیان گرتبوو دەریدەخست کە دوو بەرد لەناو گورچیلەی دایە، بەڵام پزیشکەکان پێیان وابوو لەوانەیە لە نێوان ئەو دوو بەردەدا بەردێکی دیکەش هەبێت کەلە وێنەکەدا دەرناکەوێت.

ڕۆژی نۆیەمی سێپتامبر وەك ڕۆژی نەشتەرگەریی "کارل" دیاری کرا و لەو ڕۆژەدا "زائربروخ" لە کاتی دیاریکراودا لە نەخۆشخانە ئامادە بوو، دەستەکانی شۆرد و دەستەوانەی لە دەست کرد و چووە ژووری نەشتەرگەرییەوە. هەموان دەزانن لەو نەشتەرگەرییانەی لەسەر ئەندامانی دەرەوەی جەستەی مرۆڤ ئەنجام دەدرێن، پێویستییان بە بێهۆشیی تەواو نیە و تەنیا بە بێهۆشیی سەرەتایی شوێنی برین یان نەخۆشی نەشتەرگەرییەکە جێبەجێ دەکەن، بەڵام کاتێك بۆ وێنە گورچیلەی نەخۆش چارەسەر دەکەن، دەبێ بە تەواوەتی بێهۆش بکرێت.

لە ژووری نەشتەرگەریدا یاریدەدەرانی "زائربروخ" ئامادە بوون و دوای ئەوەی کە ئەو پزیشکە بە ئەزموون و گەورەیە شوێنی نەشتەرەکەی دیاری کرد، بە خێرایی گورچیلەی نەخۆشەکەی هەڵدەڕی و سێ بەردی وردیلەی تێدا دەرهێنا، کارەکەی جۆرێك بوو دەڵێی قەیسییەك لەت دەکات هەتا ناوکە و پێشەکەی دەربێنێ. دەستەکانی ئەو پیاوە حەفتا و دوو ساڵە بە چەشنێ کاریان دەکرد کە هیچکام لە دوو یاریدەدەرەکەی نەیانـدیت کە پاش نەشتەرگەری بۆ گورچیلەی نەخۆشەکە، چۆن چۆنی نەشتەرەکەی زائربروخ بەرەو تومۆری "سورنال" ڕوویی و پچڕاندی.

تومۆری سورنالیش یەکێك لە تومۆرە ناوکییەکانی جەستەی مرۆڤە و لە جەستەی هەر مرۆڤێکدا دوو تومۆری سوورنال هەیە کە هەرکامەیان لەسەر یەکێك لە گورچیلەکان هەڵکەوتوون. وشەی سورنالیش بە واتای "سەرووی گورچیلە"یە و ئەم دوو تومۆرەش وەکوو تومۆرە ناوکییەکانی دیکە لەبارەی ئەرکی کارکردەوە گرنگییان زۆرە و تراوشتیان کاری بەشێك لە جەستە ڕێك دەخات و یەك لەو دوو تومۆرە مادەی "کورتیزۆن" تراوشت دەکات و ئەو تومۆرەکەی دیکەش مادەی "ئادرنالین"، دەبێ ئەوەش بزانین کە تراوشتی هەموو تومۆرە ناکییەکانی جەستە ناوێکی پزیشکیی گشتییان هەیە کە ئەویش "هورمۆن"ـە، کەوایە هەم کورتیزۆن و هەم ئادرنالین هەرکامەیان هورمۆنن.

دوای تەواو بوونی نەشتەرگەرییەکە برینی نەخۆشەکەیان بەست و لە ژووری نەشتەرگەرییەوە بردیانە ژووری پشوودان و لەبەر ئەوەی کە یەکێك لە پیاوە ڕۆڵگێڕ و لیدرەکانی ئەڵمانیا بوو بۆ پاراستنی نیگابانێکیان لەبەردەم دیوەکەی دانا.

## سوور هەڵگەڕانی هەموو جەستە

ڕۆژی دواتر، ڕاپۆرتی پزیشکی کشیک دەریخست کە باری تەندروستیی نەخۆشەکە باشە و ڕۆژانی سێیەم و چوارەمی پاش نەشتەرگەریش ڕەوشی نەخۆشەکە هەر باش بوو. بەڵام سەرلەبەیانیی ڕۆژی پێنجەم، کاتێك ژنە پەرستار هاتە ژووری نەخۆشەوە و چاوی بە ڕوخساری "کارل" کەوت، چونکە دیتی کە ڕوخساری سوور هەڵگەڕاوە.

سوور هەڵگەڕانی ڕەنگی ڕوخسار، ئەگەر نیشانەی خنکان و پشوو نەمان نەبێت، بێگومان نیشانەی هەناسەسوار بوونە و لەبەر ئەوەی ئەو ژنە پەرستارە وەکوو پەرستارەکانی دیکە لە سەرەتاکانی ناسینی "پاتۆلۆژی" یانی دەرکەوتەکانی ناسینی نەخۆشییەکان ئاگایی هەبوو کە سوور هەڵگەڕانی ڕوخساری کارل نیشانەی جەڵتەی مێشك یان دڵە. جیا لەوەش دەیزانی کە کارل هێشتا ڕوخساری خۆی لە ئاوێنەدا نەبینیوە، کە وایە نابێ پێی بوترێ ڕوخساری سوور هەڵگەڕاوە، چونکە ترس و سام دایدەگرێت.

ژنە پەرستارەکە بەبێ ئەوەی شتێك بڵێت کە نەخۆشەکە ترسی لێ بنیشێت، نەختێ لەگەڵ کارل دوا هەتا لەوە بگات سوور هەڵگەڕانی ڕوخساری بەرەنجامی پشووسوار بوونیەتی یان نا، بەڵام تێگەیشت کە بە ئاسانی هەناسە دەکێشێ و ڕەوشی باشە و ئایشی نیە. پزیکشی کشیك لە کاتی دیاریکراودا هاتە ژوورەکەی "کارل"ەوە و بەپێی ڕاپۆرتی ژنە پەرستارەکە تێگەیشت کە ڕوخساری نەخۆشەکە سوور هەڵگەڕاوە. بۆیە بە بیانووی بینینی برینی نەخۆش، بەتانییەکەی سەر "کارل"ی لابرد کە چاوی بە سینگ و زگیشی بکەوێت و دیتی کە سینگ و زگیشی سوور بۆتەوە، بەبێ ئەوەی نەخۆش هەست بە کەمترین ئازار بکات.

سوور هەڵگەڕانی ڕوخسار و جەستەی نەخۆش، لەگەڵ هیچ ڕێوشوێنێکی پزیشکیدا نەدەگونجا. هیچکام لە پزیشکەکانی نەخۆشخانە پەیان بە هۆکارەکەی نەبرد. بە "زائێربروخ"یان گوت کە ئەو نەخۆشەی کە نەشتەرگەریت بۆ کردووە ڕەوشی باشە، بەڵام سوور هەڵگەڕاوە.

ئەو نەشتەرگەرە بلیمەتە لە وەڵامدا وتی من نەشتەرگەرم، نەك پزیشك و ئێوە کە پزیشکن دەبێ بزانن لەبەرچی ڕەنگی سوور هەڵگەڕاوە و دەرمانی بکەن. بەڵام لەو نەخۆشخانەیە هیچ پزیشکێك نەبوو بە هۆکاری سوور هەڵگەڕانی ڕەنگی ڕوخساری "کارل" بزانێت، چونکە سووریی ڕوخسار و جەستەی لەگەڵ نیشانەکانی هیچ نەخۆشییەکدا نەدەهاتەوە. هێندێ نەخۆشی هەن دوای

ئەوەی مرۆڤ تووشیان دەبێت، روخسار و جەستەی سوور هەڵدەگەڕێ، بەڵام ئەو نەخۆشییانە نیشانەگەلێکی دیکەشیان هەیە و پلەی یەکەمی نیشانەکەیان تاکردنە و سووریی روخسار و جەستە بۆ ئەو نەخۆشییانە وەك نیشانەی لاوەکی دێنە ئەژمار و "کارل"یش تای نەبوو و هیچ نیشانەیەکی دیکەشی تێدا بەدی نەدەکرا و بە باشیش نانی دەخوارد و دەخەوت.

رۆژی دواتر، چەند کەس لە دۆستانی سیاسیی "کارل" بە وەرگرتنی کاتی پێشوو سەردانی نەخۆشخانەیان کرد هەتا ئەوەی بە بۆنەی سەرکەوتنی ئەو نەشتەرگەرییە و چاك بوونەوەی پیرۆزبایی پێ بڵێن و هێشتا "کارل" بۆ خۆی نەیدەزانی کە سوور هەڵگەڕاوە.

لەبەر ئەوەی ئەگەری ئەوە هەبو دۆستان و ئاشنایانی "کارل" دوای ئەوەی چاویان پێ بکەوێت، بەهۆی سوور هەڵگەڕانی روخساری سەریان سوڕ بمێنێ یان لە مەسەلەکە بگەن، بۆیە پێش ئەوەی کە بڕۆنە ژووری نەخۆشەکەوە پێیان راگەیاندن کە بە بینینی سوور بوونی رەنگی روخساری دۆستەکەیان سەریان سوڕ نەمێنێ، چونکە ئەم رەنگە لە کاریگەرییە لاوەکییەکانی نەشتەرگەریی گورچیلەیە و دوای چەند رۆژ چارەسەر دەبێت.

"کارل"یش بەوپەڕی خۆشییەوە پێشوازیی لە هەڤاڵانی کرد و یەکێکیان بۆ ئەوەی نوکتەیەکی وتبێ ئاشکرای کرد کە رێبەی ئازیزمان بەردەوام لە ناخەوە سوور بووە و ئێستاش دەبینین کەلە رواڵەتیشدا سوور بووە.

"کارل" کە هیچ ئاگاداری سووری رەنگی خۆی نەبوو، لە واتای ئەو نوکتەیە نەگەیشت و ژنە پەرستارێك کە بە بیانووی پێشوازی لە میوانەکان لە ژوورەکە ئامادە بوو، بۆ ئەوەی نەخۆشەکە نارەحەت نەبێت، نەیهێشت داوای شیکردنەوەی واتای ئەو نوکتەیە لە هاوڕێیانی خۆی بکات.

دوای رۆیشتنی هاوڕێیانی کارل کونجکۆڵ بوو و هەستایە سەرپێ و لەبەر ئەوەی ئەو ژوورە ئاوێنەی لێنەبوو، نەخۆشەکە نزیکی پەنجێرەکە بۆوە و پەردەکەی وەلادا و لە شووشەکەدا لە خۆی روانی. لەبەر ئەوەی کەلە شووشە ئاساییەکانی پەنجێرەدا تەنیا لەسەدا چواری نوور رەنگدانەوەیان هەیە، دیتی کە رەنگی روخساری گۆڕاوە و بە پێداگرییەوە داوای ئاوێنەی کرد و پاش بینینی رەنگی روخساری کە بە کاملی سوور هەڵگەڕابوو، تەواو ترس نیشتە دڵی.

لە سەدەی نۆزدەیەمی زایینی چەند بیرمەندێك سەریان هەڵدا کە بە داهێنان و نوێگەرایی لە زانستی پزیکشیدا خزمەتی زۆر بەرچاو و بەنرخیان بە مرۆڤایەتی کرد. یەك لەوانە "سمل ویس"ی هەنگاریایی بوو و یەکێکی دیکەیان "تۆماس نادی سۆن" پزیشکی بریتانیایی بوو کە ساڵی ١٨٦٠ی زایینی لە تەمەنی ٦٧ ساڵیدا ماڵاوایی لە ژیان کرد. دکتۆر "ئیگناز ـ فولوب ـ سمل

ویس"ی هەنگاری کەسێکە کە توانی هۆکاری سەرهەڵدانی تاو و هەناسە بڕکێی ژنان پاش منداڵ بوون بدۆزێتەوە. لە هەر شوێنێکی جیهان هەر ژنێکی دووگیان کە منداڵی دەبێت، ناوی ئەو پزیشکە هەنگاریەی کەلە تەمەنی ٤٧ ساڵی و ساڵی ١٨٦٨ی زایینی کۆچی دوایی کرد دەبێ بە ڕێزەوە بێنێت، چونکە ئەو بوو ژنانی زەیستانی بەهۆی نەخۆشیی تا و هەناسە سواربوون لە مەرگ ڕزگار کرد.

تای دەروونی و هەناسە سواربوون تایەکە کە سەراپای جەستە سوور هەڵدەگەڕێ، لە ڕابردوودا دایك و باوکان ئەمْ نەخۆشییەیان بە "شەوە" دەناساند، یانی سوور هەڵگەڕان و "شەوە"یان بە جنۆکەیەکی زەبەلاح و دەڵەدیۆیان دادەنا کە جەرگی ژنی زەیستان دەخوات و هیچکات پیاو تووشی ئەم نەخۆشیە نابیت و تەنیا ژنان پاش منداڵ بوون تووشی دەبوون، ئیتر ئەمڕۆ هیچ ژنێك پاش منداڵ بوون تووشی شەوە نابێت و سەراپای جەستەی ژنی زەیستان سوور هەڵناگەڕێت. لەو ڕۆژەوە کە دکتۆر "سمل ویس"ی هەنگاری هۆکاری سەرهەڵدانی نەخۆشیی تا و "شەوە" گرتنی ژنانی دۆزیوەتەوە هەتا ئەمڕۆ، سەدان میلیۆن ژن لە سەرانسەری دونیا ژیانی خۆیان بە قەرزداری ئەو پزیشکە مرۆڤدۆستە دەزانن و ئەوپزیشکە بوو ئەوەی کەشف کرد کە هۆی سەرهەڵدانی نەخۆشیی تای دەروونی و شەوە گرتن کە لە ماوەی هەزاران ساڵدا سەدان میلیۆن ژنی زەیستانی پاش منداڵ بوون ڕەوانەی قەبرستان کرد، کە هیچ شتێك نیە جگەلە دەستانی پیسی ژنی "مامان" منداڵەکە دەگرێت و دەستەکانی لەگەڵ کۆ ئەندامی زاوزێی ژنی زەیستان وێك دەکەوێت و ئەگەر بێت و ژنی مامان ناخوێنەکانی خۆی کورت بکاتەوە و دەستەکانی بە ئاو و سابوون بشوات، ئیدی ژنی زەیستان تووشی ئەو نەخۆشییە نابێت.

مەبەستی ئێمە لە باس کردنی ئەم مەسەلەیە ئەمەیە کە لە نێوان نەخۆشییە ناسراوەکان کە تووشی مرۆڤ دەبن، نەخۆشیەك نیە "یان نەبووە" کە ببێتە هۆی ئەوەی تەواوی جەستە سوور هەڵبگەڕێ، جگەلە نەخۆشیی تای دەروونی و شەوە گرتن کە ئەویش تایبەتی ژنانی زەیستان بوو کە پاش منداڵ بوون تووشی دەبوون.

نەخۆشیی دیکەش هەن دوای ئەوەی مرۆڤ تووشیان دەبێت، تەنیا بەشێك لە جەستە سوور هەڵدەگەڕێ وەکوو نەخۆشیی "سوورێژە" (تایبەتی منداڵان)ـە کە پەڵەی سوور لەسەر جەستەیان پەیدا دەبێت و نەخۆشیی "مێکوتە" (تایبەتی منداڵان) کە پەڵەی سووری بەربڵاوتر، لەسەر جەستەیان پەیدا دەبێت و نەخۆشیی "با سوور" کە ڕوخسار و گەردن و هێندێ جاریش سینگ سوور دەبێتەوە.

پزیشکانی نەخۆشخانەی "شاریتی" دەیانزانی کە سووریی جەستەی "کارل" کە تەواوی جەستەی داگرتووە، بەهۆی نەخۆشیی "با سوور"ەوە نیە، چونکە لە نەخۆشیی باسووردا نەخۆش تا دەکات، ئەویش تایەکی توند کە نەخۆش نارام و قەراری لێ دەبڕێت، ئەمە لە حاڵێك دابوو کە "کارل" تای نەدەکرد، هێور و تەنانەت خۆشحاڵ و شادمانیش دەهاتە پێش چاو.

"ئادی سۆن"یش کە زیاتر بە ناوی "ئەدیسۆن"ەوە دەیناسن، هەر بۆیە لەگەڵ ناوی داهێنەری بەناوبانگی کارەبا ناوەکەی بە هەڵە دێت، لە قۆناغێکدا کە هیچکام لە داهێنەرانی زانستی ئەمڕۆ لە رشتەی ژینگەناسی و تومۆرناسیدا بەدی نەهاتبوون، پەی بە تراوشتی دوو تومۆری "سورناڵ" هەروەك وتمان لە سەدرەوەی دوو گورچیلەوە جێگان گرتووە، برد و وتی: ئەگەر "کورتیزۆن" کە گوشراو و شیرەی تراوشتی یەکێك لە دوو تومۆرەکانی سورناڵە، بپچڕێت رەنگی جەستە سوور هەڵدەگەڕێت و دواتر تێکچوون و شپرزەیی لە ئەندامانی دیکەی جەستەدا بەدی دێت.

لە ئینسکلۆپیدیا پزیشکییەکاندا نەخۆشییەك کە بەهۆی نەمانی تراوشتی "کورتیزۆن"ەوە سەر هەڵدەدات بەناوی "ئادی سۆن" ناسراوە، بەڵام ئەو نەخۆشییە زۆر دەگمەنە و کەس تووشی نابێت، مەگەر ئەوەی کە بەهۆی رووداوێکی وەکوو پێکدادانی ماشێن یان برینی کاریگەر و قووڵی مەیدانی شەڕ، یەکێك لە تومۆرەکانی "سوروناڵ" کە "کورتیزۆن" تراوشت دەکات بپچڕێت و ئیتر کورتیزۆن ناگاتە ئەندامانی جەستەی.

هەر بەم هۆیە، پزیشکەکان هۆکاری ئەو نەخۆشییەی کە "ئادی سۆن" دۆزیویەتەوە، فەرامۆش دەکەن، چونکە زۆربەیان لە دەورانی کاکردنیاندا تەنانەت بۆ جارێکیش رووبەرووی نابنەوە. لەوانەیە پەنجا پزیشك، کەلە نەخۆشخانەیەکی گەورە پێکەوە کار دەکەن، لەو رۆژەوە کە بۆ خوێندن رۆیشتوونەتە ناو کۆلیژی پزیشکییەوە هەتا ئەو رۆژەی کە بە یەکجاری دەست لە کاری پزیشکی هەڵدەگرن، تەنانەت بۆ یەك جاریش تووشی نەخۆشێك نەبووبن کە بەهۆی پچڕانی تراوشتی "کورتیزۆن" سەرتاپای جەستەی سوور هەڵگەڕابێت.

کەوایە نابێ لە هەمبەر سەرسامیی پزیشکانی نەخۆشخانەی بەرلینی رۆژهەڵات بۆ نەخۆشییەکەی "کارل" سەرمان سوور بمێنێ، چونکە هیچکامیان لەوە تێنەگەیشتن کە ئەو نیشانەیە بەهۆی نەخۆشیی "ئادی سۆن" یان پچڕانی تومۆری "کورتیزۆن"ەوە بووە.

بەهەرحاڵ ئەو رۆژە گەیشت کە دەبوا کارل لە نەخۆشخانە بڕوات، چونکە لەباری نەخۆشیی گورچیلەوە بە تەواوەتی چارەسەر کرابوو، بەڵام نەڕۆیشت و وتی من بەم سیماوە ناتوانم لەنێو بنەماڵە و خەڵکدا بژیم و دەبێ رەنگ و سیمای سەرەکیی خۆمم بۆ بگەڕێننەوە، بۆیە بە ناچاری لە

نەخۆشخانە هێشتیانەوە کە بەڵکوو مەعلیجەی بکەن. رۆژێك ژنە پەرستارەکە دوای ئەوەی کە هاتە ژوورەکەی "کارل"ەوە، تێگەیشت کە رەنگی سووریی روخساری کەم بۆتەوە و پێی گوت کە رەنگی روخسارتان ئەمڕۆ، وەکوو رۆژانی پێشوو، سوور نیە و ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە بەمزوانە چاك دەبنەوە.

بەڵام رۆژانی دواتر، دەرکەوت کە کەم بوونەوەی رەنگی سووریی "کارل" بەهۆی دیاردەیەکی سەیرەوەیە، یانی هۆی رەش داگەڕانی رەنگیەتی. کارل پێچەوانەی رۆژانی یەکەم (دوای نەشتەرگەری بۆ گورچیلە) هەموو کاتێك ئاوێنەی هەبوو و چاوی لە روخساری خۆی دەکرد و کاتێ دەیبینی کە رەنگی سووریی روخساری بەرەبەرە کەم دەبێتەوە، خۆشحاڵ دەبوو بەڵام زۆر زوو تێگەیشت کە کەم بوونەوەی رەنگی سووری دەموچاوی، بەهۆی رەش بوونیەتی و بەرەبەرە رەنگی سوور نەما و رەنگی رەش جێگای گرتەوە.

بەرلەوەی کە رەنگی روخسار و جەستەی "کارل" رەش دابگەڕێ، پزیشکەکانی نەخۆشخانە سەرەنجام بەهۆی توێژینەوە و گەڕان و هەڵدانەوەی لاپەڕەی ئینسکلۆپیدیا پزیشکی و زیندەوەرزانی تێگەیشتبوون کە سوور هەڵگەڕانی روخسار و جەستەی کارل، بەهۆی پچڕانی تراوشتی "کورتیزۆن"ەوەیە. بەڵام نەیاندەزانی کە کارل لەبەرچی رەنگی رەش هەڵگەڕاوە، چونکە تەنانەت "ئادی سۆن"یش پێشبینیی ئەم مەسەلەیەی نەکردبوو. ئەوان دەیانزانی کە بەهۆی هێندێ نەخۆشییەوە لەوانەیە رەنگی روخساری نەخۆش شین بێتەوە. بەڵام لە نێوان هەزاران نەخۆشیدا کە نیشانەکانیان لە کتێبە پزیشکییەکاندا تۆمار کراوە، تەنانەت نەخۆشییەکیش نەبوو کە رەنگی روخسار و جەستەی مرۆ بەهۆیەوە رەش هەڵگەڕێت.

دوای ماوەیەك رەنگی "کارل" بە جۆرێك رەش هەڵگەڕا کە بێجگەلە سپیایی چاوان و ناخوێنەکانی، لە تەواوی جەستەیدا خاڵێك نەدەبینرا کە رەش نەبووبێتەوە. پزیشك و دکتۆرەکانی نەخۆشخانە لە هەمبەر ئەو دیاردەیە پزیشکی و زیندەوەرزانی (بایۆلۆژی)یە سەیر و سەمەرەیە، نەخۆشەکەیان فەرامۆش کرد و لەبیریان کرد کە ئەرکی پزیشکییان سەرەتا ئەوەیە کە کارل چارەسەر و دەرمان بکەن. ئەوان بەپێی زاراوەی پزیشکان "سین درووم"ێکیان دەبینی کەلە سەردەمی بوقرات پزیشکی یۆنانییەوە هەتا ئەوکاتە هیچ پزیشکێك نەدیتبوو(١).

ئەو دیاردە سەرسووڕهێنەرە، لەلای یەکێك لە دوو یاریدەدەرەکەی "زائربروخ" هەروەك وتمان پێشینەیەکی نازیی بوو، بیرۆکەیەکی ساز کرد کە لەگەڵ بەشێك لە تیۆریی نژادیی نازییەکان (هەڵبەت تیۆریی نزیك بە ئەفسانەی ئەوان)دا ناتەبایی هەبوو. لە دەورەیەکدا کە "هیتلەر" پاش

شکست دانی فەرەنسا لە ساڵی ١٩٤٠ی زایینی گەیشتنە ئەوپەڕی دەسەڵاتی خۆی و بیری گەیشتن بە فەرمانڕەوایی جیهان لە مێشکی ڕێبەر و سەرکردەکانی نازیدا جێگای گرت و لە "هێلانەی هەڵۆ" هەزار کەس فێرخواز خۆیان ئامادە دەکرد کەلە داهاتوودا لەلایەن حکومەتی ئەڵمانیاوە، فەرمانڕوایی بەسەر جیهاندا بکەن. ئەو بڕۆکەیە هاتە ئاراوە کە نژادی ئاریایی کە بەرچاوترین نموونەیان نژادی ئاریایی ئەڵمانیایە بە قامەتی بەرز، ڕوخساری هێلکەیی، چاوی شین و مووی زێڕین یان خورمایی، لە دونیایەکی ترەوە هاتبوونە سەر گۆی زەوی. نازییەکان دەمارگرژ و خەیاڵاوی، بە دەربڕینی ئەو تیۆرییە، بە گومانی خۆیان نژادی ئاریایی دەبووە خاوەن پلە و پێگەیەکی مەعنەوی، بەو واتایەی کە نژادی ئاریایی، نژادێکی ئاسمانییە و نژادەکانی دیکە هی سەر زەوینن و ئاریاییەکان زایینی نوورن و نژادەکانی دیکەش لە خاك پەیدا بوون.

بەڵام هەر ئەوکاتە لە پێش چاوی یاریدەدەرەکانەوە "زانربروخ" پیاوێکی سپی پێستی کردبووە کەسێکی ڕەش پێست، ئاخۆ ئەو تەشك گۆڕانە دیار و بەدوور لە گومانە ئەوەی دەرنەدەخست کە ڕەش پێستەکانیش لە پێشدا سپی پێست بوون و دواتر ڕەش بوون؟ پزیشکەکان کاتێك بینییان پیاوێکی سپی پێست لەناکاو بە تەواوەتی بووە کەسێکی ڕەش پێست، کۆنجکۆڵ و پەیجۆر بوون کەوتنە بیری ئەوەی کە لەوانەیە ڕاز و نهێنیی بەدیهاتنی نژادی ڕەشی مرۆیان دۆزیبێتەوە.

لەو ڕۆژەوە کە ئەفسانەکانی هەڵێنجراوی خەیاڵی مرۆڤ، جێگای خۆیان دایە توێژینەوەی زانستی، هەتا ئێ بێستاش بیرمەندان نەیانتوانیوە بیسەلمێنن و بڵێن کە ئاخۆ لە گۆی زەویدا نژادی ڕەش پێست، چۆن سەری هەڵداوە؟ ئەوان تێدەگەیشتن کە نژادی ڕەش تەنیا تین و تیشکی خۆی پێکی نەهێناوە، چونکە ئەو نژادە تەنیا جیاوازیی لەگەڵ نژادەکانی دی هەر لەباری پێستەوە نییە، بەڵکوو لەباری قەوارە و فۆرمی هێندێ لە ئەندامانی جەستەی لەگەڵ نژادەکانی دیکە جیاوازە.

ئاخۆ نژادی ڕەش بەو هۆیەوە پەیدا بووە، کە لەناو جەستەی بەشێك لە سپی پێستان تراوشتی کورتیزۆن کەم بۆتەوە و لە ئەنجامدا ڕەنگی پێستیان ڕەش بووە؟ ئەگەر وایە بۆچی مووی سەری ڕەش پێستان گرژ و لوولە و بەپێچەوانەوە مووی سەری سپی پێستان لوول نییە و بۆچی ڕەش پێستەکان کەپوویان پانە و سپی پێستانیش کەپوویان باریکە. ئاخۆ ئەم جیاوازییانە هەموویان دەرکەوتە و کاریگەریی ڕەنگی پێستن. دوای ئەوەی کە کۆمەڵێك لە سپی پێستان بوونە ڕەش پێست، بەرەبەرە و لە ماوەی هەزاران ساڵدا لەسەر جەستەیان نیشانەی ئەو کاریگەرییانە بەدیهات و هێندێ لە ئەندامانی جەستە یان تۆرەمە و بنەچەی سپی پێستییان گۆڕدرا؟ ئەگەر ڕەش بوونی هێندێ لە سپی پێستان هۆکارەکەی ئەمەیە کە تراوشتی "کورتیزۆن"یان کەم بۆتەوە، کەوایە

بۆچی نژادی ڕەش پێست تەنیا لە ناوچەی گەرمەسێر کە تین و تاوی خۆر لەوی زیاترە، دەژین و ئەو ناوچەیەش تەنیا دەورووبەری قارە (کیشوەر)ی ئەفریقیایە و لە دەرەوەی قارەی ئەفریقیا ڕەش پێست ناژیت و لە هەر جێگایەك کە ڕەش پێستێك ببینرێ (بۆ وێنە لە ئەمریکا) ڕەش پێستەکان خۆیان و باب و باپیریان لە ئەفریقیاوە براونەتە ئەوەی، کە وایە بەم پێیە جیالە مەسەلەی کورتیزۆن (هەڵبەت ئەگەر ئەم بابەتە بووبێتە هۆی پەیدابوونی نژادی ڕەش پێست) و مەسەلەی تیشکی خۆر کاریگەری و تایبەتمەندیی ناوچەییش لە پەیدابوونی نژادی ڕەشدا شوێندانەرە، چونکە خۆر لە هەموو ناوچەی کەمەرەیی (ئیستوایی) زەویدا، تیشکی زۆرە، بەڵام نژادی ڕەش تەنیا لە ئەفریقیا پەیدا بووە و لە ناوچە گەمەسێر و کەمەرییەکانی دیکە هیچ نژادی ڕەش نابینرێ.

لە حاڵێکدا پزیشکانی نەخۆشخانە بەوپەڕی وردبینی و پەرۆشییەوە "کارل"یان خستبووە ژێر لێکۆڵینەوەی زانستی و پسپۆڕییەوە، هیچکامیان لە بەری باری دەروونی و ورەی ئەو پیاوە داماوەدا نەبوون، چونکە هەستیاریی ئەو دیاردە پزیشکییە چەشنێك بیر و هۆشی پزیشکەکانی بە خۆیەوە سەرقاڵ کردبوو کە ئەوان قەت بیریان لە ڕەوشی تەندروستیی نەخۆشەکە نەدەکردەوە. "کارل"ی داماو بەهۆی خەم و پەژارەر و دڵەڕاوکێ، نەتەنیا ئامادە نەبوو دۆستان و هەڤاڵانی سیاسیی خۆی قبووڵ بکات، تەنانەت لە وەرگرتنی خزم و کەسانیشی خۆی دەبوارد و دەیزانی کە ئەوان بە دیتنی ترسیان لێ دەنیشێت و تەنیا پزیشکانی نەخۆشخانە و ژنە پەرستارەکان سەردانی ژوورەکەیان دەکرد و ئەو نیگابانەی کە بە شەو و ڕۆژ لە لەبەر ژوورەکەی "کارل" بوو نەیدەهێشت کەس بچێتە ژوورەکەیەوە.

کارل کە هەموو کات لە نەخۆشخانە بەتەنیا بوو، بە هیوای ئەوەی کە پزیشکەکان بتوانن ڕەنگی جەستە و ڕوخسارییەوەك خۆی لێبکەنەوە، هەوڵی ئەدا کە بە گوێ گرتن بۆ ڕادیۆ و خوێندنەوەی کتێب، ڕۆژنامە و گۆڤار، خۆی سەرقاڵ بکات.

لەم کاتەدا دکتۆر "ویلفرد" یاریدەدەری "زائربروخ" کە ڕەش بوونەوەی "کارل" زۆر کونجکۆڵی کردبوو، بڕیاری دا لەمەڕ ئەو دیاردە پزیشکییەی کە بۆ "کارل" هاتبووە پێش لەگەڵ "زائربروخ" وتوویژ بکات.

هەروەك ئاماژەی پێکرا، ئەو دیاردەیەی کە بۆ کارل هاتبووە پێش، دوای دیاردەکەی "هنریخ گریف" بۆ پزیشکەکانی نەخۆشخانە ببووە بابەتێکی توێژینەوە و بەهۆی ئەو لێکۆڵینەوە چارەسەر کردنی کارل بە چەشنێك لەبیر کرابوو، نەك ئەوەی کە پزیشکەکان نەیانەوێ "کارل" دەرمان بکەن، بەڵکوو هۆگرییان بە تێگەیشتن لە هۆکاری ڕەش هەڵگەڕانی ئەو پیاوە، زۆر زیاتر لەوە بوو ڕەشیی

رەنگی لاببەن و بگەڕێتەوە سەر رەنگە سپییەکەی خۆی.

ئێستا دەڵێین هۆی ئەوەی کە پرۆفیسۆر "زائربروخ" نەختێ دەستکاریی تومۆری (هیپۆفیز)ی "هنریخ گریف"ی کرد و هەروەها کاتێکیش کە بەردە گورچیلەکانی "کارل"ی دەردەهێنا لە یەکێك لە دوو تومۆری سورناڵی ناوبراو (تومۆری کورتیکوسورناڵ)ی دەستکاری کردبوو چ بوو؟ ئەو نەشتەرگەرە بلیمەتە، زاناتر لەوە بوو کە کاردی نەشتەرگەریەکەی لە رووی هەڵەو و نەزانینەوە بچێتە ناو تومۆر یان ماسوولکەوە. لە ماوەیەك لەمەوپێش بەشگەلێك لە "خانە"کانی مێشکی "زائربروخ" بەرەبەرە تووشی سفت و توندبوونەوە دەبوون و ئەو گۆڕانە لە بەشێك لە مێشکی نەشتەرگەری بلیمەت کە خانەکانی بیرگە و زەینی مرۆڤ لەوێن، وەدیار دەکەوت. خانەکانی زەین لە بەشێك لە مێشك و لە بەشی دەرەوەی مێشك هەڵکەوتوون و ئەو کاریگەرییەی کە توند و سفت بوونەوەی خانەکانی زەین دەیکاتە سەر کەسەکان بەگشتی لە یەك دەچن، بەڵام لەباری پاژی و لاوەکییەوە، جیاوازە.

کاریگەریی گشتیی سفت و توند بوونەوەی خانەکانی زەین لە کەسەکاندا ئەوەیە کە زەین لاواز دەبێت و کاریگەریی پاژی و لاوەکیش ئەوەیە کە لاوازیی زەین، لە هەر کەسێکدا کە تووشی سەخت و سفت بوونەوەی خانەکانی مێشك بووە، جیاوازە.

بۆ وێنە سفت بوونەوەی خانەکانی ناوەندی زەین لە مێشك وەکوو هەڵاوسانی تومۆری پرۆستات بەهۆی کاریگەریی پیریەوەن، بەڵام ئەمە بۆ هەموو کەس وەراست ناگەڕێ و هێندێ کەس لە سەردەمی بەساڵاچووندا نە تووشی سفت بوونەوەی خانەکانی زەین دەبن و نە تووشی هەڵاوسانی تومۆری پرۆستات. (دەبێ ئەوەش بزانین کە ژنان لە تووش بوون بە هەڵاوسانی تومۆری پرۆستات پارێزراون، چونکە پرۆستاتیان نیە)، بەڵام لاوازی و کزبوونی زەین و دواتر لەدەستدانی لەلای ژن و پیاو لە قۆناغی پیری و بەساڵاچووندا وەك یەکە، واتە ئەم نیشانە و نەخۆشینە پیریە تەنیا تایبەتی پیاوان نیە.

"زائربروخ" نەشتەرگەری گەورە و هەڵکەوتەش بەهۆی بەساڵاچوون تووشی لاوازی و زەین گوتی و فەرامۆشی ببوو و بە زووترین کات دیتمان ئەو نەخۆشینەی کە تووشی ببوو بە چ خێراییەك تەشەنەی سەند و چ بەرەنجامێکی کارەساتباری بەدیهێنا.

ئەگەر "زائربروخ" زانیبای کە تووشی لاوازیی زەین بووە و بەهۆی ئەو بیرکورتی و کەم زەینییەوە، کێردەکەی لە کاتی نەشتەرگەریدا بە جێگایەکدا دەڕوات کە نابێ بچێ، بێگومان ئیتر کاری نەشتەرگەریی نەدەکرد.

لەلای "زائربروخ" بیرکورتی بەهۆی سفت بوونەوەی خانەکانی مێشك، بە چەشنێك سەریهەڵدابوو کەلە کاتی کاری نەشتەرگەریدا شوێن یان دەمارێکی دەبڕی کە نەدەبوا بیپچڕێنێ. حکوومەتیش بۆیە بیری لەوە کردەوە کە فەرمانبەرانی پاش گەیشتنیان بە تەمەنێکی تایبەت خانەنشین بکات، لەبەر ئەوە نەبوو کە بەهۆکاری بەساڵاچوون و هێزی بینین، یان بیستن لەدەست دەدەن، بەڵکوو بەو هۆکارە خانەنشینیانی کرد لەوە تێگەیشت هەندێکیان پاش ئەوەی کە گەیشتنە قۆناغی بەساڵاچوویی، تووشی بیرکورتی و فەرامۆشی دەبن، یان بە تەواوەتی زەینیان لەکار دەکەوێ و تووشی کەم زەینی دەبن.

حکوومەتەکان دەیانزانی کەسانێك هەن تەنانەت لە تەمەنی هەشتا ساڵیشدا خاوەنی زەین و بیری بەهێزن، بەڵام بۆ ئەوەی کە هەڵاواردن نەبێت، فەرمانبەرە وریا و خۆش زەینەکانیشی پاش گەیشتن بە تەمەنێکی دیاریکراو، خانەنشین دەکرد. هەروەك تۆلستۆی نووسەری رووسی و ئەفسەری ئەرتشی "تزار"یان لە تەمەنی ٥٥ ساڵیدا خانەنشین کرد، لە حاڵێکدا ناوبراو بیست و پێنج ساڵ دواتر و لە تەمەنی هەشتا ساڵیدا کاتێك دەیەویست سواری ئەسپ بێت بەبێ بەکارهێنانی رکێف دەپەڕییە سەر زینی ئەسپەکە و زەینی هێندە تیژ بوو کە ئینجیلی لەبەر دەخوێند و ناوی خزم، رەگ و تۆرەمەی تەواوی بنەماڵە گەورە و پلە یەك و دووەمەکانی رووسیەی هەتا حەوت پشت دەزانی و هەر کاتێك داوایان لێدەکرد ناویانی دەهێنا.

بەهەرحاڵ دکتۆر ویلفرید داوای دیدارێکی تایبەتی لە "زائربروخ" لە ماڵەکەی کرد و ئەو پزیشکە مەزنەش کاتی چاوپێکەوتنەکەی دیاری کرد و لە کاتی دیاریکراودا ئەو پیاوە هاتە ماڵەکەی "زائربروخ" و مەسەلەی نەخۆشیی "کارل"ی هێنایە گۆڕێ و داوای لە "زائربروخ" کرد کە ئایا رازی دەبێت چەند تاقیکارییەك لەبارەی ئەو دیاردە پزیشکییەوە ئەنجام بدرێت؟

زائربروخ وتی مەبەستتان چییە؟

یاریدەدەر رایگەیاند کە ئەمە یەکەم جارە بەهۆی پچڕانی تراوشتی "کورتیزۆن" کەسێك رەش هەڵبگەڕێ و ئێوەش لە من چاکتر دەزانن کە پچڕانی تراوشی "کورتیزۆن" لەوانەیە کەسەکان بەهۆیەوە سوور هەڵبگەڕێن، بەڵام هەتا ئەمڕۆ رووی نەداوە پچڕانی ئەم هۆرمۆنە (بەرهەمی ئالی خانەی زیندووی لەش) کەسێك رەش دابگەڕێ، بەڵام ئێستا لە زانستی پزیشکیدا رووبەڕووی دیاردەیەکی دەگمەن و تازە بووینەتەوە و نازانین کە ئایا ئەم دیاردەیە لایەنی ناوازەی هەیە یان کەسانێکی دیکەش بەهۆی پچڕانی هۆرمۆنی "کورتیزۆن"ەوە رەش دادەگەڕێن. ئایا رازین لەسەر ئەوەی کە تاقی بکەینەوە هەتا بزانین ئەم دیاردە لە کەسانی دیکەشدا دەردەکەوێ یان نا؟

پرۆفیسۆر "زائربروخ" چەند ساتێك بێدەنگ بوو و پاشـان وتـی: دەزانم ئێـوە پێـشتر ئەنـدامی حیزبی نازی بوون و زانیاریم لەو بارەوە هەیە کە هێندێ لە پزیـشك و نەشـتەرگەرانی نـازی بـەبێ تێبینی و نەترسانە بۆ بەدەستهێنانی ئەزموونی پزیشکی و زانستی خەڵکیان نەشتەرگەری دەکرد و دەیانخستنە ژێر تاقیکارییەوە، بەڵام من لەگەڵ ئەم پێشنیارەتان هاودەنگ نیم و ئەم مرۆڤ کوژییـە قبووڵ ناکەم، یاریدەدەر بەبێ ئەوەی کە قسەیەکی تر بکـات مـاڵاوایی لـە پرۆفیـسۆر کـرد و لـە ماڵەکەی وەدەر کەوت و مەسەلەی تاقیکردنەوەی پزیشکی لەسەر خەڵکانی دیش ڕەت کرایەوە.

## شانۆگەرەکە چی بەسەر هات؟

لە حاڵێکدا پزیشکەکان بۆ چاك بوونەوەی رەنگی کارل دەستیان دەدایە هەر کارێك و بە ئەنجامێك نەدەگەیشتن، بڕیار درا ژنە هونەرمەندێك کە یەکێك لە شانۆکارانی کۆمپانیای وێنەگریی "ئووفا"ی ئەڵمانی بوو، بۆ لابردنی گواتر (ئاوسانی رژێنی ملە قۆرتە) لە نەخۆشخانەی شاریتی نەشتەرگەریی بۆ بکرێت.

دامەزراوەی "ئووفا" لە ئەڵمانیای هیتلەر لە ئەورووپا، کاملترین دامەزراوی وێنەگری بوو و بۆ هەڵبژاردنی شانۆکار و ئەکتەرانی سینەما زۆر بە وردبینی و سەرنجەوە کاری دەکرد و ئەگەر بە ویژدانەوە قەزاوەت بکرێت، دەبێ بڵێین بەرلە شەڕی دووەمی جیهانی، زۆربەی ئەو فیلمانەی کەلە دامەزراوەی "ئوفا" بەرهەمهاتوون، باش و سەرکەوتوو بوون.

بەڕێوەبەر و کارگێڕانی دامەزراوەی "ئووفا" زۆریان بۆ گرنگ بوو و بە وردی سەرنجیان دەدا کە ئەکتەر و هونەرمەندانی فیلمەکان، هەتا ئەو جێگایەی دەلوێ لانیکەم لەباری قەڵافەت و لەش و لارەوە، لەگەڵ ئەو تایبەتمەندییانەدا بگونجێن کە ئەوکات بۆ نژادی رەسەنی ئاریایی لەلایەن تیۆری دارێژانی حیزبی نازییەوە دەست نیشان کرابوو.

ئەوەی ئەمڕۆ کەلە سەردەمی فیلمە دەنگدارەکاندا لەدایك بووە و لەگەڵی ژیاوە، لە ناوەڕۆك و تایبەتمەندیی فیلمە بێدەنگەکان بە باشی ئاگادار نیە و نازانێ پێش لە شەڕی دووەمی جیهانی و هەتا نزیکەی ساڵی ١٩٣٠ی زایینی فیلمەکان بێدەنگ بوون و هونەرمەند و ئەکتەرەکان لە کاتی پیشان داندا قسەیان نەدەکرد و هەر شتێك کە دەیانەویست بیلێن بە ئاماژە و جووڵە دەریاندەبڕی و پاشان لە مەودای نێوان وێنە و گرتە ویدیۆییەکاندا نووسراوە پیشان دەدرا.

لە ساڵی ١٩٣٠ی زایینیەوە بەرەبەرە، فیلمە دەنگدارەکان جێگای فیلمە بێدەنگەکانیان گرتەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی کە تەکنیکی هاوئاهەنگ و گونجاندنی نواندن، جووڵە و ئاخاوتن سەقەت بوو و لە نێوان پیشان دان (شاشەی سینەما) و گوێی بینەر لە هۆڵە گەورەکانی سینەما مەودایەکی زۆر هەبوو و دەنگ پاش بڵاوبوونەوە لە فیلم، ماوەیەکی دەبردە هەتا بگاتە گوێی بینەر، بۆیە کاتێك بینەر قسە و وتەیەکی ئەکتەری دەبیست کە ئەو رستەیەکی دیکەی وتبوو یان لەو دیمەنەی تێپەڕاندبوو.

هەر بۆیە دامەزراوەی وێنەگریی "ئووفا" لە ئەڵمانیا، بە تەما بوو تەنانەت پێش دەسپێکی شەڕی دووەمی جیهانی، فیلمی بێدەنگ بەرهەم بهێنێت. لەو فیلمانەدا هونەر و جوانیی هونەرمەند و ئەکتەرانی سینەما زۆر جێگای سەرنجی کارگێڕ و بەڕێوەبەرانی وێنەگری بوو، هونەر و نواندنی هەندێك لەو شانۆکارانەی فیلمە بێدەنگەکان ببوونە ئەفسانە، بە چەشنێك نیو سەدە دوای ساڵی ١٩٣٠ی زایینی، ناوی هەندێکیان تەنانەت لەم دەورەیەش کە شەپۆلەکانی رادیۆ، تەلەفیزیۆن و چاپەمەنییەکان هەرچەشنە ناوبانگێك دوای چەند حەفتە لەبەرچاو دەخات و کەمرەنگی دەکاتەوە، بە تەواوەتی لەناو نەچووە و هەندێ جار ناویان لە دەزگا پێوەندییە گشتییەکان، رۆژنامە و گۆڤارەکانەوە دیستری یان بەرچاو دەکەوێت.

ئەو ژنە هونەرمەندەش کە دەبوا بۆ لابردنی تومۆری "گواتر" نەشتەرگەریی بۆ بکرێت ناوی "لیلی ـ هۆلم" یەکێك لە هونەرمەندانی دامەزراوەی وێنەگریی "ئووفا"ی ئەڵمانی بوو، گەرچی ئەوکاتە لەش و لاری شادمانی و نەرمونیانیی ساڵی ١٩٣٠ی نەبوو، بەڵام چاوانی شین، زولف و کەزیەی زێڕین، روخساری هێلکەیی و بەژنی بەرز و زراڤ و لەش و لاری شیاوی هێشتا دەریدەخست نموونەیەکە لەو خەسڵەتانەی کە دەمارگرژە نازییەکان بۆ نژادی ئارییایی دیارییان کردبوو.

"لیلی هۆلم" وتبووی کە دەبێ بەدەستی پرۆفیسۆر "زانربروخ" نەشتەرگەریی بۆ بکرێت و قبووڵ کردنی داخوازیی نەخۆش، لەباری هەڵبژاردنی پزیشك یان نەشتەرگەرەوە، بەشێکە لە دروشمی پزیشکی و لە رابردووەوە ئەو بڕیارە لە گۆڕێدا بووە کە نابێ نەخۆش ناچار بە قبووڵ کردنی پزیشکێکی تایبەت بکرێت، چونکە کاریگەریی ئەرێنیی لەسەر رۆحی دادەنێت و ئەو کاریگەرییە نالەبارە رۆحیە، تیمار و دەرمان کردنی نەخۆش وەدوا دەخات، یان کاریگەریی دەوا و دەرمان پووچەڵ دەکاتەوە و سەبارەت بە نەشتەرگەریی "لیلی ـ هۆلم"یش لەبەر ئەوەی کە هیچ بەربەست و کێشەیەك بۆ قبووڵ نەکردنی داخوازییەکەی لە گۆڕێدا نەبوو، "زانربروخ" ئامادە بوو نەشتەرگەریی بۆ ئەنجام بدات.

لە رۆژ و کاتی دیاریکراوی نەشتەرگەرییەکەدا "زانربروخ" وەك هەمیشە پاش شۆردنی دەستەکانی و لەدەست کردنی دەستەوانەی نەشتەرگەری، چووە ژووری نەشتەرگەرییەوە و یاریدەدەرەکانی و ئەو ژنە پەرستارانەی کە دەبوا یارمەتیی پزیشك بدەن لەو ژوورە ئامادە بوون و پێش لە چوونی "زانربروخ" نەخۆشەکەیان بۆ نەشتەرگەری ئامادە کردبوو.

نەشتەرگەری بۆ لابردنی تومۆری گواتر لە بواری گەیشتن بە ئەنجامێکی ئەرێنی، کارێکی

ئاسانه، بەڵام لەباری "تەکنیك و هونەر"ەوە نەشتەرگەرییەکی هەستیارە، بەو هۆیەش وەك هونەر ناودێری دەکەین لەبەر ئەوەی دەستەواژەیەکی خودی پزیشکەکانە و زانایانی پزیشکی، نەشتەرگەرییان بە دوو کەرت دابەش کردووە و بەشێکی کە ناسینی وردەکارییەکانی بابەتی نەشتەرگەرییە، بە زانست ناودێریان کردووە و کەسێك کە دەیەوێ ڕۆژێك لە ڕۆژان کێردی نەشتەرگەری بەدەستەوە بگرێت، دەبێ ساڵانێکی زۆر لە پۆلەکانی کۆلیژی پزیشکی کتێبە پزیشکییەکان بخوێنێت و گوێ لە وانەکانی مامۆستا بگرێت و لەو ساڵانەدا هەر ڕۆژە، یان ڕۆژ نا ڕۆژێك، لە تەلاری توێکاریی ئەندام ئامادە بێت و جەستەی مردوان هەڵبدڕێت، هەتا بە جیا هەموو ئێسك، ماسوولکە، دەماری خوێنبەر، دەماری خوێن هێن و هەر دەمار، ڕەقێنە یان خرمۆتەیەك بە باشی بناسێت و هەر لەو ساڵانە دایە خوێندکاری کۆلیژی پزیشکی کە دەیهەوێت ببێتە نەشتەرگەر، بەرەبەرە لەگەڵ جەستەکان و ئەو بۆن و بەرامانەی کەلە لەشەکانەوە هەڵدەستێ خوو دەکرێت.

بە چەشنێك کە گنخ و بۆگەنیوی ئەندامانی ناو زگی مردوویەك کە سێ مانگ لە مەرگی گوزەراوە، لە لووتیدا هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ بۆنی عەترە زۆر بەنرخەکاندا نیە و هەر لەو ساڵانە دایە لە کاتی نیوەشەودا کە دەڕواتە نێو تەلاری توێکاریی لەشەوە کە پڕیەتی لە جەستەی پارچەپارچە کراوی مردوان، هەست بە ترس و تۆقین ناکات.

ئەو لەبەر ئەوە نیوەشەوی تاریك دەڕواتە نێو تەلاری توێکارییەوە کە بەبێ هەلکردنی چرا و رووناکایی و تەنیا بە یارمەتیی دەست لێدان و هەستی ساواییەوە ماسوولکە جیاجیاکانی جەستەی پارچەپارچە کراو بناسێت.

چونکە ماسوولکەکانی لەش، لە بواری تەشك و پێکهاتەوە پێکەوە جیاوازییان هەیە و تەنانەت ئەم مەسەلەیە کەسانی ناشارەزا (بە هونەری پزیشکی و نەشەرگەری) دەیزانن و کابانێك کە بۆ کڕینی گۆشت دەڕواتە بازار، دەزانێت کە قەوارە و شکڵی ماسوولکەی دڵ لەگەڵ قەوارەی ماسوولکەی سینە، یان لاڕاندا جیاوازییان هەیە و نەشتەرگەرێك پێش ئەوەی کە کێردی نەشتەرگەری بەدەستەوە بگرێ، دەبێ هەر جۆرە ماسوولکە و ئێسکێك کەلە جەستەی مرۆڤدا هەیە لە تاریکیدا و تەنیا لەڕووی دەست لێدانەوە بناسێت کە وەك دەڵێن "خەوی کۆتاڵ" لە چ بارێکەوە کێشراوە و کێشی هاتووە، چونکە ئەم زانیارییە لە داهاتوودا لە کاتی بەکارهێنانی کێردی نەشتەرگەریدا بەکاری دێت.

ئەوەی کە خوێندکاری کۆلیژی پزیشکی، هەتا پێش لە کۆتایی قۆناغی خوێندن و ئەزموون، لە

پۆلی خوێندن یان تەلاری تویکاری فێری دەبیّ، زانستە. بەڵام رۆژێك كە نەشتەری بۆ نەشتەرگەری بەدەستەوە گرت و لەناو لەشدا خستیە کار، ئەوە نیتر "هونەر"یکە و لەو کاتەدا وەکوو هونەری دارتاشی و هەڵکۆڵینی دارە کە ئەسکەنە و تێشوو بەدەستەوە دەگرێت و لەسەر دارەکە کار دەکات هەتا فۆرم و قەوارەیەکی بەرجەستە و قوپاو ساز بکات. یان وەکوو نیگارکێشێکە کە فڵچەی وێنەکێشان بەسەر تابلۆدا دێنیّ هەتا شکڵێك بکێشێتەوە. دیارە نەشتەرگەر کاتێك کێردەکەی دەخاتە کار، ئەو زانیاری و ئەزموونانەی کە پێشتر بەدەستیهێناوە بەکار دێنیّ و نیگارکێشیش، کاتی بەکارهێنانی فڵچە، لەوەی کە پێشوو فێری بووە کەڵك وەردەگرێت، کە وایە هەردوویان، کاتێك سەرقاڵی کارن، سەروکاریان لەگەڵ هونەرێکە نەك زانست.

نەشتەرگەری بۆ لابردنی تومۆری گواتر بۆیە دژوارە چونکە تومۆری گواتر "هەروەك دەزانین هەڵاوسانی تومۆری تیرۆئیدە" لەژێر ملەوە دەردێت و لەو شوێنەش هەندیّ لە ریزە دەمارە هەستیارەکانی جەستە وەك دەماری خوێنبەر لەوێوە تێدەپەڕن و خافڵانێکی پزیشك، لەوانەیە ببێتە هۆی ئەوەی کە یەك لەو دەمارە هەستیارانە بپچڕیّ کە گیانی نەخۆش دەکەوێتە سەترسییەوە، یان ئەوەی کە بەشێك لە جەستەی هەتا کۆتایی تەمەنی نوقسان دەبێت. کە وایە پرۆفیسۆر "زائربروخ" نەشتەرگەرێك نەبوو کە شتێك لەبیر بکات و لەڕووی هەڵەوە رەگ یان دەمار بپچڕێنی و یاریدەدەرەکانی دەیانبینی کە دەستانی پرۆفیسۆر وەك هەمیشە بە خێرایی حەرەکەت دەکات و بەهۆی جووڵەی خێرای دەستانی ئەو نەشتەرگەرە بلیمەتە نەیانبینی کە ناوبراو لە ئاخر و ئۆخری نەشتەرگەریی گواتری ئەو خانمە هونەرمەندەدا دەماری تومۆری (پاراتیرۆئید)یشی پچڕاندووە.

پچڕانی دەماری ئەو تومۆرانە لەلایەن "زائربروخ"وە لەڕووی هەڵە و نەزانینەوە نەبوو، بەڵکوو هەروەك گومان لە مێشکی پزیشکی هەڵکەوتەدا لە دوایین کاتەکانی کارەکەیدا ئەوەی بە بیردا هات کە دەبیّ دەماری تومۆرەکانی "پاراتیرۆئید" بپچڕیّ، چونکە ئەو کارە بەسوودی نەخۆشەکەیە.

تومۆرەکانی پاراتیرۆئید چوار دانەن کە لەژێر مل و لە پشتی تومۆری تیرۆئیدەوە جێگایان گرتووە و لەبەر ئەوەی رەنگیان وەکوو رەنگی ماسوولکەکانی دەوروبەرە، بێجگەلە چاوانی تیژی نەشتەرگەرەکان، کەسێکی دیکە توانای بینینی ئەو چوار تومۆرەی نیە، بۆیە دەڵێین ئەو چوار تومۆرە کە بەشێکن لە تومۆرەکانی "ناندۆکرین" (تومۆرە هەناوییەکان)ی لەش، لە جێبەجیّ کردنی کارەکانی جەستەماندا رۆڵێکی بەرچاویان هەیە.

بڕینی خاتوو "لیلی ـ هۆلم"یان بەست و بردیانە ژووری حەسانەوە هەتا چاك بێتەوە، پاش چەند ڕۆژ باری تەندروستیی باش بوو و وەك باو پاش چاکبوونەوە وتیان ئەو خانمە چەند ڕۆژی دیکە لە نەخۆشخانە بمێنێتەوە هەتا حاڵەتی بێ هێزیی دوای نەخۆشی بگوزەرێنێ و دواتر بڕواتەوە ماڵی خۆی. بەڵام لەو ڕۆژانەدا کە "لیلی ـ هۆلم" قۆناغی بێ هێزیی دوای نەشتەرگەریی لە نەخۆشخانە تێدەپەڕاند، بەرەبەرە لاواز و کز دەبوو و هەر بەیانییەك پەرستار دەهاتە ژووری ئەو نەخۆشە دەیدیت کەلە ڕۆژی پێشوو لاوازتر بووە و ڕۆژێکیان کە خانمە پەرستارەکە هاتە ژووری (لیلی ـ هۆلم"ەوە بە بینینی ڕوخساری حەپەسا، چونکە لە هەر دوولای ڕوخساری، گۆناکانی بە چەشنێك داچۆڕابوون دەڵێی دوو پارچە گۆشتتن کەلە دوو قولاپی دووکانێکی قەسابییەوە هەڵواسراون.

لەڕ و لاوازیی ڕوخسار و داچۆڕانی ماسوولکەکانی، چاوە شینەکانی ئەو خاتوونەی بە جۆرێك بەرجەستە نیشان دەدا کە دەڵێی گلێنەی چاوانی خەریکن دەرپەڕن.

جیالە لاوازیی سەرسووڕهێنەر، ئەو ژنە لەکاتی کراس لەبەر کردندا هەستی بەوە دەکرد قۆڵی کراسەکەی درێژە و دەستەکانی کورت بوونەتەوە. بەژن و باڵای ئەو ژنە کە ڕۆژانێك نموونەی جوانیی نژادی ئاریایی و ئەستێرەی فیلمەکان بوو، بە چەشنێك تەشکی گۆڕابوو کە مرۆڤی تووشی دۆش دامان دەکرد. پاش هاتنە ئارای ئەو دۆخە یاریدەدەرەکان "زائربروخ"یان هێنایە ژوورەکەی "لیلی ـ هۆلم" و ئەو خاتوونە هەرکە ئەو پزیشکە گەورەیەی بینی بە شیوەن و گریانەوە سوێندی دا کە "ئەتۆکسیۆن"ێکی بۆ بوەشێنێ لە ژیان ڕزگای بکات، چونکە ئیتر ناتوانێ بەو تەشك و سیماوە خۆی بە خەڵك پیشان بدات و لەگەڵیان بژی.

"زائربروخ" بە بینینی ئەو ژنە سەری سووڕما، بەڵام تێك نەشەمزا و کارلێکی نەکردە سەری و پاش هاتنەدەرەوە لە ژووری نەخۆشەکە پرسیاریان لێکرد ئایا بۆی دەرکەوت کە نەخۆشیی ئەو ژنە چیە و "زائربروخ" وتی ئەو نەخۆشییە بەهۆی پچڕانی تراوشتی تومۆرەکانی پاراتیرۆئیدی ئەو ژنەوە ڕووی داوە. چوار تومۆری پاراتیرۆئید یەك هۆرمۆن تراوشت دەکەن کە نای "پاراتیرین" یان "پاراتۆرمۆن"ە و ئەم هۆرمۆنە لە لەشی مرۆڤدا دەبێتە هۆی ئەوەی کە دوو مادەی کەلسیۆم و فوسفۆر بگاتە ئێسکەکان و ئەم دوو مادە، کەرەسە و پەسای سەرەکیی پێکهاتەی ئێسکەکانی لەشی مرۆڤ پێکدێنن و ئەگەر بێت و نەگەنە لەش، ئێسکەکانی جەستە بەرەبەرە دەپووکێنەوە و هەم لەباری پانی و هەم لەباری درێژی و هەروەها پتەوییان کەم دەبێتەوە و لەبەر ئەوەش کە ئێسك ڕاگر و کۆڵەکەی ماسوولکەکەیە، کاتێك ئێسك کورت بێتەوە دەبێتە هۆی داخوران و لەناوچوونی

ماسولکەی لەش.

جیالەمەش، بەشێك لە ئەندامە گرنگ و هەستیارەکانی جەستەمان لە ڕێگای ئێسکەکان و بەتایبەت لە مۆخی ئێسکەکان بەرهەم دێت و دوای ئەوەی کە ئێسکەکان بچووك یان پووکێنەوە، ئەو مادە هەستیارانەش کە دەبێ بگەنە جەستە، بەرهەم نایەن و یەك لەو بەشانەش کە کاریگەریی لەسەر دەبێت مۆخی ئێسکەکانە کە یەکێك لە کارگە گرنگ و بەرهەمهێنەرەکانی جەستەی مرۆڤە.

یەکەم جار کە "لیلی ـ هۆل" قۆڵی کراسەی خۆی بینی کە درێژ بۆتەوە، بیری کردەوە کە دەستی کورت بۆتەوە، چونکە دەیزانی مرۆڤ لەوانەیە بە هۆکارگەلێك لەڕ و لاواز ببێت، بەڵام دەستەکانی و بەژن و باڵای کورت نابنەوە و ئەو بەساڵاچوانەی کە بە نیسبەت سەردەمی گەنجێتییەوە کورتەباڵا دەنوێنن، بەو هۆیەوەیە کە بڕبڕە یان گازەری پشتیان دەچەمێتەوە و چەمینەوەش دەبێتە هۆشی ئەوەی کە بەژن و باڵایان کورتتر لە سەردەمی لاویەتی بنوێنێ. بەڵام دوای ئەوەی کە ڕۆژان گوزەرا، ئەو ژنە تێگەیشت کە نەتەنیا ڕوخساری تەشکی گۆڕاوە، بەڵکوو بەبێ هیچ گومانێك لە درێژیی دست و لاقیشی کەم دەبێتەوە. ژنی داماو، کە بەژن و باڵای تۆقێنەری خۆی دەبینی و دەیزانی دەست و لاقی کورت دەبنەوە، تووشی جۆرێك لە شێتی بوو کەلە حاڵەتی ئاساییدا نموونەی زۆر دەگمەنە، بەڵام لە حاڵەتی خەیاڵدا نموونەی لەو بابەتە زیاتر دێتە پێش بەو جۆرەی کە مرۆڤ وا هەست دەکات لە پێست و و قەڵافەتی بوونەوەرێکی دیکە دایە. لە حاڵێکدا لە بوونی خۆی دوودونگ نیە، بەڵام بۆی بۆتە ڕاستی کە لەباری بەژن و تەشکەوە کەسێکی دیکەیە و قەڵافەت و لەشی پێشووی خۆی، وا دەنوێنێ و دێتە پێش چاو کەلە کاتی خەون بینیندا بینیویە و ڕاست نەبووە.

ئەم جۆرە شەیدایی و کەم ئەقڵییە کە بەهۆی پچڕانی تراوشتی تومۆرەکانی "پاراتیرۆئید" کاریگەریی لەسەر مێشك کە ناوەندی هۆش و بیرە دادەنێت و ئەو کەسەی کە تراوشتی تومۆرەکانی پاراتیرۆئیدی پچڕابێ، بەڵام تووشی شێتی نەبێ خاوەنی ئەقڵ و هۆشی کەسێکی ئاسایی نیە، لەبەر ئەوەی نیتر فۆسفۆر کە یەکێکە لە مادە زەرووریەکانی خانەکانی مێشك پێیان ناگات و فۆسفۆر تەنیا بۆ چێ کردن و ڕسکاندنی مێشك پێویست نیە، بەڵکوو پاش چێ کردنی ئەو خانانە هەتا ئەوکاتەی کە مرۆڤ زیندووە دەبێ خانەکانی مێشك فۆسفۆریان پێ بگات هەتا بتوانن ئەرك و کارەکانی خۆیان بە باشی جێبەجێ بکەن و پچڕانی تراوشتی تومۆرەکانی پاراتیرۆئید، پێش بەوە دەگرێت کە فۆسفۆر بۆ هەر بەش و شوێنێك لە لەشی مرۆڤ کە پێویستی

پێیەتی، بگات.

ژنە هونەرمەندەکە نەیدەتوانی هیچ بخوات و برسی چووبووە بەس و ئیشتیای نەمابوو. هەرچەند گەمارۆی بەرلین لەلایەن حکوومەتی یەکیەتیی سۆڤیەتەوە بەردەوام بوو، هەروەك ئامـاژەی پێـدرا خۆراك و خواردەمەنیی جیرەبەندی کراو دەگەیشتە بەرلینی رۆژهەڵات و خەڵکی شار و نەخۆشەکان لە نەخۆشانە برسییان نـەدەبوو و تـەنیا لـە نەخۆشـخانەی شـاریتی لـەباری سـووتەمەنییەوە لـە تەنگانەدا بوون و لە بەرلینی رۆژهەڵات پێچەوانەی بەرلینی رۆژئاوا نەیاندەهێشت خەڵك بۆ گـەرم داهێنانی ماڵەکانیان لە داری پارکە گشتییەکانی ناو شەقامەکان بەکار بێنن.

لە ئەڵمانیای رۆژهەڵات کە بەرلینی رۆژهەڵات لەباری کاروباری ئیدارییـەوە "لەلایەن یەکیەتیی سۆڤیەت"ەوە ئیدارە دەکرا، جۆرێك خەڵووزە بەردینە بەناوی "لـین بیـت" بـە بـەرفراوانی دەسـت دەکەوت و هەیە کە رێژەی خەڵووزەکەی، واتە رێژەی مادەی سووتانی کەمە، بەڵام لە دووسەد ساڵ بەرلەو مێژووە، خەڵکی ئەڵمانیای رۆژهەڵات بۆ تواندنەوەی ئاسن و گەرم داهێنانی ماڵەکانیان لـە وەرزی زستان لە "لین بیت" کەڵکیان وەردەگرت. خەڵووزە بەردینە، هەروەك لەناوەکەشـیدا دیـارە بەردێکە کە دەسووتێ و لە جۆرێکیاندا مادەی سووتانەکەی زۆرە و هەندێکیان کەم.

جۆری باش و نایابی خەڵووزەبەردینە رێژەی مـادەی سـووتانی هـەتا ٩٥٪ە و جـۆرە خـراپ و قەڵبەکەشی هەتا ٦٠٪ و جـۆری "لـین بیـت" بـەپێی کانگاکـەی لـە ٦٠٪ هـەتا ٧٠٪ مـادەی سووتانە کە ناوی "کەربون"ـە.

سەرەڕای ئەوەی لە ئـەڵمانیای رۆژهـەڵات "لـین بیـت" فـراوان بـوو و هێزەکـانی "یەکیـەتیی سۆڤیەت"یش پێشیان بە هێنانی بۆ بەرلینی رۆژهەڵات نـەدەگرت، بـەڵام لـەو خـەڵووزە بەردینـە بەرادەی پێویست نەدەگەیشتە بەرلینی رۆژهەڵات. لەبەر ئەوەی بۆردومانی دەوڵەتانی ئـەمریکا و بریتانیا لە شەڕی دووەمی جیهانی بەشێك لە رێگا ئاسـنەکانی ئەڵمانیای رۆژهەڵاتی تێك و پێك دا و هێشتا نەیانتوانیبوو هەموو ئەو هێڵە شەمەندەفەرانە بخەنەوە گەڕ، هەر بۆیە لـە نەخۆشـخانەی شاریتی ترمۆستات" (ئامێری خۆکار بۆ راگرتنی تینی گەرما لە شـوێنێك)، واتـە ئاسـتی گـەرم داهێنانی ژوورەکان لەسەر ژمارەی ١٩ دانرابوو.

هەندێك لە نەخۆشەکان لە پلەی گـەرمای ژوورەکـان رازی بـوون، بـەڵام هەنـدێکیان سـکاڵا و گلەیان هەبوو و پزیشکەکان دەیانزانی ئەو سکاڵایەیان رەوایە، چونکە جەستەی ئەو ژنە چارەڕەشـە لە پلەی گەرمای ئاسایی لەشی مرۆڤ کە ٣٧ پلەیە لای دابوو. یەکێك لە بەرەنجامـەکانی پـچڕانی تراوشتی تومۆرەکانی پاراتیرۆئید ئەوەیە کە پلەی گەرمای لەش کەم دەبێتەوە، ئـەو کەسـەش کـە

پلەی گەمای لەشی بەهۆیەك دادەبەزێت، لە وەرزی زستاندا بەهۆی سەرماوە زۆر زەجر دەچێژێت. هەر کەسیش جارێك تووشی تا و لەرز کە نیشانەی هێندێ لە ـ تا ـ کان و بەتایبەت نەخۆشینی زەردەیی و تای مالاریا کە هەندێ لە جۆرەکانی هەلآمەتە بێت، دەزانێ کە کەمبوونەوەی گەرمای لەش، چۆن دەبێتە هۆی رەنج و ئازار. ئەوانەی کە تووشی ئەو تا و لەرزانە دەبن کە نیشانەیەکن بۆ هەندێ تا کە ئاماژەیان پێدرا، پلەی گەرمای لەشیان تەنیا لە ماوەیەکی کورتدا، بۆ یەك هەتا یەك و نیو پلە دادەبەزێت، بەلآم ئەگەر لە وەرزی هاوینیشدا تووشی لەرز و تا بین، تەنانەت ناتوانن بە چەند بەتانیەکیش پلەی سەرمای لەشیان کەم بکەنەوە و خۆیان گەرم دابێنن و هەتا ئەوکاتەی کە تا دەگرن و لەوەوە بەدوا، لەرزیان نامێنێت و لەو حالەتەشەوە تێدەگەین ئەو کەسانەی کە گەرمای لەشیان بە هەر هۆیەك بە بەردەوامی کەم دەبێتەوە، لە وەرزی زستاندا لە سەرما چ زەجرێك دەچێژن، چونکە لە جەستەیاندا ئەو دەزگا ئالۆز و هەستیارەی کەلە جەستەی مرۆڤە ئاساییەکان لە نێوان گەرمای لەش و گەرمای دەورووبەر لە وەرزی زستان و وەرزەکانی دیکە هاوسەنگییەك پێکدێنێ، ناتوانێ بە باشی کار بکات.

"لیلی ـ هۆلم" بەردەوام بە چەند بەتانییەك خۆی دادەپۆشی، دیسان هەر بەهۆی سەرماوە گلەی هەبوو و دەیگوت لەبەر سەرما خەوی لێناکەوێت. هەرکەس کە پێشتر "لیلی ـ هۆلم"ی نەدیبوو، ئەگەر چاوی بە روخساری دەکەوت، پێی وابوو ئەو روخسارە هی یەك لەو سەرە براوانەی تایفەی بەناو "جیواروس"ـە کەلە ناوچەی "ئامازۆن" لە ئەمریکای باشوور دزین و ویشك کراوەتەوە. داب و نەریتی ئەو تایفانە ئەوەیە کە دوای ئەوەی کە سەری یەکێك لە دژمنەکانیان بری، ئێسکی کاسەسەر ورد دەکەن و لەناو گۆشت و پێست دەریدێنن و ئێسکی روخساریشی لە ناوەڕاستی ماسوولکە دێننە دەر، پاشان ماسوولکەکانی سەر و سیمای لەبەر ئاگر بەبێ ئەوەی کە بهێڵن بسووتێ، ویشکی دەکەنەوە. دوای ئەوەی کە ویشك بۆوە، سەر و روخسار کە تەواو نیشانەکانی وەك خۆی ماوەتەوە، تەنیا نەختێ گەورەتر لە مستەکۆڵەی دەست دێتە پێش چاو و ئیتر بۆگەن نابێ و بە میچی کۆخەکەیانەوە هەلێدەواسن و هەرچەند ژمارەی سەرە براو و ویشك کراوەکان بە میچی کۆخەکەوە زیاتر بێت، نیشانەی شەرەف و گەورەیی خاوەن کۆخەکەیە.

پزیشکانی نەخۆشخانەی شاریتی لە خێرایی گۆڕانی قەلآفەت و بەژنی "لیلی هۆلم" زیاتر لە لەرز و تەشك گۆڕان و کورت بوونەوەی دەست و لاقی سەریان سوور ما و پێش بینییان نەدەکرد کە بچڕانی تراوشتی تومۆرەکانی پاراتیرۆئید لە ماوەیەکی کورتدا ئەو هەموو گۆڕانە لە ماسوولکە و ئێسکی کەسێکدا بەدی بێنێ.

"لیلی ـ هۆلم" هاوكات لەگەڵ ئەوەی کە بـچووكتر دەبـۆوە، ڕەفتـار و ئـەخلاقی کـچانی کـەم تەمەنیـشی گرتبوو و ڕۆژیکیان داوای لە خانمە پەرستار کرد کە دەســتەیەك قەنــەفی بـچووك لــەو جۆرە قەنەفانەی کە کچانی کەم تەمەن یاریی پێدەکەن بۆ بێنێت و ئەویش ئەو داوایــەی نەخۆشــی گەیاندە بەرپرسانی نەخۆشخانە و ئەوانیش بڕیاری کڕینی ئەو قەنەفەیان دا، چـونکە پێیـان وابـوو ئەو کارە نەخۆشە داماوەکە سەرقاڵ دەکات و نەختێ لە ئازاری ڕۆحیی کەم دەکاتەوە.

## پێکهێنانی کۆنگرە
## بۆ توێژینەوە

ئەم بابەتە و دوو ڕووداوی سەرسووڕهێنەری دیکە کەلە نەخۆشخانەی شاریتی ڕوویان دابوو، پزیشکانی ناچار کرد کە بۆ تاوتوێی ئەو سێ ڕووداوە کۆنگرەیەکی پزیشکی بگرن و لەو کۆنگرەیەدا جیالە پزیشکەکانی نەخۆشخانەی شاریتی، کۆمەڵێك لە پزیشك و نەشتەرگەرانی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتیش بەشدارییان کرد. پێش ئەوەی کە باسەکانی کۆنگرە دەست پێ بکات، لەلایەن پزیشکانی نەخۆشخانەی "شاریتی"یەوە ڕاپۆرتێك لەبارەی نیشانەکانی ئەو سێ نەخۆشە پێشکەش بە کۆنگرە کرا کە یەکیان بەژنی زۆر بەرز بوو، یەکیان سەر و سیما و روخساری وەك ڕەش پێستەکانی لێهات و نەخۆشی سێیەمیش کە بە خێرایی بچووك دەبێتەوە و ترسی ئەوەش هەیە کە لەباری بەژن و بەرزیی بالایەوە ببێتە قەد بووکەڵەیەك.

لە ڕاپۆرتەکەدا هاتبوو یەکەم نەخۆش ئەو گۆڕانە بەرچاو و سەیروسەمەرانەی کەلە جەستەیدا بەدیهاتبوون پێی قبوڵ نەدەکرا، یانی ئەندامانی جەستەی، تاقەتی قبوڵ کردنی ئەو گۆڕانانەیان نەبوو و کۆچی دوایی کرد، بەڵام نەخۆشی دووەم و سێیەم هێشتا زیندوون بەبێ ئەوەی کە خاترجەم بین کە زیندوو دەمێنن، وای دابنێین کە زیندووش بێنن لەباری مرۆیی و کۆمەڵایەتییەوە، وەك مردوو دێنە ئەژمار.

لەو ڕاپۆرتەدا، باس لە هەرکام لە هۆکارەکانی ئەو سێ نەخۆشیە کرابوو و وتیان لە هەر سێ حاڵەتەکەدا هۆکاری نەخۆشییەکە بە شێوەی ئەرێنی یان نەرێنی، تراوشتی تومۆرە ناوکییەکان بووە، بەو جیاوازییەوە کەلە حاڵەتی یەکەمدا، زیادبوونی تراوشتی تومۆرێکی ناوکی بووە هۆی ئەوەی کە بەژن و باڵای نەخۆش درێژتر بێت و لە حاڵەتی دووەم و سێیەمدا، پچڕانی تراوشتی تومۆرە ناوکییەکان بوونە هۆی ڕەشبوونەوەی یەکیان و بچووك بوونەوەی جەستەی ئەوی دیکە.

پاش ئەو بەرابیە، ڕاپۆرتی پزیشکانی نەخۆشخانەی شاریتی پێداگری لەسەر دوو بابەتی سەرەکی دەکرد. یەکەم: ئەوەی کە ئاخۆ زیادبوون یان پچڕانی تراوشتی تومۆری ناوکی لە کەسانی دیکەشدا هەمان ئەو بەرەنجام و نیشانانە وەردەر دەکەوێت، یان ئەو نەخۆشی و نیشانانە تەنیا لەسەر جەستەی ئەو سێ کەسەدا دەرکەوتووە و ئایا هەتا ئەمڕۆ لەمەڕ هەرکام لەو سێ حاڵەتە، تاقیکارییەك لەسەر خەڵکانی دیکە کراوە هەتا بزانین هاوشێوەی ئەو نەخۆشییانە، لەسەر جەستەی

کەسانی دیکەش روو دەدات یان نا؟

بابەتی دووەم ئەوە بوو کە ئاخۆ بۆ دەرمان کردنی ئەو نەخۆشانە دەبێ چ بکرێت؟ یان ئایا بە وەشاندنی تراوشتی تومۆرە ناوکییەکان دەکرێ نەخۆشی دووەم و سێیەم دەرمان بکرێن؟ لەو راپۆرتەدا تەنانەت بە شێوەی لاتاویش ناوی "زائربروخ"یان نەهێنا، لە حاڵێکدا بۆ پزیشك و نەشتەرگەرانی نەخۆشخانەی شاریتی روون ببۆوە کەلە هەر سێ حاڵەتدا بەرپرسی نەخۆشی "زائربروخ"ـە کە بە هەڵە دەستکاریی تومۆری نەخۆشەکانی کردووە. پێداگری لەسەر وشەی "هەڵە" دەکەین، چونکە دکتۆرەکانی نەخۆشخانە نەیاندەتوانی وا بیر بکەنەوە کە دەستکاریی تومۆری نەخۆشەکان لەلایەن "زائربروخ"ەوە بە ئەنقەست بووە (هەڵبەتە ئەنقەست لەرووی شێتی" نەك هەڵە.

هەڵبەت ئەو پزیشك و نەشتەرگەرانەی کە ئەو راپۆرتەیان ئامادە کردبوو ئیرەییان بە "زائربروخ" دەبرد و حەزیشیان دەکرد کە لەو راپۆرتەدا باسی ئەو سێ هەڵە پزیشکییەی وەستا بکەن. ئەگەر لەو راپۆرتەدا باسی ئەو هەڵانە کرابا، نەتەنیا "زائربروخ"یان سەرکۆنە دەکرد، بەڵکوو ئەگەری زۆر بوو لایبەرن و ئیدی ئیزنیان نەدەدا بە سەربەستی بچێتە ژووری نەشتەرگەری و کێرد بەدەستەوە بگرێت، بۆیە مووچەیەکی خانەنشینییان بۆ دەبڕییەوە هەتا کۆتایی تەمەنی لە ماڵدا بژی.

دوو شت بووە هۆی ئەوەی کە ئامادەکارانی ئەو راپۆرتە، ناوێك لە "زائربروخ" نەهێنن و ئەو وەك بەرپرسی مەرگی نەخۆشی یەکەم و تەشك گۆڕان و نوقسان بوونی دوو نەخۆشی دیکە نەناسێنن. یەکەم خاڵی بەرجەستەی زانستی و هونەریی ئەو مامۆستا ئەوە بوو کە هەموو نەشتەرگەرانی ئەڵمانیا، لەسەرەوە بوونی پلەی زانستی و پزیشکیی ئەویان پەسەند دەکرد و دووەم ئەوەی کە دەیانزانی "زائربروخ" لەلایەن حکوومەتی ئەوکاتەوە گرنگی و سەرنجی پێدەدرێت.

هەروەك گوتمان هەرچەند هێشتا لە ئەڵمانیای رۆژهەڵات حکوومەتێکی ناوچەیی و سەربەخۆ دانەمەزرابوو، بەڵام حیزبی کۆمۆنیستی ئەڵمانیای رۆژهەڵات، بەکردەوە وەك دەسەڵاتدار دەهاتە ئەژمار و لێپرسراوانی حیزبی کۆمۆنیستی ئەڵمانیای رۆژهەڵات رێز و حورمەتی "زائربروخ"یان رادەگرت و پشتیوانییان لێدەکرد، ئەمە لە حاڵێك دابوو کە "زائربروخ" ئەندامی حیزبی کۆمۆنیست نەبوو. بەڵام خۆ بواردنی لە ئەندام بوون لە حیزبی ناسیۆنالیستی نەتەوەیی ئەڵمانیا (حیزبی نازی) لە سەردەمی هیتلەر و کۆچ نەکردنی بۆ ئەڵمانیای رۆژئاوا پاش کۆتایی شەڕ، لەلای کۆمۆنیستەکانی پێگە و کەسایەتییەکی مەزنی پەیدا کردبوو و لەوەش ئاگادار بوون کە نازییەکان

داوایان لە "زانربروخ" کردووە کە ببێتــە ئەنـدامی حیزبـی نـازی و ئـەویش قبـوولّی نـەکردووە و ڕەتکردنەوەی بانگهێشتی نازییەکان لە دەورەی هیتلەر، ئەویش کاتێك کە نەمـسا خرابـووە سـەر ئەڵمانیا و هیتلەر لەلای نازییەکان وەك دەسەڵاتدارێکی سەرووی مرۆیی دەهاتە ئـەژمار، بـوێریی گەرەك بوو و کەسێك ئەو بانگهێشتەی ڕەت کردباوە، دەبوا خۆی بۆ قبوولّ کردنی هەرچەشنە ئازار و چارەڕەشییەك ئامادە بکات.

کارەکانی کۆنگرەی پزیشکی لەبارەی ئەو دوو نەخۆشەی کە یەکیان ڕەش هەڵگـەڕابوو و ئـەوی دیکەشیان گچکە ببۆوە، ئەنجامێکی خێرایان نەبوو. چونکە لە ڕاگەیەندراوێکدا کـە دوای کۆتـایی گفتوگۆکان لەلایەن کۆنگرەوە دەرکرا، دەرمانێکیـان بـۆ چـاکبوونەوی ئـەو دوو نەخۆشـە دیـاری نەکرد، بـەڵام گوتیـان دەبـیّ بـۆ دۆزینــەوەی ڕێکـاری دەرمـان، تاقیکارییـەکی بـەربڵاو لەسـەر گیانلەبەران دەست پیّ بکەن و تراوشتی تومۆر (کورتیکۆ ـ سورنال) و تومۆرەکانی (پاراتیرۆئید)ی ئەو گیانلەبەرانە بپچڕیّ هەتا نیشانەکانی ببینرێت و ئەوکات بیر لە دەرمان کردنیـان بکرێتـەوە و ئەگەر ڕێگای دەرمان کەشف کرا، ئەوکات لەسەر ئەو دوو نەخۆشـە کـە ئێـستا لـە نەخۆشـخانەن تاقی بکرێتەوە.

دیارە پێشبینی ناکرێت ئەو تاقیکارییانەی کە لەسـەر گیانلەبـەرەکان ئـەنجام دەدرێـت، دەگاتـە ئەنجام یان نا؟ یان ئەگەر بەرەنجامی ئەرێنی هەبێت، ئەو ئەنجامە کە دێتەدی دەبیّ چۆن بۆ ئەو دوو نەخۆشە بەکار بهێنرێت؟

***

نەخۆشـێکی دیکە کە داوای کردبوو بەدەستی پرۆفیسۆر "زانربروخ" نەشتـەرگەریی بـۆ بکرێـت، بە "ئەشتۆمب" ناسرابوو. ئەو کەسە لە سەرەتای ژیانیدا کرێکاری کانزا بوو، بـەڵام ئەوکاتـە کـە دەیەویست لەلایەن "زانربروخ" نەشتەرگەریی بۆ بکرێت یەکێك لە پیـاوە سیاسـی و ناسـراوەکانی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات بوو. سـاڵی ١٩٣٣ی زایینـی "ئەشتومب" کرێکـاری کارگەیـەکی کـانزایی و ئەندامی حیزبی کۆمۆنیستی ئەڵمانیا بوو.

ئەو ساڵە بەو چەشنەی کەلە مێـژووی فـەرمیی ئـەڵمانیادا نووسـرابوو، نازییـەکان پارلـەمانی نەتەوەیی ئەڵمانیا ناسراو بە "رایشتاك"یان ئاگر تێبەر دا و حیزبی کۆمۆنیـستی ئـەڵمانیایان وەك ئەنجامدەری ئەو کارە بە تاوانبار لە قەڵـەم دا و کۆمـەڵێك لـە کۆمۆنیـستەکانیان دەستبەسـەر و زیندانی کرد و "ئەشتۆمب"یش یەك لەو کەسانە بوو کـە زینـدانی کـرا. یـەك لـەو کۆمۆنیـستە بەندییەکان بەناوی "لیوبە" کە دیار بوو تووشی کورت زەینییە، بە ئیعـدام مـەحکووم کـرا و ئـەو

پیاوە بێتاوانەیان کوشت و هەندێ لە کۆمۆنیستەکانی دیکەش بە زیندانی کورت ماوە سزا دران و پاش کۆتایی دەورەی سزای زیندانییەکەیان ئازاد کران، بەڵام "ئەشتۆمب" بە زیندانی هەتاهەتایی سزا درا.

ساڵی ١٩٤٤ی زایینی کە کۆمەڵێك لە ئەفسەرانی ئەرتەشی ئەڵمانیا بەهۆی ئەوەی کە دەیانزانی بێگومان ئەڵمانیا شکست دێنێ، پیلانێکیان بەدژی هیتلەر دارشت (هەڵبەت ئەو پیلانە بە ئەنجام نەگەیشت)، هاوکات لەگەڵ ئەو کەسانەی کە بە تاوانی بەشداری لەو پیلانە کەوتنە زیندان و ئیعدام کران، چەند کەس لە کۆمۆنیستە ئازاد کراوەکانیش هەبوون. ئەگەر "ئەشتۆمب" ئەوکاتە ئازاد بوایە، ئەگەری زۆر بوو دەستبەسەر و ئیعدام بکرێت.

ئەوکاتە ئەو پیاوە لە گرتووخانە بوو و یەك ساڵ دواتر و دوای ئەوەی کە هیتلەر خۆکوژیی کرد و ئەڵمانیای نازی تەسلیم بوو، "ئەشتۆمب" لە زیندان ئازاد کرا و لەبەر ئەوەی ساڵی ١٩٣٣ی زایینی هەتا کۆتایی حکوومەتی هیتلەر زیندانی بوو، لەلای کۆمۆنیستەکانی ئەڵمانیای رۆژهەڵات وەك قارەمانێکی نەتەوەیی ناسرا. "ئەشتۆمب" پێش ئەوەی کە بکەوێتە زیندان تووشی برینی ریخۆڵە باریکە بوو.

لە ماوەی ئەو سێزدە ساڵە ئەو پیاوە لە زیندان بۆ ساڕێژبوونی برینی ریخۆڵە باریکە دەوا و دەرمانی دەخوارد، بەڵام بەهۆی ئەوەی کە خۆراکی باشی نەبوو و ئەو کەسانەش کە تووشی برینی ریخۆڵە باریکە یان برینی گەدە دەبن، دەبێ لە خواردنی هەندێ خۆراك خۆ ببوێرن و رێنەماییەکی تایبەت بۆ پارێز کردن لە خواردندا رەچاو بکەن و "ئەشتۆمب" لە زینداندا لەبەر ئەوەی کە بێجگەلە خواردنی ئەوێ چارەیەکی دیکەی نەبوو و بۆ ئەویش خوارنێکی تایبەتیان لێ نەدەنا، تووشی ئەو نەخۆشیە ببوو.

دوای ئازادبوون لە زیندان چونکە کەرەسەی زیاتری بۆ دەرمانی خۆی دەسخست، هەوڵی دا بە دەوا و دەرمان تیماری خۆی بکات، بەڵام دوای چوار ساڵ مەعلیجە بە دەوا و دەرمان، پزیشکەکان پێیان راگەیاند کە بۆ دەرمان، دەبێ نەشتەرگەریی بۆ بکرێت.

"ئەشتۆمب"یان لە نەخۆشخانەی شاریتی خەواند و چەند رۆژێك لە نەخۆشخانە چاوەڕێی کرد هەتا ئەوەی کە بۆ نەشتەرگەری ئامادە بکرێت و رۆژی دووەمی مانگی ژوونیەی ساڵی ١٩٤٩ بردیانە ژووری نەشتەرگەری و هەروەك "ئەشتۆمب" داوای کردبوو پرۆفیسۆر "زائربروخ"یان بۆ نەشتەرگەرییەکەی دیاری کرد.

## مەسەلەی دەستەوانەکە

"زاتربروخ" بەرەو ناودەستەکە کەوتەرێ و دەستەکانی بە ئاوی شیلە و گەرم و سابوون شوشت و دواتر یەکێك لە ژنە پەرستارەکان دەستەوانەی نەشتەرگەریی دژە ژەهر کراوی لەگەڵ پـوتیس دایـە نوستادی گەورە کەلە دەستیان بکـات، بـەڵام "زاتربـروخ" دەسـتەوانەکەی لـەو ژنـە وەرنـەگرت، "ویلفرید" یاریدەدەرەکەی "زاتربروخ" بینی لە وەرگرتنی دەستەوانەکە خۆی بوارد و بیری کـردەوە بێگومان هەتا چەند چرکەیەکی تر دەستەوانەکان لەدەست دەکات.

بـەڵام پزیـشکی بلیمـەت بـەبێ ئـەوەی کـە دەسـتەوانە لەدەسـت بکـات، چـووە ژووری نەشتەرگەرییەوە. دەستەوانەی نەشتەرگەری سەرەڕای ئەوەی کە کەرەسـەیەکی سـادەیە، بـەڵام لـە کاری پزیشکی و نەشتەرگەریدا یەکێك لە کەرەسە گرنگەکانە بۆ پێشگیری لە چڵك و کـیم کردنـی برین. پێش ئەوەی نەشتەرگەرەکان دەستەوانە لەدەست بکـەن، هەرچـەند پـێش نەشـتەرگەری بـە جوانی دەست و پلیان دەشۆن، دیسانیش چەند میکرۆب لەلای قامکەکان، ناولەپ و پشتە دەسـت دەمێنێتەوە و ئەو میکرۆبانە لەوانەیە شوێنی برینـەکان ئـالودە بکـەن و برینەکـە چـڵك و کـیم بکات. ئەمڕۆ ئەگەر برینێك چڵك بکات بە دەرمانە "ئانتی بیۆتیك"ەکان میکرۆبەکە لەناو دەبەن و پێش بە مەرگی نەخۆش دەگرن.

بەڵام جاران دەرمانە ئانتی بیۆتیکەکان نەبوون، یان ئەو ساڵانە وەکوو ئێستاکە برەویان نەبوو و دوای ئەوەی کە برینی شوێنی نەشتەرگەری چلکی دەکرد، ئەگەری ئەوە بوو کە نەخۆشـەکە لـەپێ بخات. داهێنان بـۆ لەدەسـت کردنـی دەسـتەوانە کـە ئـەمڕۆ لـە هـەموو شـوێنێك بۆتـە ئـەرکی نەشتەرگەری، بە تەواوەتی پێشی بە مەترسیی چڵك کردنی برین گرت.

دەبێ ئەوەش بزانرێ کە هەر ئەندازە بۆ گەنبەری و میکرۆبکوژیی جوتێك دەستەوانە بـە وردی سەرنج بدرێت، چەند ساتێك کە نەشتەرگەرییەکە دەست پێ بکـات، دەسـتەوانەکە بـە میکرۆبـی برینی خودی نەخۆشەکە ئالودە دەبێت. بەڵام میکرۆبەکانی لەشی نەخۆش کە لەسـە دەسـتەوانەکە دەمێنن (ئەگەر بێت و پلەی گەرمای لەشی نەخۆش یانی ٣٧ پلە بێت) دەستبەجێ زیاد دەبن و بۆ نەخۆش مەترسییان نیە، لەبەر ئەوەی "ئانتی بادی"ی لەشی ئەو نەخۆشە میکرۆبەکان دەناسـێ و ڕێگای لەناوبردنیان دەزانێ. "ئانتی بادی" کەلە زمانی نێودەوڵەتیی پزیشکیدا، بە کەڵك وەرگرتن

له دەستەواژەی فەرەنسیی بە "ئانتی کـوور" دەناسـرێ و وەك یـەکێك لـە کەرەسـە بـەهێزەکانی بەرگریی جەستەمان دێتە ئەژمار، نابێ لەگەڵ "خرۆکە" (گلبول) سپییەکان کە ئەوانیش بەشێکن لە پێکهاتەی کاریگەری بەرگریی جەستە بە هەڵەیان بگرین.

"ئانتی بادی" تەواوی ئەو میکرۆبە باو و ناسراوانەی کـە هێـرش دەکەنـە سـەر جەسـتەمان و لەناو لـەشمان دان، دەناسـێت و دەزانێـت هەرکامـەیان چـۆن لـەناو بـەرێت و تـەنیا لـە هەمبـەر میکرۆبێکی نامۆ و نەناسراودا دەخافڵێ، بەڵام ئەو خافڵاندنەش پتر لە چرکەیەك ناخایەنێ کـە بـۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو میکرۆبە "ئانتی بادی"ی تایبەت بەرهەم دێت. دەبێ ئـەوەش بـزانین کەلـە جەستەی ئێمەدا "ئانتی بادی" تەنیا یەك جۆر نیە و جەستەی مـرۆڤ بـۆ بەرەنگاربوونـەوەی هـەر جۆرە میکرۆبێك "ئانتی بادی"یەکی تایبەت بەرهەم دێنێت.

میکرۆبیش دوای ئەوەی کە هاتە ناو لەشمانەوە چەکی خۆی کە بە "ئانتی ژن" ناسراوە دەنێرێتە شەڕی ئانتی بادی و جەنگی نێوان ئەو دوانە، شەڕێکە کە ژیانی مرۆڤی پێ بەستراوەتەوە و ئەگـەر بێت و چەکی میکرۆب واتە "ئانتی ژن" سەربکەوێت مرۆڤ دەمرێت. لە شەڕی نێـوان میکـرۆب و "ئانتی بادی"دا کەرەسە بەرگرییەکانی دیکەی جەستەمان بـۆ وێنـە "خرۆکـە سـپێیەکان" دێنـە یارمەتیی ئانتی بادی. چۆنیەتیی شەڕی نێوان "ئانتی بـادی" و "ئـانتی ژن" یەکێکـە لـە باسـە بـەربڵاوە زانـستی و ئەرکـەکانی ئەنـدامانی لـەش و زینـدەوەرزانی و هـەروەها زانـستی "میکرۆبیۆلۆژی" (زانستی زیندەوەرزانیی میکرۆبی)یە و ناکرێ لێـرەدا برۆینـە چوارچێوەی ئـەو باسەوە و ڕێڕەوانی دوو زانستی زیندەوەرزانی و میکرۆبیۆلۆژی دوای ئـەوەی کـە هـەموو قۆناغـە زانستگاییەکان لەم زانستەدا تێپەڕ بکەن و بەرجەستەترین بڕوانامەی دەرچوون لە خوێنـدنیان لـەم دوو زانستە بەدەست بێنن، ئاوکات دەبێ لەبارەی هەوێنی "ئانتی بادی" و "ئانتی ژن" بکۆڵنـەوە و هێشتا بیرمەندێك سەریهەڵنەداوە کە شیکردنەوەی جەنگی "ئانتی بادی"ی لەشی مـرۆڤ لەگـەڵ میکرۆبـەکان بنووسـێتەوە و بیخاتـە بەردەسـت ئـەو کەسـانەی کـە دەرفـەتی خوێنـدنی کتێبـە زانستییەکانیان نیە. ئەگـەر بێـت و چـۆنیەتیی شـەڕی هەمیـشەیی بنووسـرێتەوە شـیکردنەوە و داستانی حیماسەی "ئیلیاد" هۆنینەوەی هۆمر شاعیری یۆنانی دەخاتە ژێر کاریگەرییەوە.

هەر بۆیە تەنیا بەمە قەناعەت دەکەین، لەبـەر ئـەوەی ئـەو میکرۆبانـەی کـە دەنیـشنە سـەر دەسـتەوانەی نەشـتەرگەرەکەوە، میکرۆبـەکانی برینـی خـودی نەخۆشـەکەن و "ئـانتی بـادی"ی جەستەش دەیانناسێت و دەزانێ کە چۆن چۆنی لەناویان بەرێت و ئیتر مەترسییەکان بۆ سەر گیانی نەخۆش نیە.

دکتۆر "ویلفرید" لە ژووری نەشتەرگەری دوای ئەوەی کە بینی "زائربروخ" بەبێ ئەوەی کە دەستەوانە لەدەست بکات کێردی نەشتەرگەریی بەدەستەوە گرت، پێی وت مامۆستای بەرێز ئایا بەبێ دەستەوانە نەشتەرگەری بۆ نەخۆشەکە دەکەن؟ "زائربروخ" بە لاتاوەوە چاوێکی لێکدر و وەڵامی دایەوە لە کەنگێوە دیاری کراوە کە ئێوە فەرمان بە من بکەن؟

یاریدەدەر سەری داخست و ئیدی بێدەنگ بوو. بێدەنگییەکە دوو هۆی هەبوو یەکەم بەلای خۆیەوە وتی خۆبواردنی ئوستاد لە لەدەست کردنی دەستەوانە بێگومان قازانجێکی تێدایە و دووەم ئەوەی کە خۆی بە مەدیۆنی "زائربروخ" دەزانیێ. ئەگەر پشتیوانیی "زائربروخ" نەبوایە لە هەلومەرجی سیاسیی ئەوکاتی ئەڵمانیا ئیمکانی نەبوو پیاوێکی وەکوو ئەو کە پێشتر ئەندامی حیزبی نازی بووە، ئیزن بدەن لە نەخۆشخانە کار بکات و دەرمانخانەی تایبەتیی هەبێت.

هەروەك وتمان نەخۆشیی "ئەشتۆمب" برینی ریخۆڵە باریکە بوو کە بەهۆی ساڵانێکی زۆر لەناو زیندان نەیتوانیبوو ئەو برینە لە رێگای دەرمان و پارێزکردن لە خواردنەوە دەرمان بکات. هەروەك دەزانین کە ریخۆڵە باریکە، بەشێکی سەرەکیی ریخۆڵەکانی مرۆڤە کەلە گەردەوە دەست پێدەکات کە بە ریخۆڵەی گەورە کۆتایی دێت و شێوازی کارکردنی ریخۆڵە باریکە ئەمەیە کە ئەو بەشە لە ریخۆڵە کە بەهۆی دەرمانەوە سارێژ نابێت، هەڵدەگرن و ئەوکات دوو بەشی ریخۆڵە پێکەوە دەدروون.

دوای ئەوەی کە شوێنی نەشتەرگەرییەکە دەرکەوت، ئەو کەسانەی کەلە ژووری نەشتەرگەری بوون، برینی ریخۆڵەکەیان بینی و دوو یاریدەدەرەکەی "زائربروخ" بینییان کە ئەو لەباتی ئەوەی کە تەنیا شوێنی برینەکە بپچرێنێ و لای ببات، بە دوو زەربەی خێرا تەواوی ریخۆڵە بچووکی پچڕاند، بە چەشنێك لە نێوان گەدە و ریخۆڵەی باریك (کە ریخۆڵەی بچووك جێگای گرتووە) شتێك نەمایەوە.

پچڕان و لابردنی تەواوی ریخۆڵەی بچووك زەروری نەبوو و دەبوا پزیشك جۆرێك کار بکات کە ئەو بەشانەی ریخۆڵە بچووك کە ساغ بووە، بۆ نەخۆشەکە بهێڵێتەوە، چونکە هیچ بەشێك لە هەناو و ریخۆڵەکان نیە کە لەباری هەرسی خۆراکەوە بێ کەڵك بێت. پچڕانی بەشێك لە ریخۆڵە بۆ نەخۆش زەرەری نیە، چونکە بەشەکانی دیکەی ریخۆڵە، قەرەبووی کاری ئەو بەشەی کە لابراوە، دەکەنەوە. بەڵام ئەگەر بێت و هەموو بەشەکانی ریخۆڵە لابرێت و ئەویش ئەگەر ریخۆڵە بچووك بێت کە درێژییەکەی کەمە، بۆ نەخۆشەکە گرفت دێتە پێش. بە تەئکید کردن لەسەر ئەم مەسەلەیەی کە هیچکات تەواوی ریخۆڵەی باریك (کەلە شوێن ریخۆڵە بچووك"وەیە لانابرێت، چونکە ئەگەر بێت و هەموو ئەو ریخۆڵەیە هەڵبگرن، نەخۆش توانایی هەرسەك و هەڵتاوێنی خۆراکی نامێنێت و لە

ئەنجامدا زیندوو نامێنێت و دەمرێت. دوای ئەوەی نەشتەرگەری بلیمەت بە تەواوەتی ڕیخۆڵەی بچووکی نەخۆشەکەی پچڕاند و فڕێی دا، دەبوا گەدە و ڕیخۆڵە گەورە پێکەوە بدووریت، بەڵام ئەو کارەشی نەکرد و لەباتی ئەو کارە ڕێگای گەدە و ڕیخۆڵەی بەست، بە چەشنێك لەناو زگی نەخۆش ڕێگا و پێوەندییەك لە نێوان گەدە و ڕیخۆڵەدا نەمایەوە.

کەسێك کە تەنانەت بۆ ئەوەی کەمترین زانیاریی لەبارەی دەزگای هەرسەکەوە هەبێت، دەزانێ کاتێك ڕێگای گەدە و ڕیخۆڵە بەسترا و ڕێگایەکی پێوەندییان نەبێ، خۆراك پاش ئەوەی کەلە گەدە قۆناغی یەکەمی هەرسەکی تێپەڕاند، ڕێگایەکی نیە هەتا بڕواتە ناو ڕیخۆڵەوە و دەزانین کە خۆراك تەنیا پاش چوونی بۆ ناو ڕیخۆڵە تێکەڵ بە لەش دەبێت و مرۆڤ تێر و بەهێز دەکات. جیالەمە دوای ئەوەی کە خۆراك قۆناغی سەرەتایی هەرسەکی لەناو گەدە تێپەڕاند، ئەگەر بێت و لەو شوێنە نەیەتە دەرەوە و نەڕواتە ناو ڕیخۆڵەوە، بەرەنجامی خراپ و پڕ مەترسیی دەبێت کە بۆگەن کردنی خۆراك لە گەدە و دواتر "سپ تی سی" یانی چڵك و پیس بوونی تەواوی خوێن یەك لەو بەرەنجامانەیە کە دەبێتە هۆی لەناوچوونی نەخۆش.

دوو یاریدەدەری پرۆفیسۆر "زانربروخ" سەرەڕای ئەوەی کە بە چاوی خۆیان بینییان کە ناوبراو ڕێگای گەدە و ڕیخۆڵە باریکەی نەخۆشەکەی بەستووە، بە چەشنێك نیتر لە نێوان گەدە و ڕیخۆڵەی نەخۆشدا پێوەندییەك نەمابوو، بەڵام هێندە متمانەیان بە زانست، لێهاتوویی و هونەری ئوستا هەبوو ئەو کار و نەشتەرگەرییەیان بە مەسڵەحەت و کارێکی باش وەسف کرد. مرۆڤ سەری سوور دەمێنێ کە پاش سێ ڕووداو لەڕاستیدا سێ کارەسات کە بەدەستی "زانربروخ" روویان دابوو، چۆن ئەو دوو کەسە، تێنەگەیشتن کە نەشتەرگەری بلیمەت تووشی کورت زەینی و لەبیرچوونەوە بووە و بەرەنجامی ئەو کارەی مەرگی ئازاراویی "ئەشتۆمب"ی نەخۆشی بەدواوە دەبێت.

## دەرمانی دوو نەخۆشی بە شێلانی مۆخ

"زائربروخ" ماوەیەك بەرلەو ڕێكەوتە ئەو ڕووداوانە ڕوویان دابوو كەلـە لاپـەڕەكانی پێـشوودا باسیان لێوە كرا كە دەكرێ هەندێ لە نیشانە و دەركەوتە دەروونییەكان بە شێلان (مەساج)ی مۆخ چارەسەر بكرێن و بۆ وێنە وتبووی دەكرێ بیر و زەینی خەڵكانێك كە زەین و فكری خۆیان لەدەست داوە، بەبێ زیان گەیاندنی مۆخ بۆیان بگەڕێتەوە و مەبەستی "زائربروخ" لە زیانی مۆخ ئەمە بـوو كە بەشێك لە مۆخ بەهۆی پێكدادانێك یان هۆیەكی دیكەوە لەناو چووە (كـە لـە وەهـا دۆخێكـدا بەهۆی بریندار بوون كەسی بەركەوتوو گیان لەدەسـت دەدات). پیاوێـك كـە كرێكـارێكی پـسپۆڕی پیشەیی بوو سەردانی نەخۆشخانەی كرد و وتی زەیـن و یادگـەی لەدەسـت داوە و لێكۆڵینـەوەیان لەبارەوە كرد كە بە چ هۆیەك تووشی فەرامۆشی و بێچوونەوە بووە، بەڵام ئەو پیاوە نەیتوانی هۆی فەرامۆشیی خۆی باس بكات و تەنیا ئەوەی وت كە ڕابردووی خۆی بـە تـەواوەتی لـەبیر كـردووە. پیاوی فەرامۆشكار ئەوكاتەی سەردانی نەخۆشخانەی كرد، نزیك بە بیست و چوار كاتژمێر لەو كاتە تێدەپەڕی كە سەرۆكی كرێكاری فەرامۆشكار كە لێپرسراوی یەكێك لە دامەزراوە پیشەییەكان بوو، لە ڕێگای پێوەندییەكەوە كە "زائربروخ"ی دەناسی داوای لەو مامۆستایە كردبوو لەبەر ئەوەی ئەو كرێكارە فەرامۆشكارە كەسێكی پیشەیی شایستەیە و نەخۆشـیە دەروونییەكـەی بـۆ خـۆی و ئـەو دامـەزراوەی تێـدا كـار دەكـات وەك خەسـارێك دێتـە ئـەژمار، بـا مامۆسـتا لـە ڕوانگـەی مرۆڤدۆستییەوە دەرمان و نەشتەرگەریی بۆ بكات.

"زائربروخ" كەسێك نەبوو كە ڕاسپاردە قبووڵ بكات، بەڵام لەبەر ئـەوەی هەسـت و هاوسـۆزیی مرۆیی هەبوو بە دكتۆر "ویلفرید"ی یاریدەدەری خۆی ڕاگەیاند كە ئەگەر هات و نەخۆشێك بەم ناو و نیشانە كە تووشی فەرامۆشی بووە سەردانی نەخۆشخانەی كرد ئاگاداری بكەنەوە.

دكتۆر "ویلفرید"، "زائربروخ"ی لە سەردانی ئەو نەخۆشەی كە ناونیشانی دابوو ئاگادار كردەوە ئەویش پێی وت ئەو پیاوە بۆ نەشتەرگەریی مۆخ لە نەخۆشخانە وەربگـرن و پێویـستییەكانی ئـەو نەشتەرگەرییە ئامادە بكەن. دكتۆر ویلفرید وتی ئاخۆ دەكرێ ئەو كەسەی كە تووشـی فەرامۆشـی بووە بە نەشتەرگەریی مۆخ زین و یادگەی بكەوێتەوە كار؟ "زائربروخ" ڕایگەیاند مـن بـە شـێلان (مەساج)ی مۆخ فەرامۆشییەكەی چارەسەر دەكەم.

دکتۆر ویلفرید لەو باوەڕەدا نەبوو کە بکرێ لە ڕێگای شێلانی مۆخەوە فەرامۆشیی مرۆڤ چارەسەر بکرێت، بەڵام چونکە "زائربروخ" لە باروودۆخی ئاساییدا بوو یاریدەدەرەکی تێگەیشت کە مامۆستاکەی تووشی نەخۆشیی فەرامۆشی دەوریی نەبووە. هەر بۆیە بڕیاری دا نەخۆشەکە بۆ نەشتەرگەریی مۆخ ئامادە بکەن و بەتەما بوو لە کاتی نەشتەرگەریدا بە وردی ئاگای لە "زائربروخ" بێت و هەرکە هەستی بەوە بکات کە "زائربروخ" خەریکە هەڵە دەکات پێش بە درێژەی نەشتەرگەرییەکە بگرێت.

لە ڕۆژی دیاریکراودا، نەخۆشەکەیان هێنایە ناو ژووری نەشتەرگەری و (زائربروخ) پاش ئەنجام دانی کارە سەرەتاییەکان کەلە لاپەڕەکانی پێشوودا نووسراوە و دووپات کردنەوەیان پێویست ناکات، چووە ژووری نەشتەرگەرییەوە و دوای ئەوەی کە ئێسکی سەری هەڵکۆڵی مێشکی نەخۆش کە ڕەنگی سپیی مەیلە و گوڵ گوڵی بوو، دەرکەوت. "زائربروخ" وتی ئەگەر بێت و ماسوولکەکانی مێشک (ئەگەر بکرێ ناوی ماسوولکە لەسەر بەشە جیاجیاکانی مۆخ دابنێین) وەرزش و مەساج بدرێن، سستییان لەناو دەچێت و ئەکتیڤ دەبنەوە.

ئەو کەسانەی کەلە ژووری نەشتەرگەری بوون لەو باوەڕەدا بوون کە بەهێزکردنی خانەکانی مێشک لە دەرەوەی چوارچێوەی ڕشتەی کیمیا دەرمانی، واتە لە دەرەوەی کاریگەریی دەرمانەکان، کاری دەروونناسان و کۆمەڵناسانە و ئەوە ئەوانن کە دەتوانن بە تونێکاری لەسەر خانەکانی مێشک کاریگەری دابنێن و بیر و یادگە بگەڕێننەوە و پیاو و ژنە ڕەشبین یان نائومێد بکاتە کەسێکی جوانپەرست و هیوابەخش.

"زائربروخ" دەستی کرد بە مەساج و هەروەك وتمان ڕەنگی مێشکی نەخۆش سپیی مەیلە و گوڵ گوڵی بوو و هەرچەند زائربروخ زیاتر بە دوو قامك، شوێنی تایبەت بە یادگەی نەخۆشەکەی مەساج دەدا ڕەنگی مێشك زیاتر مەیلە و گوڵی تر دەبوو. "زائربروخ" کەلە جوولەی مێشك لەژێر دوو قامکی خۆیدا دەیتوانی لە ڕەوشی دڵ و لێدانی دەماری نەخۆش تێبگات و بۆ خاترجەم بوون پرسیاری کرد لێدانی دڵی چەندە؟

پێیان وت ٨٥ و پرسیاری زەختی خوێنی کرد و وەڵامیان دایەوە ١٥ و ١٢ و "زائربروخ" بڕیاری دا ئوکسیژنی پێ بگەیەنن. یاریدەدەری "زائربروخ" بۆ چرکەیەك چاوی لە قامکەکانی نەشتەرگەر هەڵنەدەگرت و هێندێ جار چاوی لە سیما و ڕوخساری دەکرد کە ئایا ڕوخساری ئەو پیاوە نیشانەیەك لە کەم هۆشی پێوە دیارە یان نا؟ بەڵام سیما و ڕوخساری نەشتەرگەر ئاسایی بوو و لە سیمایدا نە نیشانەی کەم هۆشی بەدی دەکرا و نە پەشۆکاوی و پەلەکردن، بەڵکوو بە

حەرەکەتی ئارام و بە دوو قامك، مێشکی نەخۆشەکەی مەساج دەدا و هەرچەند درێژەی بە مەساج کردنەکە دەدا، رەنگی مێشك لەو شوێنەی کە لەژێر قامکی پزیشکدا بوو رەنگاڵەتر دەبوو و پاشان سوور بۆوە و پاشان وەك رەنگی خورمای لێهات.

ویلفرید چەند جار ویستی داوا لە "زائربروخ" بکات کە دەست لە مەساج کردن هەڵبگرێت و برینکە بدوورێتەوە، بەڵام نەیوێرا قسە بکات. نەشتەرگەر بۆ جاری سێیەم دەستەوانەکانی گۆڕی و دیار بوو هێندە هۆشی لەسەرخۆ بوو کە نایهەوێت بەو دەستەوانەیەی کە بە میکرۆبی ژوورەکە (کە لەسەر برینکە نیشتووە) ئالوودە بێت و بەو چەشنە درێژە بە مەساج بدات. ئەو کەسانەی کەلە ژووری نەشتەرگەری بوون لە درێژبوونەوەی ماوەی مەساج ناڕەحەت بوون و ترسیان لێنیشت، بە چەشنێك کە ئوستا نیشانەی ناڕەحەتیی بە روخسارییانەوە بینی و گوتی: ئەگەر ئێمە توانیبامان دوای ئەوەی کە برینکەمان بەست، چەند رۆژی دیکە برینەکەی بکەینەوە و مەساجەکەی دووبارە بکەینەوە، من پێداگر نەبووم کە ئێستا هێندە ماوەی مەساج کردنەکە درێژ بکەمەوە، بەڵام ئێمە ناتوانین چەند رۆژی دیکە کەللەسەری ئەم پیاوە بکەینەوە، دەبێ هەر ئەمرۆ لەم کارەمان ئەنجامێك وەربگرین و برینەکە بە تەواوەتی بوەستین.

"زائربروخ" دوو جاری دیکە پەیجۆری لێدانی دڵ و دەماری نەخۆشەکە بوو و ویستی بزانێت ئایا نەخۆش بە ئاسانی دەتوانێ هەناسە بکێشێت یان نا، وەڵامیان دایەوە کە هەناسەدانی نەخۆش، ئاساییە. رەنگی مێشکی نەخۆش لە شوێنی مەساج کردنەکە بە تەواوەتی رەش هەڵگەڕابوو و "ویلفرید" پێی وانەبوو کە خانەکانی مێشکی مرۆڤی زیندوو وایان بەسەر بێت. سەرەنجام "زائربروخ" دەستی لە مەساج کردن هەڵگرت و ویلفرید چاوێکی لە کاتژمێرەکەی دەستی کرد و تێگەیشت کە ئوستا ماوەی سێ کاتژمێر بەبێ راوەستان سەرقاڵی مەساجی مێشکی نەخۆش بووە.

هەروەك وتمان لە رابردوودا رەسمی نەشتەرگەرە گەورەکان بەم چەشنە بوو کە پاش تەواو بوونی نەشتەرگەری بەستنی برینەکەیان بە یاریدەدەرەکانی خۆیان دەسپارد و لە ژووری نەشتەرگەری دەهاتنە دەرەوە، بەڵام ئەو رۆژە، وەکوو رۆژانی پێشووتر، خودی "زائربروخ" برینکەی بەست و ئێسکی کەللەسەر کە هەڵدابۆوە، بە هێواشی دایهێنایەوە و سەر مۆخ و بە وردی ئاگای لێبوو کە ئێسکەکە لەو شوێنەی کە جیا بۆتەوە جێگا بگرێت، دواتر ئەو دەرمانانەی کە دەبوا لەسەر برینەکە دابنرێت لەسەر برینەکەی دانا، ئەو دەرمانانەی کە ئێستاش نەشتەرگەرانی رۆژئاوا بە لاسایی کردنەوەی پزیشکەکانی پێشوو (ئونگنە) واتە بە مەڵهەم دەیانناساند، سەری نەخۆشەکەی بەست و

کاتێك نەخۆشیان لە ژووری نەشتەرگەرییەوە دەبردەوە بۆ ژووری حەسانەوە، "زانربروخ" وتـی ئـەم پیاوە، سێ رۆژی دیکە بیر و زەینی دەکەوێتەوە کار.

ئەو سێ رۆژە لە نەخۆشخانە "زانربروخ" چەند نەشتەرگەریی دیکەی ئەنجام دا کەلە هەموویاندا کردار و رەفتاری سەرکەوتوو و ئاسایی بوو، بە چەشنێك کە دکتۆر ویلفرید هاتە سەر ئەو بـاوەڕەی کە دیاردەی کەم هۆشیی نەشتەرگەری بلیمەت، نەخرشییەکی کتوپڕ و زووتێپەڕ بووە. رۆژی سێیەم دوای نەشتەرگەریی مێشکی ئەو پیاوەی کە تووشی فەرامۆشی ببوو، چاك بۆوە و زەینی کەوتـەوە کار. هەتا ئەو رۆژە دکتۆر ویلفرید باوەڕی نەدەکرد کـە مەسـاج کردنـی "زانربـروخ" کاریگـەریی هەبێت و نەخۆشیی فەرامۆشیی ئەو کابرایە چارەسەر بکرێت. چونکە شێوازی دەرمانی زانربروخ لە روانگەی ویلفریدەوە بە داهێنانێکی نالۆژیکی دەهاتە ئەژمار و پێی وابوو ئەگەر بێت و مەترسـیی نەبێت، کارێکی بێ سوودە.

بەڵام رۆژی سێیەم پاش ئەوەی کە نـەخۆش یادگـەی کەوتـەوە کـار و رابـردووی هاتـەوە بـیر و وەڵامی پرسیارەکانی ویلفریدی لەبارەی خۆیەوە بە دروستی دایـەوە، ئـەو پزیـشکە بـە تـەواوەتی قەناعـەتی بـەوە هێنـا کـە هێـشتا "زانربـروخ" کەسـێکی بلیمەتـە و دەتـوانێ بـە کـارە سەرسووڕهێنەرەکانی خۆی لـە بـواری نەشـتەرگەریدا، سـەرنجی کۆمەڵـەی پزیـشکان رابکێـشێ. ماوەیەك پێش ئەو رووداوەی کە باسی کرا "زانربروخ" رەزامەندیی نواندبوو کە رۆژێك وێنەگران لە ژووری نەشتەرگەری ئامادە بن و لە یەکێك لە کارە نەشتەرگەرییەکانی وێنە هەڵبگرن.

بـەڵام دوای ئـەوەی کـە بـۆ ماوەیـەك نیـشانەی بیرکـورتی و فەرامۆشـی تێـدا دەرکـەوت، یاریدەدەرەکەی بە باشی نەزانی وێنەگرەکان ئامادە بن، بەڵام دوای ئەو سـێ رۆژەی کـە رەفتـار و کـارە نەشـتەرگەرییەکانی "زانربـروخ" ئاسـایی بـوون، ئـیتر دکتـۆر ویلفریـد خاترجـەم بـوو و وێنەگرەکانی ئاگادار کردەوە کە رۆژی چوارەم بۆ وێنە هەڵگرتن لە نەشـتەرگەرییەکی "زانربـروخ" لە نەخۆشخانە ئامادە بن.

لەو رۆژەدا، دەبوا "زانربروخ" نەشتەرگەری بۆ ژنێك بکات کە تووشی نەخۆشیی "همی پلـژی" ببوو، دەبێ ئەوەش بڵێم کە پێش لە "زانربروخ" کەس ئامادە نەبووە لە رێگـای نەشـتەرگەرییەوە نەخۆشیی "همی پلژی" چارەسەر بکات. نەخۆشیی "همی پلژی" ئیفلیج و لەکارکەوتنی لایەك لە جەستەیە کە بەهۆی سستی و تەمەڵیی نیوەیەك لە خانەکانی مێشك، تووشی مرۆڤ دەبێت.

ئەگەر خانەکانی نیوەی لای راسـتی مێشك تووشی تەمەڵی و سستی ببێت، نیـوەی لای چـەپی لەش ئیفلیج دەبێت و نەخۆش ناتوانێ دەست و لاقی بجووڵێنێ، ئەگەر بێت و خانەکانی نیوەی لای

چەپی مێشك، تەمەڵ و سست بووبێت، نیوەی لای راستی لەش ئیفلیج دەبێت و ئاستی ئیفلیج بوون، لەباری کەمی یان زۆرییەوە پێوەندییان بە ئاستی تەمەڵی و سستیی خانەکانی مێشکەوە هەیە.

نەخۆشیی "همی پلژی" بێجگەلە تەمەڵیی نیوەیەك لە خانەکانی مێشك بەهۆیەکی دیکەشەوە سەرهەڵدەدات کە ئەویش پەیدابوونی "لزیۆن"ێکە لەناو نیوەیەك لە مێشك، "لزیۆن" دەستەواژەیەکی پزیشکیی نێودەوڵەتییە کەلە هەموو زمانەکاندا هەر بەم ناوە ناسراوە و نەتەوە ئینگلیز زمانەکانیش هەر بەو ناوە وەریان گرتووە، بەڵام بە زاراوەی خۆیان بە "لژیۆن" دەریدەبڕن.

لزیۆن برینێکە وەکوو ئەو برینانەی کە بەهۆی بڕین یان پچڕانی دەمار، خوێنبەربوونی نیە و وەکوو برینە پەنەمی یان هەڵمساوەکان ئاوسانی نیە، بەڵام لە هەر شوێنێك کە سەرهەڵبدات، رەنگی بەشێك لە ماسولکەکە دەگۆڕێ و دەبێتە هۆی خوران یان سووتانەوە و ژانی هەیە.

روودانی "لزیۆن" لە ئەندامە لاوەکییەکانی لەش وەکوو دەست و لاق، یان پێستی زگ یان پێستی پشت، بەو مەرجەی کە سەرەتای شێرپەنجە نەبێت بێ مەترسییە، هەرچەند مرۆڤ ناڕەحەت دەکات، بەڵام بەرەنجامی خراپی نیە. بەڵام ئەگەر بێت و لە ئەندامە سەرەکییەکانی لەش وەکوو مێشك، دڵ، جەرگ، سیپەلاك و گورچیلەدا روو بدات، ئەگەر بێت و لە دەرمان و چارەسەر کردنیدا کەمتەرخەمی بکرێت، لەوانەیە بەرەنجامی خاڕپ و پڕ مەترسیی لێبکەوێتەوە. ئەگەر "لزیۆن" (ئیفلیجی) لە نیوەیەك لە مێشکدا روو بدات، لەوانەیە نیوەیەك لە جەستە ئیفلیج و پەك بخات کە نابێ ئەم نەخۆشیە لەگەڵ جەڵتەی مێشك کە بەهۆی بڕینی دەمارێك لە مێشك و خوێنبەربوون روو دەدات (کە هێندێ جار دەبێتە هۆی ئیفلیج بوونی نیوە یان تەواوی لەش) بە هەڵە لە قەڵەم بدرێت.

زائربروخ وتبووی، ئەگەر نەخۆشیی "همی پلژی"ی ئەو ژنە بەهۆی ئیفلیجیی مێشکەوە بێت ناتوانم دەرمانی بکەم، بەڵام ئەگەر بەهۆی تەمەڵی و سستیی خانەکانی مێشکەوە بێت چارەسەری دەکەم. هەر لەو سەروبەندەدا "ئەشتۆمب" کرێکاری کانگا پیشەییەکە کە وتمان ئەندامی حیزبی کۆمۆنیست بوو کەلە سەردەمی هیتلەردا بۆ ماوەیەك لە زیندان بووە و پاش شکستی ئەڵمانیای نازی وەکوو قارەمانێکی سیاسی لە زیندان ئازاد کرا و کاتی خۆی لە زیندان بەهۆی "سپتیسمی" یان بە واتایەکی دیکە پیسیی خوێن تووشی نەخۆشیی ریخۆڵە کوێرە ببوو، مرد. دەشزانین کە مردنی ناوبراو بەهۆی نەشتەرگەریی هەڵە و لەخۆڕای "زائربروخ"ەوە بوو کە لەباتی لابردنی برینی ریخۆڵە کوێرە هەموو ریخۆڵە بچووکی ئەو پیاوەی بڕی و فڕێی دا و سەر و بنی ریخۆڵەی بەست، بە

چەشنێك لە نێوان بەشی سەر و خوارەوەی دەزگای هەرسەکیدا هیچ پێوەندییەك نەمابوو هەتا ئەو شتەی کە دەیخوات هەرسی بکا. لە ئەنجامدا بەبێ ئەوەی کەسێك لە هۆیەکەی بزانێ رۆژ لە دوای رۆژ باری تەندروستیی خراپتر بوو و سەرەنجام بەهۆی چڵك و هەوکردنی گشتیی خوێن گیانی لەدەست دا، بەڵام مەرگەکەی بە ئاسایی لە قەڵەم درا و کەسیش سەرنجی پێنەدا.

پێش ئەوەی کە وێنەگرەکان بێنە ژووری نەشتەرگەرییەوە پێیان وترا کەلە ژووری نەشتەرگەری قسە نەکەن و لەبارەی کاری پزیشك و ئەو کەسانەی کە لەگەڵی کار دەکەن پرسیار نەکەن و ئەوەش بزانن کە ئەگەر بێت و قسە بکەن بەو و هۆشی نەشتەرگەر و هاوکارەکانی لەلایان نامێنێ و گیانی ئەو کەسەی کە لەژێر نەشتەرگەری دایە دەکەوێتە مەترسییەوە و جیالەوەش دەبنە هۆی تووڕەبوونی "زائربروخ".

ئەو خانمەی کە تووشی نەخۆشیی "هەمی پلژی" هاتبوو لای راستی جەستەی ئیفلیج ببوو و دەست و لاقی راستی نەدەجوولا، هەربۆیە زائربروخ لای راستی "نوخاع" (مۆخی برپڕە)ی بۆ نەشتەرگەری هەڵکۆڵی. شێوازی نەشتەرگەریی نوستا هەمان ئەو شێوازە بوو کە چوار رۆژ لەمەوپێش بۆ کابرایەك کە تووشی بیرکورتی هاتبوو ئەنجامی دا، بەو جیاوازییەوە کە لەو رۆژەدا تەنیا ناوەندی زەین و هۆشی مەساج دەدا، بەڵام بۆ ئەو خانمە تەواوی لای چەپی مۆخی مەساج دەدا. چەند رۆژ لەوەو پێش نەشتەرگەری بلیمەت بە دوو قامك، ناوەندی بیرگەی کرێکاری کانگایەکی خەڵوزە بەردینەی مەساج دەدا، بەڵام ئەو رۆژە بە هەر پێنج قامکەکەی تەواو لای چەپی مۆخی ئەو ژنەی مەساج دەدا.

دکتۆر ویلفرید کە چاوی لەدەست و کارکردنی "زائربروخ" هەڵنەدەگرت، تێگەیشت کە نوستا پێچەوانەی چەند رۆژ لەمەوبەر کە بە ئارامی مۆخی کرێکاری کانگا خەڵوزە بەردینەکەی دەماڵی، بەڵام بۆ مەساجدانی مۆخی ئەو ژنە زەختێکی زۆری بۆ پەنجەکانی دەهێنا. یاریدەدەری "زائربروخ" تێگەیشت کە زەخت و گوشار هێنان لەلایەن نوستادەوە، بۆ کەوتنەوە کاری دەماری نەخۆش کاریگەرە.

لە جەستەی مرۆڤدا دوو جۆر دەمار هەیە کە ناوەندی هەردووکیان مێشکە، یەکیان دەماری بزوێنەرە کە جەستە دەخاتە جوولە و ئەوی دیکەش دەماری هەستیارە کە هەر پێنج هەست و هەستەکانی دیکەمان پێ دەگەیەنێ، لەو نەخۆشییە ئیفلیجییانەدا کە بەهۆی "همی پلژی"، یان جەڵتەی مێشك روو دەدەن، دەماری بزوێنەر لەکار دەکەوێت و دەمارە هەستیارەکان درێژە بەکار دەدەن. چەند رۆژ پێش کە زائربروخ سەرقاڵی مەساج دانی مۆخی کرێکارێك بوو، نە دەماری

بزوێنەری لەکار کەوتبوو و نە دەماری هەستیاری و تەنیا خانەکانی ناوەندی زەین و بیرگەی تووشی سستی ببوون. بەڵام ئیفلیجیی "همی پلژی" دەماری بزوێنەری ئەو ژنەی لە نیوەیەك لە جەستەی لەکار خستبوو، هەر بۆیە "زائربروخ" زەختی بۆ سەر مۆخی ئەو ژنە نەخۆشە دەهێنا کە دەمارەکانی بخاتەوە گەڕ.

دکتۆر ویلفرید خۆی نەشتەرگەر بوو و بەباشی شارەزایی لە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ هەبوو و دەیزانی رەوش و ئەرکی دەمار لە لەشدا چۆنە. لە دەورانی خوێندکاریدا، خوێندنی پزیشك و نەشتەرگەرەکان هاوشێوەن، بەڵام پاش ئەوەی کە پزیشك و نەشتەرگەر چوونە قۆناغی لقە پسپۆرییەکانەوە و دوای ئەوەی کە لەباری پیشەوە لێك جیا بوونەوە، نەشتەرگەرەکان لەبارەی "ئاناتۆمی"، واتە ناسینی وردی ئەندامانی لەشی مرۆڤ کەلە زمانی ئاساییدا بە "شیتەڵ کردنەوە" ناسراوە، شارەزاییان زیاتر لە پزیشکەکان دەبێت و هۆیەکەشی ئەوەیە کە نەشتەرگەر، هەر رۆژە و بەردەوام لەگەڵ وردەکارییەکانی لەشی مرۆڤ بەرەوڕوویە.

ویلفرید کە بۆ خۆی نەشتەرگەر بوو و بەباشی جەستەی مرۆڤە دەناسی، دەیزانی کە سی یەك جووت دەمار کە لەناو مۆخی بڕبڕەی پشتەوە جیا دەبێتەوە، هەرکامەیان لقێکی سەرەکیی دەماری جەستەی مرۆڤن کەلە هەرکام لەو لقە سەرەکییانەش لقگەلێکی دیکە جیا دەبێتەوە و ئەو سی و یەك جووتە دەمارە، دەماری بزوێنەر و هەستیارن و ویلفرید پرسیاری لەخۆی دەکرد کە ئایا مەساج دانی لای چەپی مێشکی ئەو ژنە نەخۆشە، لەلایەن "زائربروخ"ەوە دەتوانێ کاریگەریی لەسەر دەماری بزوێنەری ئەو ژنە کە بە مێشکی "حەرام"ەوە پێوەند دراوە، هەبێت؟ ئەوەی کە ئەوی هان دەدا ئەو پرسیارە لەخۆی بکات ئەوە بوو کە هەتا ئەوکاتە، هیچکەس هەوڵی ئەوەی نەدابوو نەخۆشیی "همی پلژی" لە رێگای مەساج دانی مێشکەوە دەرمان بکات و پزیشکانی یەکیەتیی سوڤیەتیش کە دوای شەڕی دووەمی جیهانی چەند شێوازێکی داهێنەرانە و دەگمەنیان بۆ چارەسەریی هەندێ لە نەخۆشییەکان گرتەبەر، بەڵام نەخۆشیی همی پلژی و جەڵتەی مێشکیان بەو شێوەیە دەرمان نەکرد، بەڵکوو بۆ دەرمانی تووشبوان بە "همی پلژی" رێکاری "شیمی توراپ"یان بەکار هێنا و بە پێدانی دەوا و ماوەیەك دەرمان، تووشبوان بە جەڵتەی مێشك کە نیوەیەك لە جەستەیان ئیفلیج دەبوو، چارەسەر دەکران و لەمەڕ ئەو نەخۆشانەی کە بەهۆی خوێنبەربوونی مێشك بە یەکجاری ئیفلیج دەبوون، هەتا ئەو رۆژە پزیشکانی یەکیەتیی سۆڤیەت نەیانتوانیبوو تەنانەت یەك کەس لەو نەخۆشانەش بە جۆرێك دەرمان بکەن، بە چەشنێك کە بتوانن وەکوو کەسانی لەشساغ، دەست و لاقیان بەکار بێنن.

"زانربروخ" وەك هەمیشە وەها سەرقاڵی کار بوو بە چەشنێك هیچ سەرنجێکی بەو کەسانەی کەلە ژوورەکە بوون نەدەدا. ئەو تەنیا هاوکارانی خۆی کەلە کاتی کارکردندا فەرمانی پێدەکردن دەبینی، وەکوو بەرپرسی بێهۆشی (بنج) و ئەو کەسەی کە ئاگای لە لێدانی دڵ، دەمار و هەناسەکێشان و ئاستی زەختی خوێنی نەخۆش بوو و هەروەها ئەو ژنەی کە دەبوا کەلوپەلی نەشتەرگەری بە دەستییەوە بدات و تەنانەت یاریدەدەرەکانیشی نەدەبینی و ئاگای لێنەبوو کە چەند وێنەگر لە ژوورەکەن و لە نەخۆشەکە و شوێنی نەشتەرگەری و خودی خۆی فیلم هەڵدەگرن.

ویلفرید بە وێنەگرانی وتبوو کە نابێ قسان بکەن و ئەوانیش کپ و بێدەنگ بوون، بەڵام دکتۆر "ویلفرید" پێشبینی نەدەکرد کە لەوانەیە یەك لە وێنەگرەکان بکۆخێ یان بپژمێ و لەناکاو یەکیان کۆخەیەکی کرد. "زانربروخ" سەری لەسەر مێشکی نەخۆشەکە بەرز کردەوە و چاوێکی لە وێنەگرەکان کرد و پرسیاری کرد ئەمانە کێن؟

ویلفرید وتی ئەمانە بۆ وێنەگرتنی کاری نەشتەرگەریی ئێوە هاتوون و بۆ خۆتان راتان لەسەر بووە و راتانگەیاند کە بێن و فیلم هەڵبگرن. "زانربروخ" بە توورەییەوە وتی من کەی وتوومە کۆمەڵێك کەس بێنە ئێرە و ببنە زاوڵی کارەکەمان. ویلفرید وەڵامی دایەوە بەبێ فەرمانی ئێوە بانگهێشتی ئەم بەرێزانەمان نەدەکرد کە بێنە ئێرە و ئێوە بوتان چووە کە پێشتر ئیزنی ئەم بریارەتان داوە. "زانربروخ" فەرمانی دا لێرە بیانکەنە دەرەوە و ویلفرید ئیشارەتی بە وێنەگرەکان کرد لە ژوورەکە وەدەر کەون و ئەوانیش بە نابەدڵی پێناخۆشی لەبەر ئەوەی کە "زانربروخ" قەدری زەحمەت و ماندووبوونی ئەوان نازانێ لە ژوورەکە وەدەرکەوتن و کاتێك دوایین وێنەگر خەریك بوو لە ژوورەکە دەرۆیشتە دەر، "زانربروخ" دەفری دەوا و دەرمان و پیسایی نەشتەرگەریەکەی هەڵگرت و بۆی پەرت کرد و وتی مەگەر ئێرە تواشاخانەیە کە بۆ وێنەگرتن هاتوون. سەراپای لەشی کابرای وێنەگر ئالوودە بوو، بەڵام بەبێ ئەوەی ورتەیەکی لێوە بێت لە ژوورەکە وەدەرکەوت.

بەهۆی سەرنجی "زانربروخ" بە وێنەگرەکان، بۆ چەند کاتێك دەستی لە مەساج دان هەڵگرت و هەمیسان دەستی کردەوە بە مەساج کردنی مێشکی نەخۆش و بەبێ ئەوەی کە هەست بەوە بکات کات تێدەپەرێت. ئەو رۆژە دەبوا "زانربروخ" نەشتەرگەری بۆ نەخۆشێکی دیکەش بکات کە تووشی برینی شێرپەنجەی گەدە هاتبوو، بەڵام ماڵشتی مێشکی نەخۆشەکە ئەوەندەی خایاند کە پاش کۆتایی کار و بەستنەوەی شوێنی برین، ئیدی کاتێك بۆ نەشتەرەگەریی دووەم نەما و "زانربروخ" لە نەخۆشخانە وەدەرکەوت و بە ترۆمبێلی دەوڵەتی کە بۆیان تەرخان کردبوو، گەرایەوە ماڵ.

لە ساڵی یەکەمی دوای شەڕی دووەمی جیهانی خەڵکی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات و بەرلینی ڕۆژهەڵات بە دژواری دەژیان، بەڵام "زانربروخ" لەوپەڕی خۆش بژیویدا بوو و لەناو ویلایەك کە پێیان دابوو نیشتەجێ بوو و لە بەرلینی ڕۆژهەڵات یەك لەو دەگمەن کەسانە بوو کە سەربەستانە کتێب و گۆڤارە زانستییەکانی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا و وڵاتانی ڕۆژئاوا و ئەمریکای بەدەست دەگەیشت و هەروەها لە بەرلینی ڕۆژهەڵات هیچکەس بە ئەندازەی "زانربروخ" مووچەی وەرنەدەگرت، چونکە هەر مانگەی سێ هەزار "مارك"ی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتی وەك مووچە وەردەگرت.

بەهەرحاڵ ئەو ڕۆژە دکتۆر ویلفرید پەرت کردنی دەفری دەوا و دەرمانی پیسی نەشتەرگەریی بە حیسابی نەمانی هۆش و فەرامۆشیی "زانربروخ" دانەنا و وەك تووڕە بوونی لە قەڵەمی دا و لە ناخەوە ئەو مافەی بە نەشتەرگەری بلیمەت دا کە بە ئامادەبوونی وێنەگران لە ژووری نەشتەرگەری تووڕە بێت. دەگمەن هەڵکەوتووە نەشتەرگەرانی خاوەن ئەزموون کە سەرقاڵی نەشتەرگەری بوون، خاوەنی ڕەفتار و هەڵسوکەوتی تایبەت نەبووبێتن و ئەو کەسانەی کە کاریان لەگەڵ دەکەن، دەزانن کە ئەو ڕەفتارە ڕەفتاری سەرەکی و ناخی خۆیان نیە، بەڵکوو خوویەکە یەکەم بەهۆی دووپات بوونەوەی کار و ئەرکی ڕۆژانە پەیدا دەبێت و بەرەبەرە دەبێتە بەشێك لە ڕەفتار و ئەخلاقیان.



ڕۆژی دواتر، لە ژووری نەشتەرگەری پیاوێکیان بۆ نەشتەرگەری ئامادە کرد کە دەبوا تومۆرێکی شێرپەنجە لە گەدەی بهێننە دەر. نەخۆشیی ئەو پیاوە زۆری تەشەنە کردبوو و پزیشکانی نەخۆشخانە دەیانزانی دوای ئەوەی کە تومۆری شێرپەنجە لە گەدەی نەخۆش بهێنرێتە دەر، ئەگەر سەرهەڵدانی تومۆرێکی دیکەی شێرپەنجە، لە ئەندامێك لە جەستەی نەخۆش لە گۆڕێ دایە، بەڵام ئەو هیوایەشیان هەبوو کەلە ڕێگای "شیمۆتوراپی"، یانی بەکارهێنانی دەوا و دەرمان، پێش بە سەرهەڵدانی تومۆری شێپەنجەی تازە لە لەشی ئەو نەخۆشەدا بگرن و بۆ ساڵانێك وەدوای بخەن.

لەو کاتەدا هێشتا زانستی پزیشکی کە چ کاتێك یەکەم خانەی شێرپەنجە تێکەڵ بە خوێن دەبێت؟ بەڵام دەیانزانی پاش ئەوەی کە نەخۆشیی شێرپەنجە تەشەنە بکات، لە هەر کاتژمێرێکدا بە میلیۆنان خانەی شێرپەنجە تێکەڵ بە خوێن دەبێت و گەڕانی خوێن دەیگەیەنێتە تەواو ئەندامانی لەشی مرۆڤ و بەشێك لە جەستە نامێنێت کەلە ڕێگای گەڕیانی خوێنەوە خانەی شێرپەنجەی پێنەگات، هەر بۆیە شوێنێك لە لەش نامێنێ کەلە نەخۆشیی شێپەنجە بەری بێت.

دەزگا و بەشە بەرگرییەکانی لەش لەناو خوێن، هەتا ئەو ئاستەی بتوانن خانەکانی شێرپەنجە

ئەفەوتێنن، بەڵام ئەگەر نەتوانن هەموویان لەناو بەرن، بەشێکیان لە لەشدا دەمێننەوە و گەشە دەکەن. تەنیا ڕەوتی گەڕانی خوێن نیە کە دەبێتە هۆی گەڕانی خانە شێرپەنجەییەکان و دەیانگەیەنێتە تەواو ئەندامانی لەش، بەڵکوو گەڕیانی "لنف" یان "لیمف" (جەریانی خڵت)یش خانە شێرپەنجەییەکان دەگەیەنێتە بەشە جیاجیاکانی جەستە.

کاتێك بۆ وێنە تومۆرێکی شێرپەنجە لە گەدە دەربهێنن، ئیتر خانەی تازەی شێرپەنجەیی لەو تومۆرەوە نایەتە ناو گەڕیانی خوێن یان "لنف"ەوە، بەڵکوو ئەو خانانەی کە پێش لە لابردنی تومۆری شێرپەنجە لەناو خوێن یان "لیمف"دا بوون دەمێننەوە و گەشە دەکەن. دەبێ بۆ لەناوبردنی ئەو خانە شێرپەنجەیيانە دەرمانە کیمیاییەکان بەکار بهێنرێ هەتا زێدە نەبن و تومۆر یان تومۆرگەلی دیکە بەدی نەهێنن، چونکە ئەو تومۆرانە لە پێکهاتە و بەشە تەندروستەکانی لەش کەڵك وەردەگرن و خانە ساغەکانی لەش دەفەوتێنن.

## لۆمەی پزیشکانی ئەڵمانی لەلایەن "زائربروخ"ەوە

"زائربروخ" سەرەڕای ئەوەی لە نەشتەرگەریدا بلیمەت و هەڵکەوتە بوو، ئەنجامدانی نەشتەرگەریی بە داماوی و بێتوانایی زانستی پزیشکی دادەنا و دەیگوت ئەنجامدانی نەشتەرگەری، دانپێدانانی و لە راستیدا قبووڵ کردنی کەموکوڕیی زانستی پزیشکیە لەلایەن پزیشکانەوە کە نەیانتوانیوە هەموو ئەو وردەکاریی و رێوشوێنە پزیشکییانەی کە ئەندامانی لەشی مرۆڤ پێکدێنن، کەشف بکەن.

هەموو پزیشکانی ئەڵمانیا، بەرلە شەڕی دووەمی جیهانی لە شاتاڵ و تەشەرەکانی "زائربروخ" دڵیان ئێشابوو، چونکە ئەو نەشتەرگەرە مەزنە، بەبێ ئەوەی کە را و بۆچوونەکانی خۆی ناراستەوخۆ دەربڕی، بە پزیشکانی ئەڵمانیی دەگوت، هەرکەس کە بەهۆی نەخۆشییەوە دەمرێت، دەبێتە قوربانیی نەزانینی ئێوە و بەرپرسیاری هەر تومۆرێکی چارەنەسەر کراو کەلە جەستەی نەخۆشێکدا سەرهەڵدەدات ئێوەن.

دەیگوت ئەگەر مەرگی نەخۆشەکان لە کۆتایی قۆناغێك لە تەمەن بێ ئەملا و ئەولا بێت، هیچکەس نابێ بەرلەو نەخۆشییە و تومۆرە چارەسەر نەکراوەکان بمرێت، چونکە ئەستەمە زانستی پزیشکی لە بەرامبەر چارەسەر و دەرمانی هەموو نەخۆشی، گرفت، برین و تومۆرەکانی جەستەدا بێتوانا بێت بەڵام ئێوە، بەهۆی سستی و تەمەڵی و تەپەڵۆسی و کەڵك وەرگرتن لە خۆشییەکانی ژیان ناتانپەرژێ هەموو رێوشوێنەکانی زانستی پزیشکی بزانن و بەکاری بێنن.

"زائربروخ" دەیگوت، منی نەشتەرگەر دەبێ تاوانی نەزانینی ئێوەش بدەم، چونکە پچڕانی ئەندامێك و دەرهێنانی تومۆرێك کە ئێوە فەرمانم پێدەکەن، بەلای منەوە دەرمان نیە، بەڵکوو سەقەت کردنی نەخۆشە. "زائربروخ" لە قسەکردندا کەسێکی پەندوەرگر نەبوو و تەنیا قەناعەتی بەوە نەدەهێنا کە تانە و تەشەر لە پزیشکانی ئەڵمانی بدات کە بۆچی بۆ دەرمانی نەخۆشیە ناعیلاجەکان هەوڵ نادەن پەی بە رێوشوێنە پزیشکییەکان بەرن، هەمیشە دەبووە سەرباشقەی کەشفی رێکار و شێوازە تازەکان بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکان لە بوارە پسپۆڕیەکی خۆیدا، واتە نەشتەرگەری و پێشتر داهێنانەکانیمان بۆ دەرمانی نەخۆشییەکان باس کرد، بەڵام ئەم نەشتەرگەرە

مەزنە کە پزیشکانی ئەڵمانیای بە نەزان و تەمەڵ لە قەڵەم دەدا و دەیگوت ئەوان بە بڕیاردانی نەشتەرگەری، خەڵك سەقەت دەکەن نەك دەرمان. ڕۆژێك لە نەخۆشخانەی بەرلینی ڕۆژهەڵات تووشی کارێك بوو کە هەموو ئەو کەسانەی لە ژووری نەشتەرگەری بوون هەتا ئاستی شێتیی حەپەساند.

لەو ڕۆژەدا بەرلەوەی کە "زائربروخ" دەست بداتە نەشتەرگەری هیچ نیشانەیەکی تێدا بەدی نەکرا کە دەربڕی ئەمانی هۆش و زەین بێت. "زائربروخ" دوای گەیشتنی بە نەخۆشخانە بە وردی دەست و پلی بە ئاوی شیتین و سابوون شۆرد، هەرچەند "زائربروخ" وەکوو پزیشکانی پێشوو بۆ ماوەی پازدە خولەك دەستەکانی بە ئاو و سابوون نەدەشۆرد، بەڵام دەست شۆردنی ئەو پیاوە هیچکات کەمتر لە پێنج خولەکی نەدەخایاند و لە بەرکاهێنانی سابووندا زێدەڕۆیی دەکرد، چونکە دەیزانی سابوون دژی میکرۆبەکانە و ئەگەر ئێمە توانیبامان گەدە، ئاوزگ، سپەلاك و بەشە گرنگەکانی دیکەی جەستە بە ئاو و سابوون بشۆین، نەتەنیا نەخۆش نەدەکەوتین، بەڵکوو ئاستی نێونجیی تەمەنی مرۆڤ لە سەد و پەنجا ساڵ تێدەپەڕی.

"زائربروخ" کە جلوبەرگی نەشتەرگەریی لەبەر کردبوو، دوای شۆردنی دەستەکانی، دەستەوانەی نەشتەرگەری کە ژنە پەرەستارێك بە پونیسێك پێی دا، لەدەستی کرد و دواتر دەمامکی تایبەت کە پێش بە هەناسەی پزیشك ڕوو بە برین دەگرێت، لەسەر ڕوخساری نەشتەرگەر بەست و پاشان "زائربروخ" چووە ژووری نەشتەرگەرییەوە.

لەوێ هەرکەسە و لە شوێنی خۆی بوو و دوای ئەوەی کە "زائربروخ" هاتە ناو ژوورەکەوە، چەند خولەکێك لە بێهۆشیی پیاوێك تێدەپەڕی کە دەبوا تومۆرێکی شێرپەنجە لە گەدەی بهێننە دەر. ماوەیەك دوای هاتنە ژووری "زائربروخ" شوێنی هەڵدڕینی برینەکەیان دیاری کرد و مادەی دژە میکرۆب (بێتادین)یان بەسەریدا ماڵی و "زائربروخ" ڕاپۆرتی بەرپرسی بێهۆشی و پێوانی لێدانی دڵ و دەمار و چۆنیەتیی هەناسەدانی نەخۆشی وەرگرت و کێردی نەشتەرگەریی بەدەستەوە گرت. یاریدەدەرانی "زائربروخ" دەیازانی کە ناوبراو لە خێرایی ئەنجامدانی نەشتەرگەریدا بە دەستوبردە، چونکە ئەو نەشتەرگەرە بلیمەتە پەروەردە کراوی ئەو مامۆستایانە بوو کە بەرلە کەشفی دەرمانە بێهۆشییەکان، کێردی نەشتەرگەرییان بەدەستەوە گرتبوو، لەو سەردەمەدا نەشتەرگەر دەبوا هەتا ئەو ڕادەیەی کە توانایی مرۆیی ئیزن دەدات خێرایی کارکردنی هەبێت.

چونکە لەو سەردەمەدا ئەو نەخۆشەی کە دەبوا نەشتەرگەریی بۆ بکرێت بێهۆش نەدەکرا، هەر بۆیە ئەگەر چرکەیەك لە درێژکردنەوەی کاتی نەشتەرگەری بە هەمان ڕادەش ماوەی تاقەت هێنان

ئەشکەنجە و ئازار لەلایەن نەخۆشەوە کەمتر دەبێوە. "زائربروخ" بە خێرایی زگی نەخۆشەکەی هەڵدڕی، بە چەشنێك لە کاری خۆیدا وەستا بوو کەلە یەکەم چرکەکاندا دوای هەڵدڕینی "پریتوان"، "سفاق" (پەردەی چەقاڵتە) پەردەیەکی تەنك و دووتوێی ناوزگە کە هەناو و هەموو ئەندامەکانی دادەپۆشێ و دواتر گەدە و شوێنی تومۆرەکە دەرکەوت. پەردەی چەقاڵتە، کیسەیەکی تەنکە کە هەموو کۆ و ئەندامی ناوزگی تێدایە (بەدەر لە جەستەکانی سینگ) ئەو کیسەیە تاقە شوێنی جەستەی مرۆڤە کە میکرۆبی تێدا نیە و دکتۆر "ئالکسی کارل"ی فەرەنسی دەیگوت ناو "پەردەی چەقاڵتە" وەکوو کەشی نێوان ئەستێرەکانە کە تێیدا سەرمای" ۲۷۳ پلەی ژێر سیفر بەپێی گەرما پێوی پلەی سەدی" زاڵە، پاك و خاوێنە). "و. فارسی".

دوو یاریدەدەری "زائربروخ" کە چاویان بە تومۆری شێرپەنجە کەوت، دەیانزانی بینینەوەی تومۆری شێرپەنجە لەناو گەدەی نەخۆش لەلایەن نەشتەرگەرەوە لە یەکەم زەربەکانی کێرددا، کاری کەسێکی سەرەتایی نیە و نەشتەرگەرانی دیکە پاش هەڵدڕینی گەدە، بۆ ماوەیەك دەگەڕان و ورد دەبوونەوە هەتا تومۆرەکە ببیننەوە.

بەڵام "زائربروخ" پاش هەڵدڕینی "پەردەی چەقاڵتە"، گەدەی لە شوێنێکەوە کردەوە کە تومۆرەکەی تێدا بوو، بەڵام هیچ سەرنجێکی بە تومۆرەکە نەدا و کێردەکەی بە هەمان خێرایی بۆ لای سەرەوە و شوێنی سینگی نەخۆش رۆیی، یاریدەدەرانی وەستا، لە سەرنج دانی "زائربروخ" بۆ لای سینگی نەخۆش سەریان سووڕ ما، بەڵام هیچ متەقیان لێوە نەهات و کێردی دەستی "زائربروخ" شوێنێکی هەڵدڕی کە یاریدەدەرەکانی نەیاندەتوانی ببینن، لەبەر ئەوەی لەژێرەوەی پەراسووەکانی سەرەوەی قەفەزەی سینگدا بوو یاریدەدەرەکان بەتەواوەتی حەپەسا بوون، چونکە نەیاندەزانی وەستا چ کارێکی بەو شوێنە داوە و دەرهێنانی تومۆری شێرپەنجە چ پێوەندییەکی بە قەفەزەی سینگەوە هەیە.

دوای ماوەیەك، هەموو ئەوانەی کە دەیانتوانی شوێنی هەڵدڕینی نەشتەرگەرییەکە ببینن، بێدەنگییەکی سەیر و حەپەسان دایگرتن و لەناوکاو بینییان ئەو دەستەکەی دیکەی "زائربروخ" رۆیشتە ناو قەفەزەی سینگی نەخۆش و دڵی لەوێ هەڵکەند و لە حاڵێکدا هێشتا دڵی لێی دەدا خستیە ناو تەنەکەی زبڵەوە.

دڵی مرۆڤ بە حەڤدە پێوەندیی سەرەکییەوە بە ئەندامانی دیکەی لەشەوە بەستراوەتەوە کە بەشێك لەو پێوەندییانە لە خوێنبەر و خوێنهێنەرەکان پێکهاتوون. جیا لەو پێوەندە سەرەکییانە، دڵی مرۆڤ، لە رێگای کۆمەڵێك لە دەمارەکانەوە لەگەڵ مۆخی پشتە مل پێوەندیی هەیە و ئەم

پێوەندییانەش یەکێك لە ئەرکە سەرەکییەکانی دڵن، بەڵام لەباری بارستاییەوە ناگاتە ئەو حەڤدە پێوەندەکەی دیکە و ئەو دەمارەی کە دڵ و مێشکی حەرام پێکەوە دبەستێ. باریکە. بۆ ئەوەی کە دڵێك لە قەفەزەی سینگ بێننەدەر، دەبێ حەڤدە پێوەندیی سەرەکی و رشتە پێوەندییە لاوەکییەکان بپچڕێنن، بەڵام "زانربروخ" لە ماوەیەکی کورت و لەوپەڕی خێراییدا هەموو ئەو پێوەندیی و لقانەی بڕیبوو. لە حاڵێکدا بەشێك لەو پێوەندییانە لە سەرەوەی دڵ و لەژێر پەراسووەکان لە شوێنێك هەڵکەوتبوون کە ئەو نەیدەتوانی ببینێت، بەڵام "زانربروخ" بە چەشنێك شارەزای ئەندامانی جەستەی مرۆڤ بوو کە کێردی نەشتەرگەرییەکەی لەو شوێنانەش کە چاو نەیدەبینی، وەك ئەو شوێنەی کە دەبینرا، کاری دەکرد. کاتێك ئامادەبوان دڵی نەخۆشەکەیان لە دەستی "زانربروخ" بینی، بەهۆی سەرسوورمانی لەرادەبەدەر و شڵەژان، تووشی جۆرێك لە شێتی بوون، دڵی ئەو پیاوە دوای ئەوەی بەدەستی "زانربروخ" لە لەشی هاتەدەر و خرایە ناو تەنەکەی زبڵەوە هێشتا لێی دەدا و گیانی تێدا بوو.

## وەبیرهاتنەوەی یەکەم وانەی شیکردنەوە

دکتۆر ویلفرید کاتێك لێدانی ئەو دڵەی لە دەرەوەی لەشی نەخۆش بینی، کەوتەوە بیری یەکەم وانەی شیکردنەوەی خۆی لە کاتی خوێندن لە وانەی "فیزیۆلۆژی" (زانستی ئەرکەکانی ئەندامانی لەش) لە کۆلێژی پزیشکی. لەو رۆژەدا مامۆستا فەرمانی پێکرد کە بڕوات و لەناو ئاکواریۆمی تاقیگەی زانکۆ بۆقێك بگرێت و بیهێنێتە ناو پۆل. کۆلێژی پزیشکی خاوەنی چەندین ئاکواریۆم و قەفەزەی جۆراوجۆر بوو بۆ راگرتنی گیانلەبەری بچووکی وەك "مشك، بەرازی بچووکی هیندی" بەڵام هەتا ئەو رۆژە ویلفرید کە ماوەیەکی کەم بوو رۆیشتبووە کۆلێژی پزیشکییەوە، نەیدەزانی خوێندکار دەبێ بۆ خۆی بڕوات و بۆق، مشك یان بەراز بهێنێ بۆ پشکنین.

هەتا ئەو رۆژە ویلفرید تەنانەت دەستی بە بۆقەوە نەدابوو، چ بگا بەوەی کە بیگرێت و بیهێنێتە ناو پۆلی خوێندنەوە. دەڵێی لەنێو چاوانیان نووسیبوو کە ئەم خوێندکارە لە بۆق بێزارە، هەر بۆیە لەنێو ئەو هەموو خوێندکارەی پۆلدا، ئەوەی بۆ هێنانی بۆق دەست نیشان کردووە.

ویلفرید هەوڵی دا بەسەر بێزاری و ترسی خۆیدا زاڵ بێت و دەستی کردە ناو ئاکواریۆمەکەوە و بۆقێکی گرت و بە سەرسوورمانەوە هەستی کرد کە جەستەی زۆر شلك و نەرمە. چاوەڕوانیی ئەوەی نەبوو کە ئەو گیانلەبەرە ناحەزە، ئەوەندە نەرم بێت، بۆقەکە لەنێو دەستیا هێندە نەرم بوو کە بەدەستییەوە بەر بوو و پاش دوو جار خزین بۆقەکەی گرت و لە ناوەکەی دەرهێنا و هێنایە ناو پۆلەوە.

مامۆستا بۆقەکەی لەدەستی ویلفرید وەرگرت و بە خوێندکارانی گوت ئێستا، ئێمە دەمانەوێ شێوازی نەشتەرگەریی دڵی ئەم بۆقە کەلە زۆرێك لە گیانلەبەران هاوشێوەی شێوازی نەشتەرگەریی مرۆڤە ببینین، پاشان بۆقەکەی لەسەر مێزەکە دانا و پاشان لە دواوە دەرزییەکی کردە ناو مێشکی بۆقەکەدا هەتا ئەوەی سیستمی دەماری ئەو گیانلەبەرە لەکار بخات و لەو کاتەدا بۆقەکە وەکوو منداڵێکی شیرەخۆر زیقاندی و هەتا ئەو رۆژە "ویلفرید" قیژەی بۆقی بەرگوێ نەکەوتبوو.

ئەو لە شەوانی هاوین قیژەی بۆقەکانی گوێ لێدەبوو و لەڕووی تێگەیشتنی گشتییەوە دەیزانی هەر قیژەیەکی بۆق چ واتایەکی هەیە. بەڵام زیقەی بۆقی نەبیستبوو و ئەو رۆژە دوای بیستنی زیقەی ئە گیانلەبەرە زۆر خەم دایگرت کە بۆچی گیانلەبەرێکی بێ ئازار زەجر دەدەن و گیانی دەستێنن؟

مامۆستا دوای ئەوەی دەرزییەکەی ڕۆ کردە نێو زگی بۆقەکەدا وتی: ئەم گیانلەبەرە ئیدی هەست بە ژان ناکات، چونکە نێوەندی هەست کردن بە ئازاری پەکی کەوتووە و ئێمە ئێستا دەتوانین جەستەی ئەم گیانلەبەرە هەڵدڕین بەبێ ئەوەی کە ئازارێکی پێ بگەیەنین.

پاشان مامۆستا، بە کێردی نەشتەرگەری، لەشی بچووکی بۆقەکەی هەڵدەڕی و دڵی بە خوێندکاران پیشان دا، هەتا ببینن چۆن چۆنی لێدەدات. دوای ئەوەی خوێندکاران لێدانی دڵی ئەو گیانلەبەرەیان لەناو جەستەی بینی، مامۆستا بە کێردەکەی دەستی ئەو دڵە بچکۆلەیەی لە لەشی گیانلەبەر جوێ کردەوە و لەناو دەفرێکی دانا و ویلفرید بینی کە ئەو دڵە بچکۆلەیە دوای ئەوەی لە جەستەی گیانلەبەر جیا کرایەوە، لەو دەفرەدا هەر لێدەدات.

لێدانی دڵی بۆق لەناو دەفردا بەلای ویلفریدەوە شتێکی تازە و سەرسووڕهێنەر بوو. ئەو خوێندکارە گەنجە، پێی وابوو دڵی گیانلەبەرێك دوای ئەوەی لە لەشی جیا کرایەوە و خوێنی پێ نەگات و پێڕەوی لە دەماری نەکات، دیسان هەر لێ بدات و بجوولێ. دواتر تێگەیشت ئەو دەفرەی کە مامۆستا دڵی بۆقەکەی لەناوی داناوە، تراوێکی مەیلە و زەردی تێدایە و مامۆستا گوتی ئەم تراوە دەبێتە خۆراکێك بۆ دڵ و هەتا ئەوکاتەی دڵی بۆق بتوانێ کەڵك لەم تراوە وەربگرێت، هەر زیندووە و لێی ەدات.

دواتر مامۆستا گوتی: دڵی مرۆڤ پاش دەرهێنانی لە جەستەی مرۆڤ بۆ ماوەیەك لێ دەدا، لە حاڵێکدا نە پێوەندی بە دەزگای گەڕانی خوێنەوە هەیە و نە بە دەزگای دەماری مرۆڤ. دڵی مرۆڤ دوای کەندنەوە لە لەش ئەگەر بێت و لەناو تراوێك کە بۆ خۆراکی دڵ سوودمەندە دایبنێین، ماوەی لێدانی لە دەرەوەی لەشی مرۆڤ زیاتر دەبێت و هۆیەکەشی ئەمەیە کە دڵ، جیا لەوەی کە لەگەڵ ناوەندە دەمارییەکان لە پێوەندی دایە فەرمانیان لێوەردەگرێ، خاوەنی سیستمێکی سەربەخۆیە و دوای ئەوەی کە پێوەندیی دڵ لەگەڵ ناوەندی دەماریی جەستە پچڕا، دەمارە سەربەخۆکانی دڵ درێژە بە لێدانی ئەم ئەندامە بەهێزەی لەش دەدەن هەتا ئەوکاتەی کە بەهۆی نەگەیشتنی خۆراك (خوێن) بە ماسوولکەکانی دڵ، ئەم ئەندامە لە لێدان دەکەوێ و دەمرێت.

ڕۆژێك کە دکتۆر ویلفرید لێدانی دڵی ئەو پیاوە داماوەی لەناو تەنەکەی زبڵ بینی، کەوتەوە بیر یەکەم وانەی "ئەرکی ئەندامانی جەستە"ی خۆی لەناو کۆلێژی پزیشکی و هەڵدڕینی جەستەی بۆق بەدەستی مامۆستاکەی. دوای کارەساتی دەرهێنانی دڵ لەناو قەفەزەی سینگی ئەو پیاوە و فڕێدانی، ڕوودانی کارەساتێکی ترسناکی دیکەش چاوەڕوانی ئەو کەسانە بوو کەلە ژووری نەشتەرگەریدا بوون، ئەویش ئەوە بوو کە "زائربروخ" نەخۆش کە مردبوو دیسان لەسەر جەستەی

هەر سەرقاڵی نەشتەرگەری بوو. دوای ئەوەی زانربروخ دڵی نەخۆشی لە لەشی جیا کردەوە و فڕێی دا، ژیان و جوولە لە جەستەی نەخۆش راوەستا و هەموو ئەندامانی جەستەی نەخۆش و بەرلە گشت مێشکی بەرەبەرە ئەرکەکانیان راوەستا، چونکە خانەکانی مێشك ناتوانن زیاتر لە چوار هەتا پێنج خولەك دوای نەگەیشتنی خوێن تاقەت بێنن و دوای ئەوە ئیتر دەمرن.

کاتێك ژیانێکی کەسێك دەگاتە کۆتایی، سەرەتا مێشکی رادەوەستێ و دواتر بەرەبەرە ئەندامانی گرنگی لەشی، کار و ئەرکە گرنگەکانیان پەکی دەکەوێت. بەهۆی مەرگی نەخۆش ئیتر بەرپرسی تۆمارکردنی لێدانی دڵ و دەمار و زەختی خوێن و ژمارەکانی هەناسەدان، کارێکی نەمابوو، هەر بۆیە بە حەپەساوی لەجێی خۆی وشك هەڵگەڕابوو و "زانربروخ" لێی پرسیبا کە ژمارەی لێدانی دڵی نەخۆش چەندە، بە ناچاری دەبوا بڵێ نەخۆش خۆ دڵی نیە هەتا لێی بدات!

ئەوانەی لە نزیکەوە لە ژوورەکە چاویان لە نەشتەرگەرییەکە دەکرد، بینییان دیوارەی گەدە و ریخۆڵەکانیشی لە جوولە کەوتن. هەر خوێندکارێکی پزیشکی و کەسانی دی کە کاتی نەشتەرگەریی گەدە یان ریخۆڵەکان لە ژووری نەشتەرگەری ئامادە بن، دزانن دیوارەی گەدە و ریخۆڵەکان لە جوولە دان و هەتا ئەوکاتەی مرۆڤ زیندووە ئەو جوولەیە بەردەوامە و دوای مەرگ، وەکوو حەرەکەت و جوولەکانی دیکەی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ رادەوەستێ.

یاریدەدەرانی "زانربروخ" و ئەو کەسانەی لە ژووری نەشتەرگەری بوون و لە شوێنی برین و نەشتەرگەرییەکەیان دەڕوانی، بینییان کە دیوارەی گەدە و ریخۆڵەکانی نەخۆش لە جوولە کەوتن، بەڵام نەشتەرگەری بلیمەت ئاگای لەو دۆخە نەبوو و سەیرتر لە گشت بۆ یەکەم جار "زانربروخ" کە کەسێکی کارامە و بە دەستوبرد بوو، بە خێراییەوە نەشتەرگەریی دەکرد، بە هێواشی درێژەی بەکار دەدا. ویلفرید کە بە باشی تێگەیشتبوو پچڕانی دڵی نەخۆش و کوشتنی، بەهۆی فەرامۆشی و نەمانی هۆشی "زانربروخ"ەوەیە و بە هێواشی کارکردنی "زانربروخ"یش بەهۆی فەرامۆشی و لەبیرچوونەوەیە.

"زانربروخ" هێندە بە هێواشی کاری دەکرد کە رەگ و خانە (سلول) گەرمەکانی لەشی نەخۆش، یان باشتر بڵێین لەشی مردوو، سارد بوونەوە. پەرچەکرداری شانەی سارد و گەرمیی لەشی مرۆڤ، لەژێر دەست و کێردی نەشتەرگەردا پێکەوە جیاوازن. لە لەشی مرۆڤدا شانەی سارد بەدی نایەت، مەگەر پاش مەرگ، چونکە هەتا ئەوکاتەی کە مرۆڤ لە ژیان دایە هەموو ماسولکەکانی گەرمن.

نەشتەرگەرێك تەنیا لە تەلاری توێکاریی کۆلیژی پزیشکی یان لە دایرەی پزیشك قانوونی لەگەڵ ماسولکە ساردەکانی سەر و کاری هەیە، چونکە لەو دوو تەلارەدا لەسەر جەستەی مردوو

تاقیکاری دەکەن و لە شوێنەکانی دیکە کە دەبێ نەخۆشێك لە ڕێگای نەشتەرگەرییەوە چارەسەر بکات، ئیتر ئەوکات لەگەڵ ماسوولکە و شانەی گەرمی لەشدا سەروکاری هەیە.

نەشتەرگەرێك دەزانی کاتی هەڵدڕینی لاشەی مردوویەك دەبێ کێردەکە بە جۆرێك بەکار بێنێ کە شێوەی کارەکەی لەگەڵ ئەوکاتەی کەلە ژووری نەشتەرەگەری لەسەر لەشی نەخۆشێك کار دەکات جیاوازیی هەبێت. مامۆستایان بە خوێندکارانی پزیشکی کە سەرەتا لە تەلارە توێکارییەکانی لەش لەسەر جەستەی مردوان کار دەکەن، دەڵێن وریا بن کە کاتێ دەتانەوێ نەشتەرگەری بۆ جەستەی کەسێکی زیندوو بکەن، جوولە و حەرەکەتی کێردەکەتان دەبێ بە لەونێکی دیکە بێت. بەرەبەرە نەشتەرگەر لە ڕێگای تێگەیشتن و جیاکردنەوەی ماسوولکە و شانەی مردوو لە زیندوو، شارەزایی و لێهاتوویی پەیدا دەکات بە چەشنێك ئەگەر بێت و چاوەکانی ببەستن و پێی بڵێن کە کاری نەشتەرگەری بکات، هەرکە کێردەکەی نایە سەر ماسوولکە، بەبێ ئەوەی کە دەستی لێ دابێت هەتا بەهۆی گەرمی یان ساردیی ماسوولکەوە لە مردوو یان زیندوو بوونی جەستەکە تێبگات، دەزانێ کە ئەوە جەستەی مردوویە یان زیندوو.

## ئوستا تێگەیشت  کە نەخۆشەکەی کوشتووە

لەبەر ئەوەی کە نەشتەرگەریی "زائربروخ" درێژەی کێشابوو، ئەو نەشتەرگەرە مەزنە لە بەرامبەر نەجووڵانی ماسوولکە مردووەکان لەژێر زەبری کێردەکەیدا، لە دۆخی نائاسایی نەشتەرکەرییەکە تێگەیست و ئەو سەرنجدانە وەکوو چەخماخەیەك لە مێشیکدا بریسکایەوە و فەرامۆشییەکەی لەناو برد و گەڕایەوە سەر هەست و ئەقڵی ئاسایی خۆی و ئەو کەسانەی کەلە ژوورەکە ئامادە بوون بینییان لەناکاو نەشتەرگەری بلیمەت رەنگی سپی هەڵگەڕا و کێردەکەی لەدەست بەربۆوە، چونکە لەوە تێگەیشت کە نەخۆشەکە لەژێر دەستیدا مردووە.

هەتا ئەو رۆژە رووی نەدابوو هیچ نەخۆشێك لەژێر دەستی "زائربروخ" و لە کاتی وشیاریی ئاوبراودا بمرێت. لەو رۆژەوە کە "زائربروخ" تووشی فەرامۆشکاری ببوو، چەند کەسێك بەهۆی هەڵەی ئەودوە لە کاتی نەشتەرگەریدا مردبوون، بەڵام خۆی نەیدەزانی کە بۆتە هۆی مەرگیان. لەو کاتەوە کە "زائربروخ" ناوبانگی دەرکرد هەتا ئەو رۆژە رووی نەدابوو کە نەخۆشێك لە کاتی نەشتەرگەریی ئەو، یان دوای کۆتایی هاتنی نەشتەرگەری، گیانی لەدەست دابێت، بە پێچەوانەوە هەر نەخۆشێك کە ئەو نەشتەرگەریی بۆ کردبا، چاك دەبۆوە.

ئەو کەسانەی کە "زائربروخ"یان دەناسی هێندە متمانەیان پێی هەبوو لە پێداهەڵگوتن و تاریف کردنیدا زێدەڕۆییان دەکرد و دەیانگوت "زائربروخ" مردووش زیندوو دەکاتەوە و کێردەکەی وەکوو "سووری ئیسرافیل" (شەیپوورێکە وەك دەڵێن لە رۆژی پەسڵاندا فریشتەیەك بەناوی ئیسرافیل فوویەکی توندی پێدا دەکات و هەموو مردوانی پێ زیندوو دەبنەوە) و هەروەك دەنگی ئەو شەیپوورە مردوان زیندوو دەکاتەوە، کێردی نەشتەرگەرییەکی "زائربروخ"یش مردووان زیندوو دەکاتەوە.

"زائربروخ" دوای ئەوەی تێگەیشت ئەو پیاوەی کوشتووە بە چەشنێك خۆی دۆڕاند کە دکتۆر ویلفرید خەم دایگرت و لێی نزیك بۆوە و دەستی ئوستادی گرت و وتی: تکایە بڕۆن پشوو بدەن و یەکێك لە ژنە پەرستاردکانی راسپارد و وتی: ژێر باڵی "زائربروخ بگرێت" و بۆ خۆشی چووە ژێر ئەو باڵەکەی و لە ژووری نەشتەرگەری بردیە دەرەوە و لە ژوورێکی دیکە و لەسەر کورسیی دانا و بڕیاری دا ئاوی بۆ بێنن و خۆی ئاوەکەی کردە دەمی ئوستاوە، چونکە هێشتا "زائربروخ"

دەستەوانە خوێناوییەکانی لەدەست دابوو.

دواتر بە یارمەتیی خانمە پەرستارەکە دەستەوانە و باڵاپۆشی نەشتەرگەرییەکەی لەبەر "زانربروخ" داکەند. "زانربروخ" بە چەشنێك حاڵی تێك چووبوو کە نەیدەتوانی وەك هەمووکات، دوای کۆتایی هاتنی نەشتەرگەرییەکە بڕواتە ئاودەست و دەست و سەر و سیمای بشوات، بۆیە دکتۆر ویلفرید وتی لەگەن و ئاو و سابوون بهێنن و لە هەمان ئەو ژوورە دەست و سەر و چاوی ئوستاد بشۆن. شۆفێری ئوتۆمبێلی "زانربروخ" ئەوکاتە لەوێ حازر نەبوو کە ناویراو بگەیەنێتەوە ماڵەکەی، بۆیە بە ئوتۆمبیلێکی دیکە گەیاندیانەوە ماڵ و لەناو نەخۆشخانە قاڵ داکەوت کە زانربروخ لە کاتی نەشتەرگەریدا لەناکاو حاڵی تێکچووە و تەرمی مردووەکەشیان لە ژووری نەشتەرگەری بۆ شوێنی ڕاگرتنی مەیتەکان گواستەوە.

ئەرکی سەرشانی دکتۆر ویلفرید یاریدەدەری یەکەمی "زانربروخ" بوو کە بە شێوەی فەرمی ئەو ڕووداوە بکاتە ڕاپۆرت و ڕادەستی بەرپرسی نەخۆشخانەی بکات. بۆیە بەرپرسی بێهۆشی (کە ئەویش بۆ خۆی دکتۆر بوو) ڕووداوی ئەو ڕۆژەی بە سەرپەرستانی نەخۆشخانە گەیاند و گوتی لە شێت بوونی "زانربروخ" هیچ گومانێك نیە و ئەو دەبێ بە سزای جینایەتی ئەمرۆی بگات و بۆ هەمیشە لە ڕیزی کادری نەشتەرگەری وەدەر بنرێ.

لە ئەڵمانیا پیشەیەك لە کۆلیژە پزیشکییەکان هەبوو کە هاوشێوەکەی هەر بەو ناوەوە لە وڵاتانی دیکەی ئەورووپایی نەبوو و نیە، کە ئەویش پیشە و پۆستی ڕاوێژکاری کۆلیژی پزیشکییە، هەروەك پێشتر باسمان کرد کە ڕاوێژکاری کۆلیژی پزیشکی چ ئەرکگەلێکی هەبوو، ڕاوێژکاری کۆلیژی پزیشکی لە بەرلینی ڕۆژهەڵات دکتۆر "هاڵ" بوو. بەرپرسی بێهۆش چووە ژوورەکەی دکتۆر هاڵ و بە شڵەژان و هەژانێکەوە دانیشت. دکتۆر هاڵ کە شڵەژانی ئەوی بینی، تێگەیشت کە بێگومان بۆ کارێکی زۆر گرنگ و جێگای نیگەرانی هاتۆتە لای، چونکە بەرپرسی بێهۆشی خۆی پزیشك بوو و پزیشکەکانیش لە کاری پێوەندیدار بە پیشەکەیان ناشڵەژێن، مەگەر ئەوەی کە ڕووداوێکی پڕمەترسی بێتە ئاراوە.

بەرپرسی بێهۆشی گوتی هاتوومەتە خزمەتتان کەلە پێوەندی لەگەڵ "گهیم رات" ڕاپۆرتێکتان پێ ڕابگەیەنم و گومانم نیە لە ڕاپۆرتەکەم ناڕەحەت دەبن. "گهیم رات" زاراوەیەکی ئەڵمانییە کە واتا زارەکییەکەی (ڕاوێژکاری سەمیمی) یان ڕاوێژکاری نهێنیە، بەڵام وەك ڕێزدانان بۆ ئەو کەسانە بەکار دەهێنرێت کە لەباری زانستەوە لە سەردەمی خۆیاندا وێنەیان نیە و لەوانەیە بکرێت دەستەواژەی "مامۆستای بلیمەت" لە هەمبەر زاراوەی "گهیم رات"دا دابنرێ.

دکتۆر هاڵ پرسیاری کرد ئاخۆ ڕووداوێکی تازە هاتۆتە ئاراوە؟ بەرپرسی بێهۆشی ڕایگەیاند ئێوە دەزانن کە "زانربروخ" لە ماوەی ڕابردوودا تووشی پەرێشان حاڵی و فەرامۆشی بووە؟ دکتۆر هاڵ وتی: بەڵێ ئاگام لەم مەسەلەیە هەیە. بەرپرسی بێهۆشی ڕایگەیاند، بەڵام "زانربروخ" بە تەواوەتی شێت بووە و لە حاڵێکدا دەبوا نەشتەرگەری بۆ گەدەی نەخۆش بکات، دڵی ئەو پیاوە داماوەی دەرهێنا و فڕێی دا.

دواتر بە وردی چۆنیەتیی دەرهێنانی دڵی ئەو کابرایەی بۆ ڕاوێژکاری کۆلیژی گێڕایەوە و گوتی "زانربروخ" شێت بووە و ئیتر نابێ بێتە ژووری نەشتەرگەرییەوە. سەرەڕای ئەوەی کە دکتۆر هاڵ دەیزانی "زانربروخ" تووشی نەمانی هۆش و فەرامۆشی بۆوە، بەڵام بە بیستنی قسەکانی بەرپرسی بێهۆشی حەیران ما، چونکە پێی وانەبوو کە فەرامۆشیی ئەو نەشتەرگەرە مەزنە، ببێتە هۆی شێتیی ڕاستەقینە.

## بۆ چارەسەریی زائربروخ

دکتۆر هاڵ لەبارەی چۆنیەتیی نەشتەرگەریی "زائربروخ" لەسەر ئەو کابرا مردووە چەند پرسیارێکی لە بەرپرسی بەشی بێهۆشی کرد و وتی: من لەبارەی بارودۆخی پرۆفیسۆر "زائربروخ" لەگەڵ وەزیری تەندروستی قسەم کردووە، بەڵام ئەو گوتی حەیفە "زائربروخ" کارکردنی لێ قەدەغە بکرێت لەوانەیە بکرێ بە دەرمانی نوێی "ئێل ـ ئێس، دی" (L _ S _ D) چارەسەری بۆ بکرێت.

دەرمانی (L _ S _ D) ئەمڕۆکە بۆتە یەکێك لە گرفتە کۆمەڵایەتییەکان، چونکە مادەیەکی هۆشبەری پڕمەترسییە، بۆ ئەوەش ساز نەکرابوو کە لەباتی "هێرۆیین، کۆکایین و مۆرفین" تووشبوان بە مادە هۆشبەرەکان بەکاری بهێنن. ئەم دەرمانە لەلایەن کیمیازانە ئەڵمانییەکانەوە دۆزرایەوە و لە سێ ناوی "لی زرك ـ سائۆرە ـ دیەتی لامید" پێکهاتووە کە سێ ناوی ئەڵمانین و (L _ S _ D)یش کورتکراوە و پیتی یەکەمی هەرکام لەو سێ وشە ئەڵمانیەیە و بریا کیمیازانە ئەڵمانییەکان ئەم دەرمانەیان ساز نەکردبا هەتا ئەمڕۆ نەبێتە یەکێك لە خەسارە کۆمەڵایەتییەکانی مرۆڤ.

"ئێل ـ ئێس، دی" دەرمانێکە کە بەپێی زاراوە پزیشکی و دورمانییەکان بە "هالوسی ژن" ناسراوە، واتە دەرمانێك کە کاریگەریی لەسەر مێشك دادەنێت، بەڵام زیادە بەکار هێنانی لەسەر مێشك وەهمی ترسناك دێنێتە ئاراوە.

لەم جۆرە دەرمانە کە رێژەی کەم بەکارهێنانی شەفابەخشە، بەڵام زۆر بەکار هێنانی زیانبەخش و تەنانەت دەبێتە هۆی مەرگی لەناو و لەم بارەوە نموونە زۆرە و یەك لەو نموونانە دەرمانانە کە کەم بەکار هێنانی شەفابەخش و زێدە بەکار هێنانیشی زیانبەخش و مەرگی بەدواوەیە، بە "ئێسترکنین" ناسراوە. پزیشکە ئەڵمانییەکان دوای ئەوەی کە "ئێل ـ ئێس، دی" دۆزرایەوە هیوادار بوون کە بەکارهێنانی رێژەیەکی کەمی بۆ نەخۆشییە دەماری و دەروونییەکان و هەروەها بۆ گەڕاندنەوەی بیر و زەینی ئەو کەسانەی هۆشیان لەدەست داوە بەسوود بێت، بەڵام بەداخەوە دواتر ئەم دەرمانە بووە بەڵای گیانی مرۆڤ.

دیارە زەروری نیە کە بە تێروتەسەلی باس لەوە بکەین کە بۆچی بە لەناوچوونی کاملی بیر و

هۆش دەبێتە هۆی لەدەست دانی ئەقڵ و هەرکەس بۆ خۆی دەزانێ تەواوی ئەو کار و کردەوانەی کە ئێمە لە کاتی خەوەر و وشیاریدا بەرامبەر بە مرۆڤەکان و تەنانەت کەلوپەلە بێ گیانەکانیش ئەنجامی دەدەین، بەهۆی بیر و هۆشەوەیە. ئەوە ئەقڵە فەرمانمان پێدەکات کە نابێ دەست لە ئاگر بدەین، چونکە دەسووتێین، هەموو کردەوەیەکی ئێمە لە ڕێگای بیر و زەینەوە کۆنترۆڵ و فەرمانی پێدەدرێت، ئەگەر بێت و زەینمان لەبیری بکات کە ئاگر سووتێنەرە، ئەقڵیش تێناگات کە لەدەست دان لە ئاگر پێشگیری بکات. بەم هۆیەیە کە منداڵ دەست لە ئاور دەدات، چونکە پێشتر ئەزموونی نەکردووە. زەینی لەبیری نیە کە ئاگر، سووتێنەرە، بەڵام ئەگەر تەنیا یەك جار دەستی بە ئاگر بسووتێ، ئەو ڕووداوە لە زەینیدا دەمێنێتەوە و لەوەو بەدوا ئیتر دەست لە ئاگر نادات.

سڕینەوە و لەناو چوونی بیر و زەین لەلای هەرکەسە و دۆخی تایبەتی هەیە، کەسانی وا هەن کە زەینیان لەباری کار و پیشەوە لەدەست دەدەن، بەڵام لە حاڵەتی دیکەدا وەکوو هەڵسوکەوت و ڕەفتار، مامەڵە و هتد... زەینیان لەجێی خۆیەتی و ئەقڵیان کار دەکات. "زائربروخ" کەسێك بوو کە بیر و زەینی کاریی لەدەست دابوو، ئەویش نەك هەموو کات، لە حاڵەت و کاتەکانی دیکەدا بە تەواوەتی ئەقڵ و هۆشی لەسەر خۆی بوو، هەر بۆیە لە دەرەوەی ژووری نەشتەرگەری، هیچ ڕەفتارێکی لێ نەدەبینرا کە نیشانەی نوقسانیی ئەقڵی بێت.

بەرپرسی بێهۆشی پرسیاری لە دکتۆر هاڵ کرد کە ئاخۆ دەرمانی "ئێل ـ ئێس، دی"یان بۆ ئەو نەخۆشیەی "زائربروخ" بەکار هێناوە. دکتۆر هاڵ وەڵامی دایەوە نا، چونکە بەرلە پێدانی دەرمان، دەبێ پێی بوترێ کە بەهۆی لاوازیی هۆش و زەینەوە تووشی فەرامۆشی بووە و بۆ چارەسەریش دەبێ دەرمانێکی نوێ بەکار بهێنێت و کەسیش ناوێرێ ئەم ڕاستییەی پێ بڵێت. بەرپرسی بێهۆشی وتی بەڵام دەتوانن پێش بە هاتنی بۆ نەخۆشخانە بگرن.

دکتۆر هاڵ وتی: ئەم کارەش لە توانای مندا نیە و تەنیا وەزیری تەندروستی دەتوانێ پێش بە درێژە دانی کاری "زائربروخ" بگرێت. لەو کاتەدا حکوومەتی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات کە بەرلینی ڕۆژهەڵات پایتەختی بوو، تازە پێکهاتبوو و وەزیرانی کابینەی حکوومەت و بۆ وێنە وەزیری تەندروستی کاریان بۆ ئەوە دەکرد، بەڵام ڕێکاری ئیداریی پێشگیری لە کار کردنی "زائربروخ" ئەوە بوو وەزارەتی تەندروستیی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات پێش بە درێژەدان بە کاری نەشتەرگەریی ناوبراو بگرێت.

دکتۆر هاڵ وتی من هەر ئەمڕۆ لەگەڵ وەزیری تەندروستی پێوەندی دەگرم هەتا پێش بە کاری "زائربروخ" بگرێت و ئەویش بە وەرگرتنی مووچەی خانەنشینی لەباری دابین بوونی بژیوی ژیانییەوە

ئاسوودە دەبێت.

دکتۆر هاڵ بەپێی ئەو بەڵێنەی کە بە بەپرسی بێهۆشیی دابوو، لەبارەی نەخۆشیی "زانربروخ"ەوە لەگەڵ وەزیری تەندروستی گفتوگۆی کرد، بەڵام وەزیری تەندروستی وتی من تەنیا خۆم ناتوانم لەبارەی "زانربروخ"ەوە بڕیار بدەم و دەبێ لیژنەی وەزیران درێژەدان بە کاری نەشتەرگەریی لێ قەدەغە بکات. ڕۆژی دوایی وەزیری تەندروستی مەسەلەی "زانربروخ"ی بە ئاگاداریی لیژنەی وەزیران گەیاند، بەڵام تەنانەت لیژنەی وەزیرانیش بۆ پێشگرتن لە کاری نەشتەرگەریی "زانربروخ" بڕیارنامەی پەسند نەکرد، چونکە دەیانزانی دوو کەس لە ئەندامانی باڵای "پولیت بورۆ" (ئیدارەی سیاسیی حیزبی کۆمۆنیستی یەکیەتیی سۆڤیەت) لە نەخۆشەکانی "زانربروخ" بوون و ئەویش بە سەرکەوتوویییەوە نەشتەرگەریی بۆ ئەو دوو کەسە کردبوو و چاک ببوونەوە کە یەکیان "ستالین" سەرۆکی یەکیەتیی سۆڤیت بوو کە پێویست بە ناساندنی ناکات و ئەوی دیکەشیان مارشال "ورۆشیلۆف" بوو.

مارشاڵ ورۆشیلۆف ئەندامی باڵای "پولیت بورۆ" و ئەفسەری بەرجەستەی ئەرتشی یەکیەتیی سۆڤیەت بوو "پاش مەرگی ستالین بووە سەرۆکی شۆرای باڵای یەکیەتیی کۆمارییەکانی شۆرەوی (یەکەیەتیی سۆڤیەت)" بوو بە سەرکۆماری ئەو وڵاتە".

ئەو دوو کەسە لە پشتیوانانی "زانربروخ" بوون و ئەوکاتەش کە تازە حکومەتی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات دامەزرابوو، ئەو حکومەتە نەیدەویست کارێك پێچەوانەی ویست و مەیلی یەکیەتیی سۆڤیەت ئەنجام بدات. سەرەنجام تەنانەت لیژنەی وەزیرانی حکومەتی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتیش نەیتوانی لەبارەی پێشگرتن بە کاری "زانربروخ" بڕیارنامەیەکی دەرنەکرد و خانەنشین نەکرا.

## دوو رووداو
## لەزاری پزیشکێکی ئێرانییەوە

ئەم بابەتە لە روانگەی ئەوەی نوێی ئەمڕۆوە کە ئاگادارییەکی ئەوتۆیان لەبارەی کەسایەتیی "زانربروخ"ـەوە نیە، جێگای سەرسووڕمانە و ئێمەش بۆ ئەوەی بیسەلمێنن "زانربروخ" لە نیوەی یەکەمی ئەم سەدەیە چ پێگە و حورمەتێك بووە. ئەم دوو رووداوە کە دکتۆر "حیجاری" پزیشکی ئێرانی کە ماوەی چەند ساڵێك لە ئەڵمانیا یاریدەدەری "زانربروخ" بوو، لەبارەی ئەوەوە بەم شێوە گێڕاویەتەوە کە لێرەدا دەیخەینە روو.

رووداوی یەکەم پێوەندیی بە نەشتەرگەریی جەرگی "جۆرجی پێنجەم" پاشای بریتانیاوە هەیە کە "زانربروخ" بەرلە دەسپێکی شەڕی دووەمی جیهانی لەسەر بانگهێشتی ئەو بۆ نەشتەرگەریی سەفەری ئەو وڵاتەی کرد. نەشتەرگەریی جەرگی "جۆرجی پێنجەم" بە دەستی "زانربروخ" بە سەرکەوتن ئەنجام درا و پاشای بریتانیا نەخۆشییەکەی چاك بۆوە و دوای چاك بوونەوە، "زانربروخ"ی بۆ خوانی شەوان بانگهێشتی کۆشکی پاشایەتی کرد کە کۆمەڵێك لە پیاوانی سیاسیش بەشدار بوون.

میوانەکان چەند ساتێك بەرلە جۆرجی پێنجەم و "زانربروخ" چوونە ناو تەلاری خواردنەوە، بەپێی نەریتی رێوڕەسم میوانەکان بە ریز راوەستا بوون هەتا پاشای بریتانیا بێتە ژوورەوە و پاشی بریتانیا هاوڕێ لەگەڵ "زانربروخ" کە میوانییەکە لەبەر خاتیری ئەو رێك خرابوو، هاتنە ناو تەلاری میوانییەوە و ئەوکات هەموان دانیشتن و دواتر "زانربروخ" بەناو میوانەکاندا چاوێکی بەلای راست و چەپدا گێڕا، بەڵام دکتۆر حیجازی یاریدەدەرە ئێرانییەکەی نەدیت کە لەگەڵ خۆی هێنابوویە بریتانیا و پێی وابوو بێگومان دواتر دێت چەند خولەکێك چاوەڕێ ما.

بەڵام دوای چاوەڕانی، دکتۆر حیجازی نەهات و "زانربروخ" لەجێی خۆی هەستا و گوتی لەبەر ئەوەی دکتۆر حیجازی داوەت نەکراوە، من لێرە دەڕۆم و سەرەڕای سەرسووڕمانی ئامادەبوان و بەتایبەت پاشای بریتانیا لە تەلاری خواردنگەکە وەدەرکەوت. دەبێ ئەوەش وەبیر بهێنینەوە کە بریتانیای ئەو سەردەمە لەگەڵ بریتانیای ئێستا زۆر جیاوازیی هەبوو و "جۆرجی پێنجەم" پاشای بریتانیا و سەرۆکی ئیمپراتۆرییەکی زۆر بەربڵاو و خاوەنی ٦٢٥ هەرێم و ناوچەی ژێر دەسەڵات لە رۆژهەڵات و خۆرئاوای دونیا بوو، بە چەشنێك دەیانگوت هیچکاتێ خۆر لە ئیمپراتۆریی بریتانیا

ئاوا نابێ و مەجلیس و میوانییە فەرمییەکانی پاشا و ئیمپراتۆری بریتانیا دابو ڕێوڕەسمگەلێکی هەبوو کە موو بە موو جێبەجێ دەکران، بەلام "زائربروخ" بە حالەتی نارەزایەتی تەلاری خواردنگەکەی بەجێهشت.

بە فەرمانی پاشای بریتانیا تەمەنایان لە "زائربروخ" کرد کە بگەڕێتەوە و دەستبەجێ ناردیان بەدوای دکتۆر حیجازیدا و "زائربروخ" هێندە لە دەرەوەی تەلاری خواردنگەکە راوەستا هەتا دکتۆر حیجازی گەیشتە جێ و دواتر لەگەڵ ئەو هاتەوە ناو تەلاری خواردنگەکەوە.

ڕووداوی دووەم بە وتەی دکتۆر حیجازی یاریدەدەریی ئێرانیی "زائربروخ" بەم چەشنەیە:

دکتۆر حیجازی دەڵێ، ڕۆژێکیان لە مەتەبی "زائربروخ" دانیشتبووم کە لەناکاو "هیتلەر" سەرۆکی دەسەلاتداری حکوومەتی ئەڵمانیای نازی هاوڕێ لەگەڵ جێگرەکەی "رۆدۆلف هێس" و "گۆبلز" وەزیری راگەیاندنی بەبێ ئاگاداریی پێشوو، هاتنە ناو ژوورەکەوە.

من لە هاتنی لەناکاوی ئەو سێ کەسە و بەتایبەت "هیتلەر" زۆر سەرم سوور ما، بەلام روخساری "زائربروخ" بە دیتنی هیتلەر و ئەو دوو کەسەکەی دیکە بچووکترین گۆڕانێکی تێدا بەدی نەهات و وەکوو ئەوە وابوو کە ئەوانیش سێ نەخۆشی ئاسایین کە هاتوونەتە مەتەبەکەیەوە.

دوای ئەوەی کە دانیشتن "هیتلەر" گوتی من بۆیە هاتوومەتە لاتان کە پێم وایە دەبێ ئێوە نەشتەرگەریم بۆ بکەن. "زائربروخ" پرسیاری کرد بۆ وا بیر دەکەنەوە، هیتلەر گوتی لەبەر ئەوەی من تووشی شێرپەنجەی قوڕگ بووم. "زائربروخ" وەك بلێی پشکنین بۆ نەخۆشێکی ئاسایی دەکات، بەوپەڕی لەسەرەخۆییەوە گەرووی هیتلەری لەناوەوە تاقی کردەوە و دواتر گوتی ئێوە تووشی شێرپەنجەی گەروو نەبوون و دواتر ناوی پزیشکێکی نووسی و گوتی ئەم دکتۆرە پسپۆڕی بواری ناسینی شێرپەنجەی قوڕگ و گەرووە و بۆ خاترجەم بوون باشتر وایە سەردانی ئەم پزیشکەش بکەن، بەلام من بۆ خۆم پێم وایە گەرووتان تەندروستە و لەو باوەڕە دام کە ئازاری گەرووتان بەو هۆیەوەیە کە زۆر قسە و ئاخاوتن دەکەن.

## ترسی نەشتەرگەری بلیمەت
## لە نەخۆشیی زك ڕەقی (كوزاز)

قوتابییەكانی "زائربروخ" و یاریدەدەرەكانی بیرەوەریی زۆریان لێی هەیە، بەڵام هەموو ئەو كەسانەی كەلە قۆناغی جیاجیادا لەگەڵ "زائربروخ" كاریان كردووە، یان قوتابیی بوون لەسەر خاڵێك كۆكن، ئەویش ئەوەیە كە ئەو نەشتەرگەرە مەزنە لە پیشەكەی خۆیدا ترسی لە هیچ شتێك نەبوو، بێجگەلە نەخۆشیی كوزاز نەبێت. هۆكاری ترسی "زائربروخ" لەو نەخۆشیە ئەوە بوو كە بە چاوی خۆی بینی باوكی بەهۆی تووشبوون بە نەخۆشیی كوزاز گیانی لەدەست دابوو.

سەردەمی منداڵی ئەو نەشتەرگەرە بلیمەتە كە باوكی بەهۆی ئەو نەخۆشییەوە ماڵاوایی لە ژیان كرد، هێشتا زۆرێك لە خەڵكی ئەورووپا وایان بیر دەكردەوە كە نەخۆشیی كوزاز بە كەفارەی گوناحەكان دێتە ئەژمار و لەو باوەڕەدا بوون ئەو كەسەی كە تووشی ئەو جۆرە نەخۆشیە دەبێت، تاوانی گەورەی ئەنجام داوە، هەربۆیە ڕۆژگار تووشی ئەو بەڵایەی كردووە هەتا كەفارەی تاوانەكانی بە ئەستەمی تێپەڕێنێ.

هۆكاری ئەوەی كە خەڵك لەبارەی نەخۆشیی كوزازەوە بەو چەشنە بیر بكەنەوە، بینینی دیمەنی ئازار و چێشتنی ژان بوو لەلایەن نەخۆشەوە و لە هیچكام لە نەخۆشییەكانی دیكەی مرۆڤدا دیمەنی ئازار چێشتنی نەخۆش وەكوو نەخۆشیی كوزاز ژاناوی و ترسناك نیە و تەنانەت دكتۆرەكانیش بەهۆی باوەڕمەند بە ڕێوشوێنە نەریتییەكان ناتوانن دیمەنی ئازاری ئەو نەخۆشانە ببینن، چونكە كاتێك نەخۆشێكی كوزازیان لە كاتی ئازار چێشتاندا دەبینن، دەشڵەژێن.

لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمدا كە پزیشكانی ئەورووپا، ژانی نەخۆشییە جۆراوجۆرەكانیان لەباری ئازار چێشتنی نەخۆشەكان پۆلێنبەندی كرد، ڕایانگەیاند هیچ ئازارێك بەژانتر لە ئازاری نەخۆشیی كوزاز نیە. چونكە لە كاتی تووشبوون بە نەخۆشیی كوزازدا تەنیا یەك شوێن یان ئەندامی مرۆڤ ژان ناكات، بەڵكوو تەواوی ئەو ٧٠٠ ماسوولكەیەی كەلە جەستەی مرۆڤ دایە هەموویان پێكەوە دەكەونە ژان. ژمارەی ماسوولكەكانی جەستەی مرۆڤ زیاتر لە ٧٠٠ دانەیە و هەندێ لە ماسوولكەكان چەند بەشیان لێ دەبێتەوە، بەڵام لە نەخۆشیی كوزاز (زكەرەقە)دا

تەنانەت بچووکترین ماسوولکەکانی لەشی مرۆڤیش تووشی ژان دەبن و بەتەواوەتی کرژ و رچ دەبێتەوە و کرژ بوونەوەی ماسوولکەکان هێندە بەرچاوە ئەو ماسوولکانەی کە " تالّ و ژێ"ی تایبەت و جیایان هەیە، هەر تالّە ماسوولکەیەك، لەباری رەقییەوە شکڵی تێلێك ئاسنی لێدێت و ئەم لێکچوونە، هەرچەند لەوانەیە زێدەرۆیی بێت، بەلاّم لەراستیدا ماسوولکەکان دەکێشرێن. لەبەر ئەوەی لەناو لەشی مرۆڤدا، چ ئەندامانی ناوەوە و چ ئەندامانی دەرەوە ئەندامێك نییە کە ماسوولکەی نەبێت، هەربۆیە کەسێك کە تووشی نەخۆشیی کوزاز دەبێت لە هەموو ئەندامە ناوکی و دەرەکییەکانی لەش، تەنانەت پێڵووی چاو و چینچك (پەلی گوێ) هەست بە ئازاری زۆر دەکەن.

"زائربروخ"یش هیچکاتێ دیمەنی کاتی نەخۆشیی باوکی فەرامۆش نەکرد و بەردەوام وەبیری دەهاتەوە کە لەو کاتەوە کە تووش ئەو نەخۆشییەوە بوو هەتا ئەو رۆژەی کە گیانی ئەسپارد، تەنانەت بۆ ساتێکیش ئۆقرەی نەگرت و شەو و رۆژ، لە تەوقی سەرەوە هەتا پەنجەی قا، ژانی هەبوو و پێچی بە خۆی دەدا و دەست و لاق، مل، پشت، کەمەر، خاڵیگە و لەگان یان کاسیلکەی سنتی بەردەوام دەجوولاّن و هێندێ جاریش تەنانەت نەیدەتوانی بناڵێنێ و "زائربروخ" دوای ئەوەی کە گەورە بوو تێگەیشت کە کرژ و رقێتە بوونی ژێ و ماسوولکەکانی قورگ بوونەتە هۆی ئەوەی کە باوکی نەتوانێ لە سۆنی ئازار بناڵێنێ.

دوو سالّ دوای مەرگی باوکی "زائربروخ" پزیشکێکی ئەڵمانی بەناوی دکتۆر "نیکولر" دوای دە سالّ توێژینەوە و بەدواداچوون لە تاقیگە بچکۆلانەکەی خۆی لە یەکێك لە گوندەکانی ئەڵمانیا میکرۆبی نەخۆشیی کوزاز کە قەوارەی درێژ و چەشنی چیلکە شقارتە باریکەڵە بوو، دۆزییەوە. لەو رۆژەوە کە "پاستۆر"ی فەرەنسی میکرۆبی دۆزییەوە و دەریخست کە هۆکاری زۆرێك لە نەخۆشییەکان میکرۆبە، شێوازی میکرۆبەکان، بەپێی قەوارەویان، ناوی تایبەتیان بۆ دیاری کرا و ئەو ناوانەش بوونە ناوگەلێکی نێودەوڵەتی و ئەمڕۆکە لە هەموو شوێنێك، ناو و جۆری میکرۆبەکان یەکن و تەواوی میکرۆبە بازنەیی، یان هێلکەییەکان بە "کوك" ناسراون و تەواوی میکرۆبە درێژەکانیش "باسیل"ە کەلە وشەی لاتینیی "باسیل" یانی دارەدەستی درێژ وەرگیراوە و هەروەها ناوی هەموو ئەو میکرۆبانەی کە قەوارەیان لە هێشووە ترێ دەچێت "ئێستافیلۆ کوك"ە، کەلە وشەی یۆنانیی "ئێستافیله" بە واتای هێشووە ترێ وەرگیراوە. هەموو ئەو میکرۆبانەش کە چەشنی ئاڵقەی زنجیر بەدوای یەکدا ریز کراون بە "ئێستڕپ تو کوك" ناسراون کەلە دوو وشەی یۆنانیی "ئێستڕپ توس و کوکوس" کە هەردووکیان بە واتای زنجیرەیەك لە کەلوپەلی خڕ دێن کەلە زمانی ئاخاوتن و رۆژانەی یۆنانیدا واتای زنجیر دەدات.

ئەو میکرۆبەش کە دکتۆر "نکولر" پزیشکی ئەڵمانی دۆزییەوە "باسیل" یانی میکرۆبی درێژ بوو. ئەگەر نیکولر پزیشکێکی خەڵکی شار بایە و لە شارەکان سەرقاڵی کاری پزیشکی ببوایە، لەوانە بوو نەیتوانیبا میکرۆبی نەخۆشیی کوزاز بدۆزێتەوە کە ئەمڕۆ بەناوی میکرۆبی "نیکولر" ناسراوە و بەناوی ئەوەوە تۆمار کراوە، بەڵام دکتۆر نیکولر لەبەر ئەوەی لە گوندەکان دەژیا دەیزانی کە گوندنشینان پتر لە دانیشتوانی شارەکان تووشی نەخۆشیی کوزاز دەبن.

دکتۆر نیکولر پاش دە ساڵ توێژینەوە میکرۆبی نەخۆشیی کوزازی لە پەین و شیاگەی ئاژەڵان کە گوندنشینان دۆزییەوە و تێگەیشت کە میکرۆبی نەخۆشیی کوزاز لە شیاگەی "ئەسپ، گا و مەڕ" دەژیت و لە ڕێگای ئەو پەیینانەوە ڕەخنە دەکاتە ناو زەوی و زار و بۆ مرۆڤ دەگوازرێتەوە.

ئەمە یەکەم قۆناغی دۆزینەوەکەی دکتۆر نیکولر بوو و دواتر درێژەی بە لێکۆڵینەوەکەی دا هەتا بزانێت میکرۆبی نەخۆشیی کوزاز چۆن سەرهەڵدەدات. ئاخۆ وەکوو میکرۆبی نەخۆشیی -کەفتەبی یان سیەتا لە ڕێگای زارەوە دەڕواتە ناو جەستەی مرۆڤەوە، یان وەکوو نەخۆشیی "سیل" لە ڕێگای هەواوە مرۆڤ تووشی دەبێت؟ ساڵانێکی زۆر دکتۆر "نیکولر" لەبارەی چۆنیەتیی کارکردی میکرۆبی نەخۆشیی کوزاز توێژینەوەی کرد و سەرەنجام تێگەیشت کە جەستەی مرۆڤ لە ڕێگای برینەوە تووشی نەخۆشیی کوزاز دەبیت و دەست، لاق یان هەر ئەندامێکی جەستە بریندار ببێت و میکرۆبی کوزازیش لەو شوێنەی کە جەستە بریندار بووە دەڕواتە ناو لەشەوە.

دواتر دکتۆر "نیکولر" لێکۆڵییەوە هەتا بزانێت میکرۆبی کوزاز دوای ئەوەی کە چووە ناو لەشەوە چ کارێك دەکات، ئەنجامی توێژینەوەکەی بووە ئەوەی کە میکرۆبی کوزاز کاتێك چووە ناو لەشەوە بەرەو دەمارە پەل دەگوتی و لەوێ شوێن خۆی دەکاتەوە و لەبەر ئەوەی گەرمای لەشی مرۆڤ ٣٧ پلەیە بۆ گەشەی ئەو میکرۆبە لەبارە و زاوزێ دەکات.

شێوازی زیادبوونی میکرۆبی کوزاز بەم چەشنەیە کە دوو کاتژمێر دوای ئەوەی کە چووە ناو لەشەوە، کەرت دەبێت و هەر نیوەیەکی دەبێتە میکرۆبێکی تەواو کامڵی دیکە و ئەوکات هەر یەکە لەو میکرۆبە بۆ خۆیان نیوە دەبن و نیوەکەشیان دیسان دەبێتە میکرۆبێکی کامڵ و بەم چەشنە لەناو جەستە زاوزێ و زیاد دەکات. بوونی میکرۆبێکی کوزاز بە دوو میکرۆبی کامڵ لە نەودی یەکەمدا تەنیا دوو کاتژمێر دەخایەنێت، بەڵام لە نەوەی دووەمدا لە ماوەیەکی کەمتر لە نەوەی سێیەم دەکەوێتەوە و هەروەها نەوەی چوارەم لە ماوەیەکی کەمتر لە نەوەی سێیەم سەرهەڵدەدەن و بە بەراوردی ئەوەی کە هەرچەند گەرای میکرۆبی تازەتر دەبنەوە، ماوەی زاوزێیان کەمتر دەبێت، بە چەشنێك پاش چەند ڕۆژ، ماوەی سەرهەڵدانی نەوەی نوێی میکرۆبی کوزاز لە

دوو کاتژمێرەوە دەبێتەوە چارەکە سەعاتێك.

ئەگەر سیستمە بەرگرییەکانی لەش بتوانن لە کاتژمێری یەکەمی هێرشی میکرۆبی کوزاز بۆ سەر جەستە لەناویان بەرن، ئیتر مەترسییەك رووبەرووی مرۆڤ نابێتەوە. بەڵام ئەگەر دەرەقەتی لەناو بردنی میکرۆبەکان نەیەن، ئەو میکرۆبانەی کە بەخێرایی زیاد دەکەن، لەبەر ئەوەی لەسەر دەمارەکانی لەشە (جیالە ناوەندی گشتیی دەمارەکان، واتە مێشك) جێگا خۆش دەکەن و دەست دەکەن بە لاواز کردن و داڕووخان، چونکە لە لەشی مرۆڤدا دەمارێك پەیدا نابێت کە میکرۆبەکانی کوزاز رەخنەیان تێنەکردبێ، ماسوولکەیەکیش نیە بەهۆی تێکدانی میکرۆبی کوزازەوە تووشی کرژ و رەق هەڵاتن نەبێت.

هەر بەم بۆنەوەیە کە نەخۆش، لە هەموو ماسوولکە ناوکی و دەرەکییەکانی لەشیدا هەست بە ئازار و ژانێکی تاقەت پڕووکێن دەکات. تەنانەت ئەمڕۆکەش پزیشکان بۆ تیماری نەخۆشیی کوزاز دەرمانێکیان نەدۆزیوەتەوە، بەڵام دەتوانن لە رێگای کوتانەوە پێش بە تووش بوون بەو نەخۆشییە بگرن. بە چەشنێك کە دەزانین کاتێك کەسێك بەهۆی رووداوێکەوە، بۆ وێنە پێکدادان بریندار دەبێت و پزیشکەکان جیالە دەرمانە ناسابیەکان، بۆ خاترجەمی "ئەنتۆکسیۆن"ی کوزازیش لە نەخۆش دەدەن و ئەم ئەنتۆکسیۆنە دەرزیی پێشگیری لە نەخۆشیی کوزاز نیە، بەڵکوو "سێرۆم"ێکە کە لەگەڵ کوتان جیاوازیی هەیە.

دەرزیی کوتان و پێشگیری لە نەخۆشیی کوزاز کاتێك کە مرۆڤ ساڵە و لە مەودای دیاریکراودا لێی دەدرێت و بۆ پێشگیری لە کوزاز سێ دەرزی لە مرۆڤ دەدرێت کە مەودای نێوان هەرکامەیان یەك مانگە و دوای ئەوە بۆ ماوەی پێنج ساڵ، لەش لە بەرامبەر هێرشی میکرۆبی کوزاز دەپارێزرێت و ئەگەر پاش یەك ساڵ (لە سەرەتای ساڵی شەشەم) ئەنتۆکسیۆنێك لە هەمان جۆری کوتان بە مرۆڤ بدەن و دواتر لە هەر پێنج ساڵدا جارێك، ئەنتۆکسیۆنێك بوەشێنرێت، لەشی مرۆڤ هەتا کۆتایی تەمەن لە هەمبەر ئەگەری هێرشی میکرۆبی نەخۆشیی کوزازدا دەپارێزرێت. بەڵام دوای بریندار بوون "سێرۆم" دادەنرێت و ئەمەش بەو هۆیەیە کەلە کاتژمێرەکانی یەکەمی رەخنەی میکرۆبی کوزاز بۆ ناو لەش، پێش بە زاوزێی بگرێت و نەهێڵێ لەناو دەمارەکان بێنێتەوە.

"زانربروخ" دوای ئەوەی کە لەبارەی تایبەتمەندییەکانی میکرۆبی کوزازەوە زانیاریی وەدەستهێنا و تێگەیشت کە ئەو میکرۆبە، لە رێگای دەمارەوە کاری خۆی دەکات و ئەو ژانە تاقەت پڕووکێنانەی کە پاش هێرشی کوزاز لە دەمارەکانی جەستە پەیدا دەبێت، بەهۆی دەمارەوەیە و بیری لەوە کردەوە کەلە رێگای نەشتەرگەرییەوە نەخۆشیی کوزاز دەرمان بکات.

لەلای "زائربروخ" ئەم بیرۆکەیەش سەریهەڵدا کە کوزازیش وەکوو شێرپەنجە نەخۆشییەکی بێ دەرمانە و کێردی نەشتەرگەری لەو حاڵەتانە بەکار دەهێنرێت کە نەکرێ بە دەرمان نەخۆشییەك چارەسەر بکرێت و لە ئەنجامدا لەوانەیە بکرێ نەخۆشیی کوزازیش لە رێگای نەشتەرگەرییەوە چارەسەر بکرێت.

ژمارەی ئەو دەمارانەی کەلە لەشی مرۆڤ دان زیاتر لە سەد هەزار دەماری گەورە و بچووکە و هەتارادەیەك یەکسانە لەگەڵ ژمارەی ئەو وایرانەی کە بۆ گواستنەوەی وزەی کارەبا بۆ خانووی شارێك کێشراون، بەڵام هەروەك لە شارێکی گەورە بە جووڵاندنی نوێل یان فیووزێك لە ناوەندی شار، دەکرێ پێش بە وزەی کارەبای هەموو ماڵان بگیرێ، لەناو لەشی مرۆڤیش، بە دەستێوەردان لە ناوەندی گشتیی دەمارەکان کە مێشکە، دەکرێ لەبارەی هەست کردن بە ئازار دەمارەکان لەکار بخرێت. لە لەشی هەرکەس دوو جۆر دەمار هەیە، یەکیان دەماری هەستیار کە هەست بە ژان دەکات و ئەوی دیکەش دەماری وروورژێنەرە کە ئەندامانی لەش وەگەڕ دەخات.

"زائربروخ" ئەو بیرۆکەیەی لەلای گەڵاڵە ببوو کە هەرکات بکرێ لە رێگای نەشتەرگەریی مێشکەوە، دەمارە هەستیارەکان لەکار بخرێن، ژانی نەخۆشیی کوزاز کە پزیشکان بە ئازارترین ژانی ناودێر دەکەن و هەروەها ژانەکانی دیکەش لەناو دەچن، هەڵبەت لە بەرامبەردا دوای ئەو جۆرە نەشتەرگەرییە، کەسەکە ئیتر هەست بە گەرمی، ساردی، درشتی و نەرمی ناکات.

بەڵام دوای نەشتەرگەرییەکی سەرکەوتوو لە مێشك و پەك خستنی دەماری هەستیار، ئاخۆ پرۆسەی نەخۆشی و زاوزێی میکرۆبەکە رادەوەستێ، یان ئاخۆ ئەو میکرۆبانەی کە لەناو دەمار جێیان گرتووە، لەناو دەچن و ئیدەی درێژە بە تێکدانی دەمارەکان نادەن؟

وەڵامی ئەم دوو پرسیارە نەرێنییە، چونکە دوای ئەوەی دەماری هەستیار لەکار بکەوێت، میکرۆبەکانی کوزاز کە لەناو هەمان دەمار جێیان خۆش کردووە دەمێننەوە و درێژە بە کاری تێکدان و لەناوبردن دەدەن. بەڵام زائربروخ" پێی وابوو دوای ئەوەی کە دەماری هەستیار لەکار بکەوێ و ئیدی نەخۆشی تووشبوو بە کوزاز هەست بە ئازاری تاقەت پڕووکێن و ناچارەسەر نەکات، سیستمی بەرگریی لەشی دەکەوێتە کار و میکرۆبەکان دەفەوتێنێ.

ئەم بیرۆکەیەی "زائربروخ" هەتارادەیەك راست بوو و ئەمڕۆش لەلایەن پزیشکانەوە پەسند کراوە، چونکە ئازارە زۆر و بەردەوامەکان ناهێڵن سیستمی بەرگریی لەش بە باشی کار بکات. زۆر کەس بەهۆی بەردەوامی و درێژە کێشانی نەخۆشییەکی بەژان، ئیشتیا و مرخی خواردنیان نامێنێ و ناتوانن نان بخۆن و کاتێکیش ژان بەسۆ بێت برینەکان چاك نابنەوە، "زائربروخ"یش بیری لەوە

دەکردەوە دوای ئەوەی نەخۆشی تووشبوو بە کوزاز، لەژانی بەسۆ رزگاری بێت، لەشی دەستبەجێ "ئانتی کوور" بەرهەم دێنێ و ئانتی کووریش میکرۆبەکانی کوزاز نەفەوتێنێ.

"ئانتی کوور" کەلە زمانی ئینگلیزیدا بە "ئانتی بادی" ناسراوە، هەمان دەستەواژەی نێودەوڵەتیی پزیشکی واتە فیزیۆلۆژی (ئەرکی ئەندامی لەش)ـە و ئانتی کوور لە لەشی مرۆڤدا، بەهێزترین چەکی پێشگیری لە میکرۆبە. دوای ئەوەی کە دەرمانەکانی "ئانتی بیۆتیک" کە گرنگترینیان "پنی سیلین" بوو بەکار هێنران، خەڵك پێیان وابوو و هەندێکیان بۆیان بوو بەقین کە ئەو دەرمانانە بکوژی میکرۆبن.

غافڵ لەوەی کە هیچکام لە دەرمانەکانی "ئانتی بیۆتیك" بۆ خۆیان بکوژی میکرۆب نیە، بەڵکوو دەبێتە هۆی ئەوەی کە "ئانتی کوور" لەناو لەشی مرۆڤ بەهێز بکرێت و میکرۆب لەناو ببات. بە چەشنێك کە گۆڤاری ساینس (زانست)، زماحاڵی ئۆرگانی فەرمیی یەکیەتیی زانایانی لایەنگری پێشکەوتنی زانست لە ئەمریکا نووسیویە لە سەدەی بیستەمدا چوار ئامرازی پزیشکیی بووژێنەرەوەی ژیان، یان "دژە ژار و دەرمانی ژار" لە جیهان بەرهەمهێنران کە یارمەتییەکی بەرچاو و کاریگەرییان بە تەندروستیی مرۆڤ کرد کە یەك لەو ژاربڕانە، دەرمانەکانی "ئانتی بیوتیك"ـە و ناکرێ حاشای لێ بکەین لەو رۆژەوە کە دەرمانەکانی ئانتیی بیووتیك لەلایەن پزیشکانەوە بەکار هێنراون، بە سەدان میلیۆن کەس بەهۆی ئەو دەرمانانەوە لە مەرگ رزگاریان بووە.

"زائربروخ"(۱) دەیزانی دوای ئەوەی دەماری هەستیار لەش لەکار بکەوێ، ئیتر ناکرێ ئەو دەمارە بخرێتەوە کار، چونکە دوای پچڕانی دەمار، دوو بەشی لێك پچڕاو پێکەوە نالکێنرێن و لە ناوەندی گشتیی دەماریش کە مێشکە دوای ئەوەی کە دەماری هەستیاریان لەکار خست، چونکە بەناچاری بەشێك لە پێوەندی دەپچڕێ ئیتر ناکرێ جارێکی تر ئەو بەشە زیندوو بکرێتەوە. هەرچەند دەرمانی نەخۆشیی کوزاز لە رێگای نەشتەرگەرییەوە هیچکات لەبیری "زائربروخ" نەچووەوە، بەڵام بە درێژایی ئەو ماوەیەی کە تەندروست و لەشساغ بوو نەیتوانی ئەو بیرۆکەیە جێبەجێ بکات.

## زائربروخ نەیدەویست لەبارەیەوە تەبلیغ و پروپاگەندە بکرێ

ئەو کەسانەی کە لەگەڵ "زائربروخ" هاوکار بوون، دەڵێن ئەو پیاوە جیا لەوەی خاوەنی بڕوباوەڕێکی نەگۆڕ بووە، لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا هەڵگری خوو و عادەتێکی تایبەتی بوو کە ئەویش خۆ بواردن لە تەبلیغ و پروپاگەندە بوو لەبارەی خۆیەوە. لە وڵاتی ئەڵمانیا ئیزنی ئەوە نەبووە و نیە کە هیچ پزیشکێك لەبارەی خۆیەوە تەبلیغ و پروپاگەندە بکات، یان بەهۆی ئەو نەخۆشانەوە کە لەلایەن ئەوەوە چارەسەر کراون ناوبانگ بۆ خۆی دەستەبەر بکات و لەو وڵاتەش، بۆ ناساندنی پزیشك یان نەشتەرگەرێك تەنیا یەك رێگا ئیزنی پێدراوە کە ئەویش ئەوەیە کە ناو و جۆری پسپۆڕی و ژمارە تەلەفۆنی خۆی کە لەسەر تابلۆیەك لەسەر دەرگای مەتەبەکەی هەڵیدەواسێ، بنووسێت.

"گووبلز" وەزیری تەبلیغاتی ئەڵمانیا لە سەردەمی حکومەتی "هیتلەر"دا، بەرنامەیەکی بۆ رادیۆ ئەڵمانیا هەبوو لەژێر ناوی "ناساندنی پیاوە گەورە و ناودارەکانی هاوچەرخی ئەڵمانیا" و هەندێ لە پزیشکانی ئەڵمانیا کە لەگەڵ "گووبلز" پێوەندیی راستەوخۆیان نەبوو، لە رێگای پێوەندیی جۆراوجۆرەوە هەوڵی ئەوەیان دەدەا هەتا گوبلز ناو و بەسەرهات و ژیاننامەیان لە بەرنامەکانی ئەو رادیۆیەدا بگوێزێتەوە بەڵکوو لەو رێگایەوە ناوبانگ دەربکەن، بەڵام "زائربروخ" سەرەڕای ئەوەی پێوەندیی زۆریان پێوە دەکرد و بانگهێشتیان دەکرد، هیچکات رازی نەبوو لە رادیۆ ئەڵمانیاوە ناوی بڵاو بکرێتەوە و باس لە ژیاننامەی بکرێت و هەتا ئەو رۆژەی کە زیندوو بوو رەزامەندیی نیشان نەدا گۆڤار و رۆژنامەکانی ئەڵمانیا تاریفی بکەن و پێیدا هەڵبڵێن و لە هیچ کۆنگرەیەکی زانستیی پێوەندیدار بە بواری پزیشکی کە هەر ساڵە لە ئەورووپا لە پێوەندی لەگەڵ پرسە پزیشکی و نەشتەرگەرییەکان دەبەسترێ، بەشداریی نەدەکرد، مەگەر ئەوەی کە لەو کونگرەیەدا لەبارەی بابەتێکی گرنگ و نوێی نەشتەرگەری کە زانیبای بە قازانجی گشتیی خەڵکە، راپۆرتی پێشکەش کردبا و بەشداریی دەکرد.

رۆژێکیان "گووبلز" وەزیری راگەیاندنی ئەڵمانیای نازی سەردانی "زائربروخ"ی کرد و پێی وت

کە ئێوە یەکێك لە شانازییەکانی نەتەوەی ئەڵمانیان و ئەوەی کە ناتەوێ وەك یەکێك لە پیاوە ناودارەکانی ئەڵمانیا بناسرێیت بەڕای من، کەموکوڕییەکی نەتەوەییە و داوا دەکەم رازی بن کە ئێمە بە بەرنامەیەکی دوور و درێژ کە بۆ ماوەی چەند حەفتە لە رێگای رادیۆوە بڵاو دەکرێتەوە بۆ رێزگرتن و شانازیی نەتەوەی ئەڵمانیا کە پیاوێکی ناوەها مەزن و بلیمەتی بە دونیا بەخشیوە (نەك رێزلێنان لە ئێوە کە دەزانم پێویستیتان پێی نیە) لەو بەرنامەیەدا ئێوە بناسێنین.

بەڵام "زائربروخ" کە قسەر لەڕوو، وتی جەنابی وەزیری راگەیاندن من گۆرانیبێژ یان ئەکتەری رادیۆ یان سینەما نیم کە ئێوە دەتانەوێ لە رێگای رادیۆوە بگەیەننە ناوبانگ و پێداگریی گووبلز بۆ بەشداریی لەو بەرنامەیە هیچ کاریگەرییەکی لەسەر بیرکردنەوەی ئەو نەشتەرگەرە بلیمەتە دانەنا و رازی نەبوو کە رادیۆی ئەڵمانیا ئەو لە ریزی پیاوانی ناودار و هاوچەرخی ئەڵمانیا بناسێنێت.

هەروەك پێشتر گوتمان "زائربروخ" لە حاڵێکدا سەرقاڵی نەشتەرگەری بوو چۆن چۆنی دڵی نەخۆشێکی لە قەفەسەی سینگی دەرهێنا و لە تەنەکەی زبڵی هاویشت و ئەو دکتۆرەی کە لێپرسراوی بێهۆشی بوو، ئەو رووداوەی لە راپۆرتێکدا گەیاندە نەخۆشخانە و لێپرسراوان، بەڵام دەسەڵاتداران کاردانەوە و وەڵامێکیان بەو راپۆرتە نەبوو. وەزیری تەندروستیی ئەڵمانیای رۆژهەڵاتیش کە بە وتەی دکتۆر "هاڵ" وتبووی دەکرێ "زائربروخ" بە دەرمانی "L - S- D" چارەسەر بکرێت، بەڵام ئەویش هیچ کارێکی لەم بارەوە ئەنجام نەدا و وتمان ئەو دەرمانە کە سەرەتا بە مەبەستی کەم بەکارهێنان و وەکوو هێندێ ژار بۆ دەرمان بەرهەم هاتبوو، پاشان وەکوو بەڵایەکی لەبڕان نەهاتوو کەوتە گیانی لاوان و خەسار و زیانی گیانیی زۆری پێیان گەیاند.

لێپرسراوانی باڵای ئەڵمانیای رۆژهەڵاتیش بەو هۆیەی کە خۆیان پشتیوانییان لێکردبوو و لەبەر ئەوەی نەیاندەتوانی کەسێك کە بە شێوەیەکی ئاشکرا و لێبڕاو لەژێر چەتری پشتیوانیی خۆیان دایە، حاشای لێبکەن، بەتایبەت "زائربروخ" کە دەیانناسی و پێیان وابوو لەوانەیە رۆژێك بۆ چارەسەریی نەخۆشیی پێویستییان پێی هەبێت، هەر بۆیە ئەو راپۆرتانەیان وەك ئێرەیی و بەخیلیی رکەبەرەکانی لە قەڵەم دەدا.

## نەشتەرگەری بۆ بنبڕکردنی ریشەکانی شێرپەنجە

ژنێکی ئەڵمانی بەناوی خاتوو "فراتین" بەهۆی ئەوەی لە پشتییەوە تووشی تومۆرێکی شێرپەنجە ببوو، لەسەر داوای پزیشکان دەبوا نەشتەرگەریی بۆ بکرێت و ئەو تومۆرە شێرپەنجەیە دەربهێنرێت.

کاتێك باسی تومۆری شێپەنجە دەکرێت، خەڵکی ئاسایی کە زانیاریەکی ئەوتۆیان لەبارەی نەخۆشیی شێرپەنجەوە نیە پێیان وایە هەمیشە لە کاتی سەرهەڵدانی شێرپەنجەدا تومۆرێك لە جەستە پەیدا دەبێت کە گردە. لە حاڵێکدا لەوانەیە شانەی شێرپەنجە نە خڕ بێت نە هێلکەیی، بەڵام چونکە لە هەندێ لە ئەندامانی جەستە، شانەی شێرپەنجە خڕ یان هێلکەیین (کە زیاتر لەناو جەرگ و سیپەلاکدا قەوارەکەی بەم چەشنەیە) لە رابردوودا پزیشکانی ئەورووپا شانەی شێرپەنجەیان بە تومۆری شێرپەنجە ناسیوە، لە حاڵێکدا لە هەندێ لە نموونە و حاڵەتە شێرپەنجەییەکاندا، شانەی شێرپەنجە بە شکڵی تومۆر یان هێلکەیی دەرناکەوێت، بەڵکوو وەکوو قرژاڵێك کە چەندین دەستی هەیە پان دەبێتەوە، هەر بۆیە ئەم نەخۆشیەیان بەناوی شێرپەنجە یانی قرژاڵ ناودێر کردووە.

شانە و پێکهاتەی شێرپەنجەی خاتوو "فراتین" لە پشتییەوە وەکوو قرژاڵ پان ببۆوە کە لەسەرەوە هەتا خوار و لە راستەوە هەتا چەپ، بەشێك لە پشتی داپۆشیبوو و پزیشکەکان کاتێك شانەی شێرپەنجەی گەورەی ئەو ژنەیان لە پشتییەوە بینی سەریان سوور ئەما، چونکە خاتوو "فراتین" خێرا هەوڵی چارەسەریی ئەو نەخۆشیەی نەدابوو و لەبەر ئەوەی کە دەرمانی ئەو نەخۆشیەی هێندە وەدوا خست هەتا ئەوەی شانەی شێرپەنجەییەکان پێکەوە تەنران و بەرین بوونەوە.

چونکە شانەی شێرپەنجە دوای ئەوەی کە سەرهەڵبدات، بۆ ماوەیەك ئازاری نیە، هەر ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە تووشبوان بەم نەخۆشییە هەست بەوە ناکەن کە تووشی نەخۆشییەکی ترسناك بوون. ئەو کەسەی کە تووشی شێرپەنجە دەبێت ئەگەر بێت و لە رۆژانی یەکەمی تووشبووندا پەی بە نەخۆشییەکەی ببات، هەوڵ بۆ چارەسەرکردنی دەدات و نەخۆشیی شێرپەنجەش بە زۆری لە سەرەتاوە چارەسەر دەکرێن. بەڵام دوو شت دەبنە هۆی ئەوەی کە ئەو کەسەی کە تووشی شێرپەنجە دەبێت هەوڵی چارەسەر کردن نەدات، یەکەم ئەوەی کە هەست بە هیچ چەشنە ژان و ئازارێك ناکات و دووەم، هەندێ جار نەخۆشیی شێرپەنجە لە شوێنگەلێکی جەستەوە

سەرهەڵدەدات کە نەخۆش نیشانەکانی نابینێت. ئەگەر شانەی نەخۆشیی شێرپەنجە و بە زمانی سادەتر تومۆری شێرپەنجە لە شوێنەکانی وەکوو قەفەسەی سینگ، زگ، شلکەی ران، لاق یان دەستدا بێت، کەسەکە ئەو تومۆرە دەبینێت و هەوڵی چارەسەر کردنی دەدات. بەڵام کاتێک تومۆری شێرپەنجە لەناو جەرگ، سیپەلاک، شپیلك (لەوزەلمعدە)، یان لەناو کاسەسەر یان لەناو ماسوولکەیەکدا سەرهەڵدەدات کەسی نەخۆش ئەو تومۆرە نابینێ و لەبەر ئەوەی ژانیش ناکات تێناگات کە نەخۆشە.

کاتێک خاتوو "فراتین" تێگەیشت دەبێ نەشتەرگەریی بۆ بکرێت و بۆ ئامادەکاری نەشتەرگەرییەکە و وەرگرتنی بڕیار، سەردانی نەخۆشخانەی شاریتی لە بەرلینی رۆژهەڵات کرد و وتی حەز دەکات پرۆفیسۆر "زائربروخ" نەشتەرگەریی بۆ بکات و ئەم داخوازییەی قبووڵ کرا. دکتۆر "ویلفرید" یاریدەدەری "زائربروخ" سەرەڕای ئەوەی کە دەیزانی دۆخی ئوستاد لەباری رۆحی و دەروونییەوە چاك بۆتەوە و نیشانەیەك لە فەرامۆشیی تێدا نابینرێ، حەزی نەکرد لە کاتی نەشتەرگەریی خاتوو "فراتین"دا ئامادە بێت و ماندوویەتیی کردە بیانوو. بەڵام دکتۆر "مادلنر" یاریدەدەری دیکەی "زائربروخ" لە رۆژی نەشتەرگەرییەکەدا ئامادە بوو.

هیچ لێپرسراوێکی فەرمی پێشیان بە درێژەی کاری نەشتەرگەریی "زائربروخ" لە نەخۆشخانە نەگرت و بەرپرسی نەخۆشخانەش پێشگیریی نەکرد، بەڵام دواتر دەرکەوت کە دژایەتی نەکردنی سەرۆکی نەخۆشخانە بەهۆی بەخیلی بردن بە "زائربروخ" بووە، چونکە دەیزانی لە هیچ رێگایەکی دیکەوە ناتوانێ بڵێسەی ئاگری ئیرەیی خۆی لە بەرامبەریدا دامرکێنێ، هەر بۆیە هیوای ئەوەی دەخواست کە "زائربروخ" دیسان لە کاتی نەشتەرگەریدا تووشی هەڵە بێت هەتاهەتایە پێش بە کارەکەی بگیرێت.

پرۆفیسۆر "زائربروخ" کاتێك چاوێکی بە بەرنامەی نەشتەرگەریی خاتوو "فراتین"دا خشاند، نە لە ئامادە نەبوونی دەستیارەکەی خۆی واتە دکتۆر "ویلفرید" سەری سووڕ ما و نە لە ئامادە نەبوونی بەرپرسی بێهۆشیش مەسەلەیەکی کردە بیانوو هەتا لە کاتی نەشتەرگەریەکەدا ئامادە نەبێت، چونکە لە نەخۆشخانەکان زۆر جار حاڵەتی وا دێتە پێش کە دکتۆر و نەشتەرگەرەکان بەهۆی سەفەر و بەشداری لە کۆنگرە زانستییەکان یان بەهۆی نەخۆشی، کارەکانی خۆیان بە شێوەی کاتی بە کەسانی دیکە دەسپێرن.

دکتۆر ویلفرید هەرکە بیستی "زائربروخ" بەرنامە و کاری نەشتەرگەریی خاتوو "فراتین"ی قبووڵ کردووە، خێرا تێگەیشت کە دیسان تووشی تێکچوونی باری زەینی و فەرامۆشی بۆتەوە.

چونکە پاش رووداني ترسناکی ئەو رۆژەی کە دڵی نەخۆشەکەی لە قەفەسەی سینگی دەرهێنا و لە تەنەکەی خۆڵی هاویشت و دواتر کێردی نەشتەرگەرییەکە بە دەستیەوە داکەوت و رەنگی سپی هەڵگەڕابوو و کە دواتر دکتۆر "ویلفرید" گەیاندییەوە ماڵ و چەندین رۆژ نەهاتەوە نەخۆشخانە، دەبوا "زانربروخ" تێگەیشتبا کە لەناکاو تووشی خراپەیەکی ترسناك بووە و ئیتر نابێ کێردی نەشتەرگەری بەدەستەوە بگرێ و ئێستا کە دیسان دەیهەوێ نەشتەرگەری بکات، دەردەکەوێ کەوا هەمیسان تووشی حاڵەتی بیرچوونە و فەرامۆشی بووە بۆیە ئەو رووداوەی بە بیر نایەتەوە.

ئەو رۆژەی کە دەبوا خاتوو "فراتین" نەشتەرگەری بۆ بکرێت "زانربروخ" لە کاتی خۆیدا لە نەخۆشخانە ئامادە بوو و لە رواڵەتدا بە تەواوەتی هۆشی لەسەرەخۆ بوو و خۆی بۆ ئەنجامدانی نەشتەرگەرییەکە ئامادە کرد. بە وردی دەست و پلی شۆرد و بە یارمەتیی یەك لە پرستارەکان جلی نەشتەرگەریی و دەستەوانەی لەدەست کرد. پێش لەوەی "زانربروخ" بڕواتە ژوورەوە نەخۆشەکەیان لەسەر قەرەوێڵەی نەشتەرگەری خەواندبوو.

لە ژووری نەشتەرگەرییەکە حەوت کەس ئامادە بوون کە سێ کەسیان پیاو و ئەوانی دیکەش ژن بوون. پیاوەکان جیالە "زانربروخ" دکتۆر "مادلنر" یاریدەدەری دووەمی ئوستاد و دکتۆر "سرايد" بەرپرسی بێهۆشی بوو. هەروەك گوتمان شانەی شێرپەنجەی خاتوو "فراتین" لە پشتییەوە بوو، بۆ ئەوەی بتوانن ئەو تومۆرە شێرپەنجەیە لە پشتی "فراتین" دەربێنن دەبا بە پشتا بیانخەواندبا، پێشتر کاتێ نەخۆشێکیان بەڕوودا لەسەر قەرەوێڵەی نەشتەرگەری پاڵ دەخست، چاوەدێری کردنی هەناسەدانی گرفت بوو.

بەڵام پرۆفیسۆر "زانربروخ" بۆ کۆنترۆڵ و چاوەدێریی ئەو جۆرە نەخۆشانە شێوازێکی داهێنا کە نەخۆش بە ئاسانی هەناسەی دەدا و هەروەها دەیانتوانی بە ئاسانی کۆنترۆڵی هەناسە کێشان، لێدانی دڵی بکەن و لە مەودای دیاریکراویشدا زەختی خوێنی بگرن. "زانربروخ" لەبارەی هەناسە و ژمارەی لێدانی دڵ و زەختی خوێنی نەخۆش پرسیاری لە بەرپرسی بێهۆشی کرد و دوای ئەوەی کەلە دۆخی نەخۆشەکە خاترجەم بوو، دەستی درێژ کرد و یەکێك لە ژنە پەرستارەکان کێردی نەشتەرگەریی دایە دەستی و کاری ئوستادی بلیمەت بۆ لابردنی تومۆری شێرپەنجە لە پشتی ئەو ژنە دەستی پێکرد.

ئەو تومۆرە شێپەنجەیە چەشنی دەست و پێی قرژاڵ، سەراپای پشتی ئەو نەخۆشەی تەنیبوو و چاوێکی ئاسایی نەیدەتوانی بزانێت مەودای شانەی شێرپەنجە و شانەی غەیر لە شێرپەنجەی ئەو ژنە لە کوێیە. بەڵام چاو و دەستانی "زانربروخ" بە ئاسانی ئەو مەودایانەی دەبینییەوە و بەوپەڕی

وردبینییەوە شانەی شێرپەنجەی لە شانەی ساغ جیا دەکردەوە و بەبێ ئەوەی کێردەکەی تەنانەت بە ئەندازەی یەک میلیش لە مەودای نێوان شانەی شێرپەنجە و شانەی ساغ خەوشدار بکات، کارەکەی دەرێژە پێ دەدا.

کێردی نەشتەرگەری بە دەستی راستی "زانربروخ"ەوە بوو و دەستی چەپی کە یارمەتیی دەستی راستی دەدا، هێندە بە خێراییەوە دەجوولایەوە دکتۆر "مادلنر" نەیدەتوانی ئاراستە و جوولەی کارکردنی ببینێ و حەرکەتی هەر دوو دەست و بەتایبەت دەستە راستی نەشتەرگەری بلیمەت نەدەوەستا، مەگەر لە دوو حاڵەتدا، مەگەر ئەوکاتەی لەبارەی دۆخی هەناسە و لێدانی دڵ و زەختی خوێنی نەخۆش پرسیاری کردبا و ئەوی دیکەش کاتێک بوو کە "زانربروخ" دەیەویست کێردەکەی بگۆڕێت و بۆ برینی هەندێ لە بەشەکان کێردێکی دیکە بەدەستەوە بگرێ، ئوستاد کێردە پیسەکەی دەخستە ناو زبڵدانەوە و یەک لە خانمەکان کاردی دیکە دەدایە دەستی پرۆفیسۆر.

شێوازی نەشتەرگەریی "زانربروخ" چەشنی شێوازی نەشتەرگەرانی قۆناغی کلاسیک، پێش لە پەی بردن و بەکارهێنانی دەرمانە بێهۆشییەکان بوو و دەڵێی ئەو نەخۆشەی کە لەسەر قەرەوێڵەی نەشتەرگەری خەوێنراوە بێهۆش نیە و هۆش و فامی لەسەر خۆیە و هەست بە ژان دەکات و ئەو دەبوا هەتا ئەو رادەیەی دەگونجێ، کاری نەشتەرگەری بە خێراییەکی تەواو کۆتایی پێ بێنێ هەتا نەخۆش کەمتر ئازار بچێژێ.

دکتۆر "مادلنر"کاتێک سەیری خێرایی کاری ئوستادی دەکرد، لە ناخەوە ئیرەیی پێ دەبرد و لەوانەیە نەیزانیبێ کە هەست بە سەرەتیی بوو "زانربروخ" لە هەمبەر خۆیدا دەکات، چونکە کاتێ ئێمە لە ناخەوە ئیرەیی بە کاری کەسێک دەبەین، چ بیزانین و چ نەیزانین، دان بەوەدا دەنێین کە ئەو لە ئێمە سەرترە.

کاتێک ریشاڵێک لە شانە شێرپەنجەییەکان لە شانە ساغەکان جیا دەکرایەوە، ئوستادی گەورە بە حەرەکەتێکی کێردەکە دەیبڕی و لە تەنەکەی زبڵی دەهاویشت، یانی یەکێک لە دەست یان لاقەکانی شێرپەنجە قرژاڵیەکەی دەپچڕاند. خێرایی کاری "زانربروخ" بەرادەیەک بوو کە یەک لە ژنە پەرستارەکان پێرانەدەگەیشت بە "تانپوون" خوێنی شوێنی برینەکە ویشک بکاتەوە، هەر بۆیە دوو ژن کرابوونە بەرپرسی ئەو کارە و شوێنی برینەکانیان بە تانپوون ویشک دەکردەوە. ئەو ژنانەی کەلە رێگای تانپونەوە شوێنی برینەکەیان ویشک دەکردەوە، شارەزای کارەکەیان بوون و بە جۆرێک تانپوونەکەیان دەسووراند کە پێش بە دەستی "زانربروخ" نەگرن. پاش یەک کاتژمێر، هەموو ریشۆڵە شێرپەنجەکان لە پشتی ئەو ژنە دەرهێنرا و ئیدی تەنانەت تاڵە ریشەیەکی شێرپەنجەی تێدا

ئەما و دکتۆر "مادلنر" پێی وابوو ئەگەر ئەو کاردیان بەو سپاردبا، بۆ دەرهێنانی ئەو ریشە شێرپەنجەییانە و پاك کردنەوەی پشتی نەخۆش، لەوانەیە حەوت هەتا هەشت کاتژمێر کاتی خایاندبا.

پرۆفیسۆر "زائربروخ" جارێکی تر لەو دکتۆرەی کە بەرپرسی بێهۆشی بوو پرسیاری باری هەناسە، لێدانی دڵ و زەختی خوێنی نەخۆشی کرد و دواتر لەو ژنەی کە کاری پێدانی کەلوپەلەکان بوو بە دکتۆر داوای مشاری نەشتەرگەریی کرد. ئەویش بێ راوەستان مشارەکەی دایە دەست "زائربووخ"ەوە.

دکتۆر "مادلنر" کاتێ بیستی کە "زائربووخ" داوای مشاری نەشتەرگەری دەکات، سەری سوور ما، چونکە لە پشتی نەخۆشەکە ئیدی هیچ نیشانە و شتێکی زیادە نەمابوو کە بۆ برینەوەی پێویستی بە مشار بێت و کاری نەشتەرگەریەکەش کۆتایی پێهاتبوو و تەنیا دەبوا پشتی نەخۆشەکە ببەستن و بیبەنەوە بۆ ژووری حەسانەوە. پرۆفیسۆر "زائربروخ" دوای ئەوەی مشارەکەی بەدەستەوە گرت لەلای پشتەوە دەستی کرد بە برینەوەی دوو پەراسووی نەخۆشەکە.

دکتۆر "مادلنر" دەیزانی ئەو ریشە شێرپەنجەییەی کەلە پشتی نەخۆشەوە سەردەردێنی، بەپێی نەخۆشییەکە تەنیا لە پشتی نەخۆش ریشە دادەگوتی و بەرەو سینگ و بەرۆکی نەخۆش پەل ناهاوێ.

بۆیە بیری کردەوە لەوانەیە پێکهاتەی شێرپەنجەی ئەو ژنە، بە شێوەیەکی سەرسوورهێنەرانە، بەرەو سینگی ریشەی داکوتابێت و ئێستاش "زائربروخ" بۆیە ئەو دوو پەراسووەی دەبڕێتەوە هەتا ئەو ریشاڵە شێرپەنجەیە لە سینگی دەربکێشێ.

ئوستاد هەر بەو خێراییەی کە ریشاڵە شێرپەنجەکەی لە پشتی ژنە دەرهێنا، دوو پەراسووەکەی لە پشتەوە بڕی بەبێ ئەوەی کە پەراسووەکان بەتەواوەتی لە جەستەی بکاتەوە و تەنیا پچڕاندی و هێشتیەوە سەرێکی پەراسووەکان هەر بە جەستەیەوە بێنێ و ئەو دوو پەراسووەی بەسەر جەستەیدا چەماندییەوە. دکتۆر مادلنر گوتی "گهیم رایت" یانی ئاخۆ پێویست ناکات کەرەسەی هەڵدڕینی قەفەسەی سینگ ئامادە بکەین؟ هەروەك گوتمان "گهیم رایت" گەورەترین نازناوێك بوو کەلە ئەڵمانیا بە نەشتەرگەرێك دەدرا و دوکتۆ مادلنر بۆیە باسی ئامادەکردنی کەرەسەکانی هەڵدڕینی قەفەسەی سینگی کرد، چونکە کاتێك بیانهەوێ بە هەر هۆیەك لەسەر سینگی نەخۆشێك، نەشتەرگەری ئەنجام بدەن، دەبێ هەندێ ئامێر و کەلوپەل ئامادە بکرێت هەتا ئەرکی هەناسە کێشان رانەوەستێ.

دەبێ ئەوەش بگوترێ کە دەست خستنی ئەو کەرەسانەش هەر لە داهێنانەکانی پرۆفیسۆر "زانربروخ"ە، چونکە ئەو بوو بۆ یەکەم جار قەفەسەی سینگی نەخۆشی کردەوە و بەبێ ئەوەی ببێتە هۆی مەرگی نەخۆش، ئەوەش هەر "زانربروخ" بوو نەشتەرگەریی سینگ و دڵی نەخۆشی فێری نەشتەرگەرەکان کرد. قەفەسەی سینگ شوێنێکی بەرتەسك و بەتەواوەتی داپۆشراوی جەستەیە کە بەشێك لە ئەندامی گرنگی لەشی تێدایە و جوڵە و حەرەکەتەکانی دیوارۆکەی قەفەسەی سینگ یارمەتیی هەناسەکێشان دەدەن. کاتێك قەفەسەی سینگ دەکرێتەوە، دوو سیپەلاك (جگەری سپی) پڕ دەبێ لە هەوا و کاتێك قەفەسەی سینگ تەنگ دەبێتەوە و دەچێتەوە یەك، هەوا لە هەردوو سیپەلاکەوە دێتە دەرێ.

جیاله هۆکارە ناوکییەکان، زەحت و تەوژمی هەوای ژینگە، لە جوڵەی سینگدا زۆر کاریگەرە و بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێ هەناسە بدات، تەوژمی هەوای دەوروبەر بۆ سەر جەستە دەبێ هەر بەو ئاستە بێت کە ئێستا لەسەر زەوی هەیە. ئەگەر بێت ڕێژەی ئەو گوشار و زەختە بگۆڕێ، مرۆڤ دەخنکێ، واتە هەوای پێویست ناگەنە سیپەلاکەکان، هەربۆیە لەناو فڕۆکە ئەمڕۆییەکانی هەڵگری موسافیر کەلە بەرزایی زۆرەوە دەفڕن، ئەندازەی هەوای ناو ژووری موسافیر و فڕۆکەوانەکان لەگەڵ ئەندازەی هەوای سەرزەوین دەگونجێنن (چونکە لە بەرزاییەکاندا کەش و زەختی هەوا کەمە و موسافیر و فڕۆکەوانەکان سەرەتا تووشی ناڕەحەتی دەبن و دواتر دەخنکێن).

لە زەوینیش ئەگەر بێت و لە کاتی نەشتەرگەریدا قەفەسەی سینگ بەبێ لەبەرچاو گرتنی دۆخی هەناسەکێشان هەڵبدڕن، هەرچەند ئاستی زەختی هەوا بە نیسبەت جەستەی مرۆڤ، گۆڕانێك پێش نایەت، بەڵام بەهۆی کرانەوەی قەفەسەی سینگ، هەوا ناگاتە سیپەلاك. بەڵام ئەگەر بێت و لە کاتی نەشتەرگەریدا کاسەسەری مرۆ بکەنەوە، بە چەشنێك مۆخ (کرۆکی بڕبڕە)، ڕاستەوخۆ هەوا لێی بدات، مەترسییەك ڕووبەڕووی نەخۆش نابێتەوە و خانە و خانۆچکەکانی مێشك، لە ڕێگای دەمارەکانەوە بە بەردەوامی، خۆراکی خۆیان کە هەمان ئوکسیجێنە بەدەست دێنن.

هەر بەو هۆیەیە کە پزیشکەکانی پێشووی وڵاتی میسر، دەیانتوانی نەشتەرگەریی مێشك بکەن، بەڵام نەیاندەتوانی نەشتەرگەری بۆ قەفەسەی سینگ ئەنجام بدەن، چونکە دەبوونە هۆی مەرگی نەخۆش. کاتێك دکتۆر مادلنر بە "زانربروخ"ی گوت نایا پێویستە کەرەسەی هەڵدڕینی قەفەسەی سینگ بهێنن، ئەو پزیشکە لە کاتێکدا کێردی نەشتەرگەرییەکەی بەدەستەوە بوو، بە قامکی دەستی چەپ ئاماژەی بە سینگی نەخۆش کرد و گوتی بڕوانن هەتا ئەوەی بەشەکانی ناوەوەی قەفەسەی سینگ لەم ڕێگایەوە ببینن. ئەوکات دکتۆر مادلنر تێگەیشت کە "زانربروخ"

هەمیسان تووشی فەرامۆشیی بیر و هۆش بۆتەوە.

ئەو شتەی کە "زائربروخ" گوتی، هەمان ئەو وتەیە بوو کە نەشتەرگەرەکان بە خوێندکارانی بواری پزیشکی دەڵێن کە بۆ فێربوون لە تەلاری فێرکاری و نەشتەرگەری ئامادە دەبوون دەیانگوت و هیچ نەشتەرگەرێك، لە ژووری نەشتەرگەری ئەو قسەیە روو بە هاوکار و یاریدەدەرەکانی نەدەگوت و نالێت. چونکە ئەو کەسانەی کە بۆ یارمەتی بە نەشتەرگەرێك لە ژووری نەشتەرگەری ئامادە دەبن، هەموویان لەو وردەکارییانە دەزانن و تەنانەت ئەو ژنانەش کە لەو ژوورە ئامادە بوون دەیانزانی کە ناوەوەی قەفەسەی سینگی مرۆڤ چیە و ئەگەر بێت و لە پشتەوە لێی بروانن، چۆن دێنە بەرچاو. دکتۆر مادلنر گوتی "گهیم رایت" ئیزن بدەن کە ئێمە ئەم پەراسوانە ببەستین.

"زائربروخ" کە چاوی لە نەخۆشەکە دەکرد دوای بیستنی ئەو قسەیە بەرەو لای دکتۆر مادلنر وەسوورِا و چاوەکانی دەرپەڕاند و هاواری کرد کێ ئیزنی پێداوی خۆ لە کاری من هەڵقورتێنی؟

"زائربووخ" لە حاڵێکدا ئەو قسانە بەزاریدا دەهاتن بە کێردی نەشتەرگەری کە بەدەستییەوە بوو خەریك بوو هێرش بکاتە سەر دکتۆر مادلنر. مادلنر بە توندی خۆی کشاندە دواوە و بە قەولی یاریزانانی بۆکس جێگای بەتاڵ کرد و "زائربروخ" نەیتوانی خۆی راگیر بکات و خۆی کوتار بەو مێزەدا کە نەخۆشەکەی لەسەر بوو و کەوتە سەرزەوی و چاویلکەکەی شکا و هەستایەوە و ویستی دیسان هێرش بکاتەوە سەر دکتۆر مادلنر، بەڵام بە یارمەتیی بەرپرسی بێهۆشی کە بە شێوەی کاتی نەخۆشەکەی جێهێشتبوو و دوو کەس لە ژنەکان "زائربروخ" کە خەریك بوو دەست و لاقی دەوەشاند و هەوڵی دەدا کە خۆی رزگار بکات، لە ژووری نەشتەرگەری هێنایە دەرەوە و بەهۆی ئەو دەنگ و هات و هاوارەوە کۆمەڵێك لە فەرمانبەران لەبەردەم ژوورەکە کۆ بوونەوە.

دکتۆر مادلنر روو لە فەرمانبەرانی نەخۆشخانە کە هاتبوونە یارمەتی، وتی ئێوە راگیری بکەن کە دیسان نەگەڕێتەوە بۆ ژووری نەشتەرگەری هەتا ئێمە فریای ئەم ژنە نەخۆشە بکەوین و لە مەرگ رزگاری بکەین. دوکتۆر مادلنر و بەرپرسی بێهۆشی و ژنەکان، گەڕانەوە ژووری نەشتەرگەری و هەردوو پەراسووی نەخۆشە شێرپەنجەییەکەیان خستەوە جێی خۆی و برینەکەیان بەستەوە و بردیانە ژووری حەسانەوە، بەڵام سەرەڕای ئەوەی کە نەشتەرگەریی دەرهێنانی پێکهاتە شێرپەنجەییەکە بە سەرکەوتووییەوە ئەنجام درابوو، بەڵام بەهۆی زەربەیەك کە لەبەر برینەوەی دوو پەراسووی وێکەوتبوو، ئەو ژنە نەخۆشە گیانی لەدەست دا.

رووداوێك کە ئەو رۆژە رووی دا، لە پیاوێکی وەك "زائربروخ" کە لەسەرەخۆ بوون و ئارامی لە کاتی ئەنجامدانی نەشتەرگەریدا سەرباشقەی نەشتەرگەرانی لاو و تەنانەت هەندێ لە نەشتەرگەرانی

لاو و تەنانەت هەندێ لە پزیشکانی بەساڵاچوو بوو، زۆر سەیر دەهاتە بەرچاو و ئەو رۆژە دکتۆر مادلنر و دکتۆر "سرایذ" بەرپرسی بێهۆشی بڕیان لەوە کردەوە کە دەبێ "زائربروخ" ببرێتە تیمارستان (شێتخانە) چونکە شێتێکی راستەقینەیە.

پێشتر چەندین جار هاتبووە پێشەوە و ئەو ژن و پیاوانەی کەلە ژووری نەشتەرگەری یاریدەدەری "زائربروخ" بوون، بە بینینی حاڵ و رەوشی نەخۆش حەپەسابوون و لەلایان ببووە یەقین کە نەخۆشەکە دەمرێت، بەڵام لەو ژووری نەشتەرگەرییە تەنیا یەك کەس ئارام و لەسەرەخۆ بوو کە ئەویش "زائربروخ" بوو، بەبێ سەرنجدان بە ترس و دڵەڕاوکێی یاریدەدەرەکانی درێژەی بەکاری نەشتەرگەریی خۆی دەدا و هیچ رووداوێکی چاوەڕوان نەکراو لەسەرەخۆیی هێوریی ئەو پزیشکەی نەشڵەژاند و هۆشی تێك نەچوو.

زۆر جار "زائربروخ" کە سەرقاڵی نەشتەرگەری بوو بەهۆی تۆفان و هەورە برووسکەوە دەرەوە دەبریسکایەوە و هەور دەیشریخاند و پاشان باران بەخوڕ دادەباری، بەبێ ئەوەی کە "زائربروخ" تەنانەت بۆ جارێکیش سەری هەڵبێنێ و چاوێك لە پەنجێرەی ژوورەکە بکات و سەرنجی دەرەوە بدات، درێژەی بە کاری نەشتەرگەری دەدا.

کەوایە دەتوانین لێکی بدەینەوە ئەو کەسانەی کە هەمان رۆژ، لە ژووری نەشتەرگەرییەکە، هێرشی "زائربروخ" بۆ سەر دکتۆر "مادلنر"یان بینی و لە دەرەوەی ژوورەکەش کاتێك شێوازی دەست و پا وەشاندن و هاوار و دادی ئەویان بینی، دەبێ تووشی چ سەرسووڕمان و حەپەسانێك بوویێتن؟

## داهێنانی ماساژ و شێلانی دڵی بێ جووڵە

لە مێژووی ژیانی پسپۆڕانەی "زانربروخ"دا زۆرن ئەو دیاردە سەیرانەی کە دەربڕی ئەوپەڕی لەسەرەخۆیی و هێمنیی ئەو پیاوەن لە کاتی نەشتەرەگەریدا و لێرەد تەنیا ئاماژە بە یەکیان دەکەین، چونکە ئەو رووداو و دیاردانە لە مێژووی نەشتەرگەری و پزیشکیدا تۆمار کراون و بوونەتە بنەما و شێوازێکی تازە لە دەرمانکردن و بەتایبەت لە نەشتەرگەریی دڵدا، دوای "زانربروخ" نەشتەرگەر و پزیشکانی دیکەش لە کاتی پێویستدا ئەو شێوازەیان بەکار هێنا و ئەمڕۆکەش هەر بەکاری دەهێنن.

دوای ئەوەی "زانربروخ" نەشتەرگەریی دڵی بۆ یەکەم جار داهێنا، کۆمەڵێك لە پزیشك و نەشتەرگەرانی ئەورووپا و ئەمریکا، نەتەنیا مەیل، بەڵکوو هیوای ئەوەیان دەخواست کەلە کاتی نەشتەرگەریی لەسەر دڵ پێکەوە کۆ ببنەوە و ئامادە بن و لە نزیکەوە ببینن کە ئاخۆ ئەو مامۆستایە چ دەکات؟ ئەوکات هێشتا تەلەفزیۆن دانەهاتبوو، هەتا ئەوەی نەشتەرگەرەکان کاری نەشتەرگەریی "زانربروخ" لە رووی شاشەی تەلەفزیۆنەوە ببینن، بەڵکوو بۆ بینینی نەشتەرگەری ناچار بوون لە تەلار و شوێنی نەشتەرگەرییەکە ئامادە بن و لە نزیکەوە چاو لە شێوەی ئەنجامدنی ئەو نەشتەرگەرییە بکەن. لەبەر ئەوەی ژمارەی ئەو پزیشکانەی کە بۆ بینبینی نەشتەرگەرییەکە ئامادە بوون زۆر بوو، (دکتۆر حیجازی یاریدەدەری ئێرانیی "زانربرووخ" رێژەی ئەو پزیشکانەی نزیك بە پێنج سەد کەس مەزەندە کردووە) بۆ ئەو کارە هۆڵێکی شانۆییان دەست نیشان کرد و هەروەك دەزانین هۆڵەکانی تیاتر خڕن و شوێنی دانیشتنیش یەك لەسەر یەك ڕێك خراوە، هەر بۆیە هەموو ئەو کەسانەی کەلە تەلارەکە ئامادە دەبن، دەیانتوانی ناوەندی تەلارەکە ببینن.

لەناو ئەو نەشتەرگەرانەی کە رۆژی نەشتەرەگەرییەکە لەو هۆڵە ئامادە بوون، پزیشکە ئەمریکاییەکانیش هەبوون کە بۆ بینینی ئەو کارە لە ئەمریکاوە هاتبوون و لەبەر ئەوەی هۆڵەکە گەورە و بەرین بوو، زۆربەیان لە رێگای کامیراوە چاویان لە نەشتەرگەرییەکە دەکرد هەتا بە جوانی شێوازی کاردکە ببینن. لەناو هۆڵەکە بڵێندگۆیان دامەزراندبوو ئەم کارە بۆ ئەو سەردەمە کارێکی تازە بوو و راپۆرتی پزیشك و یاریدەدەرانی "زانربروخ" لە رێگای ئەو بڵێندگۆوە بە ئامادەبوان دەگەیشت. کاتێك کاری نەشتەرگەری دەستی پێکرد، بە چەشنێك بێدەنگی هۆڵەکەی داگرتبوو،

لەوە دەچوو بلێی کەسی تێدا نیە و تەنیا تـەنیا ئـەو راپۆرتانـەی کـە بـە "زاتربـروخ" دەدران لـە بلێندگۆکەوە دەگەیشتە گوێ و دەزانین ئەو راپـۆرت و زانیاریـیانـەش پێوەنـدییان بـە دۆخـی دڵ و هەناسەی نەخۆشوزو بوو کە بێهۆشـیان کردبوو.

"زاتربروخ" بەپێی شێواز و وردیەك کە هەیبوو هیچ سەرنجێکی بە دەورووبەری نەدەدا و تەنیا و تەنیا شوێنی نەشتەرگەرییەکەی دەبینی و لەو کاتەوە کە کاری نەشتەرگەرییەکە دەستی پێکردبوو تەنانەت بۆ جارێکیش سەری هەڵنەهێنا و چاوی لە حەشیمەتی ئامادەی ناو هۆڵەکە نـەکرد، لـەو بێدەنگییەدا کە هۆڵەکەی داگرتبوو بێجگەلە دەنگی بلێنگۆکە، ئەگەر باڵندەیـەك لـەو فەزایـەدا هەڵفڕیبا دەنگی باڵەکانی دەهاتە گوێ، لەناکاو پزیشکی بەرپرس و چـاودێری دۆخـی نەخۆشـەکە وتی: دڵی نەخۆش لە لێدان کەوتووە و دەنگی لە بلێـنگۆکەوە گەیشتە گوێی هەموو ئەوانەی کە وا لەناو هۆڵەکە ئامادە بوون. کاری سـەرەکیی دڵ وەك گەیەنـەری سـەرەکیی و ناوەنـدی جەسـتە بـۆ گەیاندنی خوێن بە شوێنە جیاجیاکانی لەش، ئەوەیـە کـە پـاش ماوەیـەکی کـورت، بەشـێك لـە خانەکانی لەش بەهۆی نەخواردنی خۆراك کە هەستیارتر لە بەشەکانی دیکەن، خۆێنیان پێناگات و دەمرن. جیا لە پەمپی سەرەکیی جەستە لە پێکهاتەی لەشی مرۆڤ، پەمپی دیکەش بـۆ گەیانـدنی خوێن بە بەشەکانی دیکەی جەستە هەن و دیواری هەر سـوورەدەمار (خوێنبـەر)ێـك بـە درێـژایی جەستە، بە بەردەوامی کرژ و خاو دەبێتەوە و مەبەست لەو جووڵـە و جەرەکەتـە پـەمپ ئاسـایە ئەمەیە کە خوێن لە سوورەدەمارەوە تێپەڕێت و بگاتە رەگە موونیبیەکان کـە لقـە بـچووکەکانی "سـوورەدەمار"ن و لـە رێگـای دەمـارە موونیبیەکانـەوە، خانـەکان خۆراکیـان پـێ بگـات و پێکهاتەکانی خوێن کاتێك گەیشتنە خانەکان هەر بەو چەشنـەی کە دایـك، مـەمك دەخاتـە دمـی منداڵی شیرەخۆرەوە، مەمك دەخەنە زاری خانۆچکەکانەوە هەتا خۆراك بخۆن، سەرەڕای ئـەوەی لـە جەستەی مرۆڤدا بۆ گەیشتنی خوێن بە بەشە جیاجیاکـان پـەمپ و خوێنبـەری جۆراوجـۆر هەیـە، هەرکە گەیەنەری سەرەکی، واتە دڵ لە لێدان بکەوێ، گەیەنەر و پەمپەکانی دیکەش لەکار دەکەون و خوێن لە دەمارەکانەوە تێناپەڕێ هـەتا بگاتـە دەمـارە موئینییـەکان هـەتا لـەوێ لـە رێگـای پێکهاتەکانی خوێنەوە، مەمك بخەنە زاری خانۆچکەکانەوە، سەرەنجام زۆر ناخایەنێ بەرلـە هـەموو هەستیارترین خانەکانی لەشی مرۆڤ کە خانەکانی مێشکن، لە برسێتیدا دەمرن.

کاتێك نەشتەرگەرانی ئامادە لە هۆڵەکە، تێگەیشتن کە دڵـی نەخۆشـەکە لـە لێـدان کـەوتووە، پێشبینیان کرد کە هەتا چەند خولەکی دی، یەکەم نیشانەی مەرگ کە مردنی خانەکانی مێـشکە، لە لەشی نەخۆشدا دەردەکەون. "یۆرگن تۆروالت"ی ئەڵمانی نووسەری ئەم سەربوردە راسـتەقینەیە

دەنووسێت لەناو ئەو پزیشکانە کەسانێك بوون کە پاش ئاگادار بوون لە راوەستانی دڵی نەخۆشەکە رازی و خۆشحاڵ بوون، چونکە راوەستانی دڵی نەخۆش دەربڕی ئەوە بوو کە "زانربروخ" لە کاری نەشتەرگەریی خۆیدا کە ئەو هەمووە لە دنیای پزیشکی و نەشتەرگەریدا ناوبانگی بەدەست هێنابوو، شکستی هێناوە.

ئەوکاتە لەناو ئەو کەسانەی کە خوازیاری شکست هێنانی "زانربروخ" بوون، لەوانەیە تاقە کەسێکیش نەبێ کە سەرکەوتنی خۆی (شکستی زانربروخ) بە یەقین نەزانێ، چونکە دەیانزانی راوەستانی دڵ لە نەشتەرگەریدا بەرامبەرە لەگەڵ مەرگی نەخۆش، بۆیە هەندێکیان زۆمی کامیراکانیان کە هەتا ئەوکاتە بڕیبووە شوێنی نەشتەرگەرییەکە وەلا نا و خۆیان ئامادە کرد کە پاش راگەیاندنی مەرگی نەخۆش هەستن و لە هۆڵەکە وەدەرکەون و بەو متمانەوە کە دڵ هەمان ئەندامی کەشف نەکراوە لە کردەی نەشتەرگەریدا و هیچکات ئەو کارە نەکراوە و ناکرێت، بگەڕێنەوە بۆ شوێنی کارەکانی خۆیان. ئەگەر لەباتی "زانربروخ" هەر کەسێکی دیکە بیایە و لەو کۆبوونەوە گەورە تاقیکارییە گوێی لێ ببایە و چاوی لێکردبا کە دڵی نەخۆش لە لێدان کەوتووە، خۆی دەدۆڕاند و دەیزانی کە لەو کاتەدا بە هیچ دەرمانێك دڵی بێ جووڵە ناکەوێتەوە کار.

چونکە دەرمان کاتێك لەسەر جەستە کاریگەرە کە خوێن لەناو جەستە لە گەڕاندا بێت و جەریانی خوێن دەرمانەکە بگەیەنێتە ئەو شوێنەی کە پێویستیەتی و کاتێك دڵ لە جووڵە کەوت و خوێن لە گەڕان وەستا، ئیتر بەکارهێنانی دەرمان، بێ کەڵکە. بەڵام "زانربروخ" خۆی نەدۆڕاند هەر بەو چەشنەی کە سێو یان هەرمێیەك بەدەستەوە دەگرن، دڵی نەخۆشی بەدەستەوە گرت، بە جۆرێك بە ناولەپ و قامکەکانی دەوری گرت و دەست کرد بە گوشین و باشتر وایە بڵێین دەستی کرد بە ماساژدانی. بەڵام نەك بە شێوەی تایبەت، بەڵکوو جۆرێك دڵەکەی ماڵشت دەدا کە زەختی دەستی لەسەر دڵی نەخۆشەکە چەشنی هەمان زەخت بێت کە حەرەکەتی سروشتیی دڵ ئەنجامی دەدا، هەر بەو چەشنەی دڵ لە هەر خولەکێکدا ٧٢ جار لێی دەدا "زانربروخ"یش لە هەر خولەکێکدا ٧٢ جار دڵی نەخۆشەکەی دەگوشی دیسان رەهای دەکرد هەتا ئەوەی کە ماساژەکە چەشنی کرژ و خاو بوونەوەی سروشتیی دڵ کاریگەر بێت.

لە هیچکام لە بەڵگە پزیشکی و نەشتەرگەرییەکاندا کەلە رابردووە بەجێماون، ئاماژە نەکراوە کە کەسێك بەرلە "زانربروخ" دڵێکی لە کار کەوتە لە رێگای ماڵشت و ماساژەوە بخاتەوە کار، هەربۆیە "زانربروخ" یەکەم کەس بوو کەلە مێژووی نەشتەرگەریی جیهاندا دەستی دایە ئەمکارە. بۆ ماوەی سێ خولەك "زانربروخ" لەوپەڕی بێدەنگیی هۆڵەکەدا سەرقاڵی ماڵشتی دڵی بێجووڵەی

نەخۆشەکە بوو. پاش سێ خولەك کە خەریکی مالشتی دڵ بوو، لەناو دەستی هەستی بە گیان وەبەردا هاتنەوەی دڵی نەخۆشەکە کرد و دەستی خۆی گوشی و دڵی نەخۆشەکەی دانایەوە شوێنی خۆی و دەنگی دکتۆری بەرپرس و چاوەدێری دۆخی نەخۆشەکە لە بلێندگۆکەوە بەرز بۆوە کە دڵی نەخۆشەکە کەوتەوە لێدان. ئەگەر وا ببایە و دڵی نەخۆش، یەك یان ئەوپەڕەکەی دوو خولەکی دیکە نەکەوتبایەتەوە کار، خانەکانی مێشکی بەهۆی نەگەیشتنی خۆراك دەمردن و ئیتر "زانربروخ" نەیدەتوانی ئەو نەخۆشە زیندوو بکاتەوە. چونکە لەو سەردەمەدا خانەکانی مێشك پاش پێنج خولەك دوای پچران و راوەستانی گەڕانی خوێن دەمردن و ئەمڕۆکە ئەو ماوەیە نەختێ زیاد بووە و بەهۆی زانست و تەکنیکی نوێی نەشتەرگەری خانەکانی مێشك هەتا هەشت خولەك و بەپێی تیۆریی هەندێ لە نەشتەرگەرەکان هەتا دە خولەك دوای راوەستانی جەریانی خوێن زیندوو دەمێننەوە، بەڵام پاش ئەو ماوەیە مەرگیان بێ ئەملا و ئەولایە و دوای ئەوەی کە خانەکانی مێشك مرن، هیچ دەسەڵاتێکی زانستی و تەکنیکی ناتوانێ پێش بە مەرگی نەخۆش بگرێت.

داهێنانی ئەو رۆژە کە بووە هۆی ئەوەی دڵی نەخۆش بکەوێتەوە کار، بوو بە سەرکەوتن و داهێنانێکی دیکەی نەشتەرگەریی "زانربروخ" و ئەو داهێنانەش بە حەزووری نوخبە و نەشتەرگەرانی دنیا، لە زانستی پزیشکیدا بووە بنەما و سەرچاوەی شێوەیەکی دەرمانی نوێ و هەتا ئەمڕۆکە لەلایەن نەشتەرگەرانەوە، لە کاتی پێویستدا، بەکار دەهێنرێت و ئەو رۆژەش "زانربروخ" لەسەرەخۆیی و هێمنیی خۆی بە چەشنێك کە ناویانگی جیهانیی هەبوو، بە تەواوەتی سەلماند. ئەمڕۆ لە زانستی نەشتەرگەریدا، ماساژی دڵ، بۆ وە جووڵە خستنی، بۆتە شێوازێکی کلاسیك و ئیتر بۆ هیچکەس سەرنجڕاکێش نیە، بەڵام ئەوکات کە "زانربروخ" بۆ یەکەم جار دڵێکی بۆ ماساژ بەدەستەوە گرت، ئەو کارە بە چەشنێك نائاسایی و وەك داهێنان دەهاتە ئەژمار بە جۆرێك لەناو ئەو پزیشکانەی کەلە هۆڵەکە ئامادە بوون، تەنانەت کەسێکیش نەبوو کە کارەکەی "زانربروخ" بە کردەوەیەکی شێتانە لە قەڵەم نەدات یەك کەس لەوانیش کە هەموویان پسپۆڕ بوون پێشبینییان نەدەکرد لەوانەیە دڵی بێجووڵەی نەخۆش بکەوێتەوە کار.

ئەو رۆژە "زانربروخ" بە داهێنانێك کەلە دونیا بێوێنە بوو، مردوویەکی زیندوو کردەوە و لەوانەیە وا بیر بکەینەوە کە دوای ئەو داهێنان و سەرکەوتنە بە خۆیدا نازیوە و فەخری بەسەر خەلکانی دیکەدا کرد. بەڵام هیچ لە کردار و رەفتاری "زانربروخ"دا هیچ گۆڕانکارییەك بەدەی نەکرا و دەرکەوت تەنانەت زیندوو کردنەوەی مردووش، ناتوانێ ئارامی و پشوودرێژیی ئەو پیاوە بشێوێنێ. لەبەر ئەوەی لەبارەی هێمنیی رۆحی "زانربروخ"ەوە قسەمان کرد، لەوانەیە وا بیر

بکرێتەوە کە ئەو لە دەرەوەی ژووری نەشتەرگەریش کەسێکی کەمتەرخەم بووە، بەڵام بیرەوەریی هاوکارانی "زائربروخ" دەریدەخات ئەو پزیشکە گەورەیە، لە ژیانی ئاساییدا پیاوێکی کۆمەڵایەتی و کەسێکی لە دڵەوە نزیك و دڵۆڤان و خۆشرەفتار بووە و هیچکام لە پەرستار و پزیشکەکان لە کاتە ئاساییەکان کەلە ژووری نەشتەرەگەری نەبووە، هیچ کەمتەرخەمییەکیان لێ نەبینیوە، چ بگات بە ناوچاوتاڵی و تووڕەیی.

لە جەریانی شەڕی دووەمی جیهانیدا "زائربروخ" لە بەرلین نەڕۆیشتە دەر و کاتێك ئەرتەشی سووری دەوڵەتی یەکیەتیی سۆڤیەت گەیشتە بەرلین و ئەو لە هەمان نەخۆشخانە کە دوای دابەش کردنی بەرلین، بەشێك بوو لە دامەزراوەکانی بەرلینی ڕۆژهەڵات، درێژەی بەکار دەدا. ئەرتەشی دەوڵەتی یەکیەتیی سۆڤیەت کاتێك گەیشتە بەرلین بە چل هەزار تۆپەوە ئەو شارەی دایە بەر هێرش کە دەیان هەزار تۆپ تەنیا بەرەو خودی شاری بەرلین هاوێژران، بەڵام لەو سەردەمەشدا "زائربروخ" لە هەمان نەخۆشخانە کە شوێنی کارەکەی بوو لە ٢٤ کاتژمێری شەو و ڕۆژدا تەنیا یەك یان دوو کاتژمێر ئەویش بەدەگمەن دەخەوت و نەدیدەتوانی دوو کاتژمێری بەردەوام بخەوێت، چونکە بێ ڕاوەستان بریندارەکانیان دەهێنایە نەخۆشخانە. لە ژوورەکەی "زائربروخ" سێ قەرەوێڵەیان دانابوو و ئەو نەشتەرگەرە بلیمەتە لەسەر هەر سێ قەرەوێڵەکە نەشتەرەگەریی ئەنجام دەدا.

ڕۆژی کۆتایی مانگی ئاوریلی ساڵی ١٩٤٥ی زایینی "هیتلەر" سەرۆکی دەوڵەتی ئەڵمانیا لە بەرلین خۆی کوشت، بەڵام شەڕی بەرلین بە خۆکوژیی هیتلەر کۆتایی پێنەهات و لەو کاتەوە هەتا ڕۆژی هەشتەمی مانگی مەی، شەو و ڕۆژ بێ ڕاوەستان لە بەرلین، لە نێوان سەربازە ئەڵمانییەکان و هێزەکانی ئەرتەشی یەکیەتیی سۆڤیەت درێژەی هەبوو و بەردەوام سەربازە بریندارەکانیان دەهێنایە نەخۆشخانە و "زائربروخ" نەشتەرگەریی بۆ دەکردن. "زائربروخ" لە کۆتایی مانگی ئاوریلەوە هەتا ڕۆژی نۆیەمی مانگی مەی، لەوانەیە نەیتوانیبێ نیو کاتژمێر بخەوێت، گەرچی شەڕی بەرلین ڕێکەوتی ٨ی مەی ساڵی ١٩٤٥ بە ڕاگەیەندراوی دەریاساڵار "فەن دونیتز" کە سەرۆکی دەوڵەتی ئەڵمانیا بوو بەبێ مەرج تەسلیم بوو و بەو شێوەیە کۆتایی پێهات، بەڵام "زائربروخ" هەتا ڕۆژی نۆیەم نەیتوانی بخەوێ، چونکە بە لێشاو بریندارەیان دەهێنایە نەخۆشخانە.

لە یەکێك لە ڕۆژەکانی دەسپێکی مانگی مەی کە شەڕ لە بەرلین بەردەوام بوو، سەربازانی سوپای یەکیەتیی سۆڤیەت چوونە ژوورێکەوە کە "زائربروخ" بە ڕووپۆشێکی سەراپا خوێناوییەوە سەرقاڵی نەشتەرگەریی سەربازە بریندارەکان بوو. "زائربروخ" نەیدەزانی کە سەربازانی یەکیەتیی

سۆڤیەت هاتوونەتە ناو نەخۆشخانەکەوە و تەنانەت ئەو رۆژانەش کە جەنگ لە خودی شاری بەرلین درێژەی هەبوو، دەنگی گرمەی نەبڕاوەی تانك و تۆپەکانی گوێ لێنەبوو و بە هیچ شێوەیەك لەبیری گیان و رزگارکردنی خۆیدا نەبوو.

رەوشی "زائربروخ" لە ژووری نەشتەرگەری، کاتێك سەربازەکانی یەکیەتیی سۆڤیەت چوونە ناو ژوورەکەوە لە شێواز و روخساردا وەك "ئەرشمیدس" حەکیم و بیرکاریزانی ناسراوی یۆنـانی دەچـوو کە سالّی ۲۱۲ی بەرلە زایینـدا دەژیا، لە شاری "سـیراکوز" هەڵکەوتوو لە نزیك شاری "سیـسـیل" کاتێك سـەربازە هێرشبەرە رۆمییەکان رۆیشتنە ناو مالّەکەیەوە و ئەویان بینـی کـە لەسـەر عـەرز دانیشتووە و فۆرمێکی هێندەسیی لە بەرامبەر خۆی داناوە و سەرقالّی لێکدانەوەیـە لەسـەر ئـەو فۆرمە، سـەربازە رۆمییەکان کەلە کەمتەرخەمیی ئەو بیرمەندە وەزالّە هـاتبوون ئـەویان کوشـت و خوێنی "ئەرشمیدس" رژایە سەر فۆرمە هێندەسییەکە. بـەلاّم سـەربازەکانی یەکیـەتیی سـۆڤیەت دوای ئەوەی کە چوونە ناو ژووری نەشتەرگەرییەکەوە و "زائربروخ"یـان بـە سـەراپا خـوێن بینـی، نەیانکوشت و "زائربروخ" درێژەی بەکاری خۆی دا. ئاماژەکردن بەم راستییە بێجێ نیە کە کاتێـك سەربازانی یەکیەتیی سۆڤیەت گەیشتنە بەرلین و لەوە گەیـشتن کـە پایتـەختی ئـەلّمانیا توانـایی خۆڕاگریی نیە، کۆمەلّێکی بەرچاو لە پزیشك و نەشتەرگەرانی بەرلین بەرەو رۆژئاوا هـەلاّتن، بـەلاّم "زائربروخ" هەڵنەهات و ئەرکی نەشتەرگەریی خۆی لەبیر نەکرد و هەموو ئەو کەسـانەی کـە ئـەو رۆژە هێرشی "زائربروخ"یان بە کێردی نەشتەرگەری بۆ سەر دکتـۆر "مـادلنر" بینـی و ئاگـاداری پێشینە و رابردووی هێمن و پشوودرێژیی ئەو پیاوە بوون، لەو رووداوە زۆر سەریان سووڕ ما.

## زانربروخ لەلایەن ئەوانەی بەسەر بەرلیندا سەرکەوتن پشتیوانیی لێکرا

دوای ئەوەی ئەرتەشی یەکیەتیی سۆڤیەت هاتە ناو شاری بەرلینەوە و ئەڵمانییەکان توانای بەرەنگارییان نەما، مارشاڵ (ژوکوف) کە ناو و ناوبانگی "زانربروخ"ی بیستبوو، پشتیوانیی لەو نەشتەرگەرە گەورەیە کرد. خوێنەرێك کە ئەم بابەتە دەخوێنێتەوە لەوانەیە پشتیوانی کردنی مارشاڵ ژوکوف لە "زانربروخ"ی بەلایەوە ئاسایی بێت. بۆیە لە چەند وشەدا دەڵێین کە مارشاڵ ژوکوف کێ بوو؟ "گیورکی ـ کونستان تی نویچ ـ ژوکوف" ئەوکات ئەفسەرێك بوو چل و نۆ ساڵە و سەرەڕای ئەوەی کە بەرپرسانی تەبلیغاتی دەوڵەتی یەکیەتیی سۆڤیەت سەرنجی تێبینییەکانی "ستالین"یان دەدا کە نەهێڵن "ژوکوف" زۆر گەورە بکرێتەوە (چونکە دیکتاتۆرەکان نایانەوێ خەڵك، کەس یان کەسانێکی دیکە بە مەزن لە قەڵەم بدەن و تەنیا حەز دەکەن هەموو سەرکەوتن و دەسکەوتێك بەناوی خۆیانەوە تۆمار بکرێت)، ئەو ئەفسەرە لەلای خەڵکی یەکیەتیی سۆڤیەت و سەربازانی ئەرتش خاوەن پێگە و کەسایەتییەکی بەرز و خودایی بوو. لەبەر ئەوەی (ژوکوف) لە سێ شەڕی گەورە بەدژی ئەڵمانییەکان کە هەرسێکیان چارەنووس ساز بوون، سەرکەوتنی بەدەستهێنابوو.

یەکەم شەڕ کە ژوکوف تێیدا سەرکەوتنی بەدەستهێنا، شەڕی مسکۆ بوو لە کۆتایی ساڵی ١٩٤١ و سەرەتای ساڵی ١٩٤٢دا رووی دا. ئەوکاتە ئەرتەشی ئەڵمانیای هیتلەری سەرەڕای پێشڕەوی لە خاکی یەکیەتیی سۆڤیەت گەیشتە ئاستێك کە ئەفسەرانی ئەڵمانی، بە کامیراکانیانەوە گومەزی کڵێساکانی مسکۆ پایتەختی یەکیەتیی سۆڤیەتیان دەبینی و پێیان وابوو لە ماوەی دو یان سێ رۆژدا شاریان پێدەگیرێ، بەڵام "ژوکوف" ئەرتەشی ئەڵمانیای لە دەوروبەری مسکۆ دوور خستەوە و پایتەختی یەکیەتیی سۆڤیەتی لە مەترسیی رووخان رزگار کرد.

شەڕێکی دیکە کە "ژوکوف" تێیدا سەرکەوتنی مسۆگەر کرد، شەڕی "ستالین گراد" بوو لە ساڵی ١٩٤٣ی زایینی و لەو شەڕەدا "ژوکوف" ئەرتەشی ئەڵمانیای لە شاری ستالین گراد گەمارۆ دا و هەموو سەرباز و ئەفسەرانی ئەو ئەرتەشەی بەدیل گرت و ئەو کەسانەی کەلە مێژووی شەڕی دووەمی جیهانی دەزانن، شکستی ئەڵمانیا لە شەڕی ستالین گراد، چارەنووسی شەڕی بە قازانجی یەکیەتیی سۆڤیەت و هاوپەیمانەکانیان و بە زەرەری ئەڵمانیا لە قەڵەم داوە.

سەرکەوتنی سێیەمی ژوکوف لە شەڕی بەرلیندا بوو و دوای ئەوەی سەرکەوتنی یەکیەتیی سۆڤیەت یەکلایی بۆوە، بەناوی ژوکوف کە سەردار و پیرۆزی یەکەمی ئەو شەڕە بوو، هەزار

کوللەی تۆپیان تەقاند و ژوکوف لە نێوان ئەفسەرانی یەکیەتیی سۆڤیەت، تاقە ئەفسەری پایەبەرز بووە کە بەناوییەوە هەزار گوللە تەقێنرا، ئەمە لە کاتێکدا بوو بۆ ئەفسەرانی دیکەی یەکیەتیی سۆڤیەت کە سەرکەوتنیان بەدەسهێناوە، لە ٣٢٤ گوللە زیاتریان نەتەقاندووە. پیاوێکی وەکوو ژوکوف ئەویش لە سەرەتای بەدەستهێنانی سەرکەوتندا لە بەرلین کە هەر رێبەرێکی سەرکەوتوو، دەبێ کاری زۆر ئەنجام بدات، "زاتربروخ"ی لەبیر بوو و پشتیوانیی لێکرد و دوای ئەوەی کە ناونیشانی ماڵەکەی دۆزییەوە بە زمانی رووسی تابلۆیەکی لەسەر دەرگای ماڵەکەی داکوتا کە لەسەری نووسرابوو "ئێرە ماڵی زاتربروخی مەزنە".

دوای ئەوەی بەرلین رووخا، رەوشی تفاق و ئازوخە بە تەواوەتی رووی لە خراپی کرد. لە پازدە رۆژی یەکەمی دوای رووخانی بەرلین، تەنانەت یەك گرەم ئازوخەش بە خەڵك نەدرا. لە تەواوی ئەو پازدە رۆژەدا ئەو کەسانەی کە ئازوخەیەکیان نەبوو، تەنانەت وادە خۆراکەکەیان نەخوارد و هەندێ لە برسییەکان کە لەباری جەستەییەوە بەهێز نەبوون، مردن و هەندێك بەهۆی برسێتییەوە چەشنێك بێهێز و توانا ببوون بڕستی جووڵەیان نەمابوو و لە شاری وێرانی بەرلین کە لەسەدا ئەوەدی بیناکانی بەهۆی بۆردومانی بەردەوامی هێزە ئاسمانییەکانی ئەمریکا و بریتانیاوە رووخابوو، هیچ شتێك بۆ خواردن وەچنگ نەدەکەوت. ئەوکاتە کۆمەڵێکی زۆر لە خەڵکی بەرلین نەتەنیا لە خۆراك و خواردن بێبەری بوون، بەڵکوو ئاوی خواردنەوەشیان نەبوو، لە کاتێکدا مانگی مەی بوو و هەر ساڵە لەو مانگەدا، هەموو جۆرە سەوزە و میوەیەك دەست دەکەوت، بەڵام ساڵی ١٩٤٥ لەو وەرزە بەهارییەدا تاقە سەوزەیەکی خۆراکیش لە بەرلین نەبوو.

بەڵام ئەفسەرانی ئەرتەشی یەکیەتیی سۆڤیەت بۆ زۆر زیاتر لە رادەی پێویستییەکانی "زاتربروخ" خۆراك و ئازوخەیان دەبردە ئەخۆشخانە و ماڵەکەی و "زاتربروخ" هەموو ئەو زیادە گۆشت، قەند و قاوە و قوتووە کونسێرڤانەی کە ئەفسەرانی یەکیەتیی سۆڤیەت بۆیان دەهێنا، لە نێوان فەراسانبەرانی ئەخۆشخانە، یان دراوسێیە برسییەکاندا دابەشی دەکرد. لە شاری وێرانی بەرلین لەو کاتەدا جیالە ئەفسەرانی یەکیەتیی سۆڤیەت تەنیا یەك کەس ترۆمبێلی هەبوو، ئەویش "زاتربروخ" بوو و رووسییەکان ترۆمبێلێکی مارك "ئۆپێل" لەو جۆرە ترۆمبیلانەی کەلە هەموو شوێنێك دەستیان بەرسەدا گرتبوو دابوویان بە "زاتربروخ" و هەروەها بڕێك بەنزینیان وەك جیرە بۆی لەبەرچاو گرتبوو کە پێی دەدرا.

دوای ئەوەی بەرلین رووخا و سەرکەوتنی یەکیەتیی سۆڤیەت یەکلایی بۆوە، ئەو دەوڵەتە کۆمەڵێك لە بیرمەند و تەکنیکارانی ئەڵمانیای رەوانەی یەکیەتیی سۆڤیەت کرد هەتا لەوێ سەرقاڵی کار بن. دەوڵەتی یەکیەتیی سۆڤیەت تەنیا بە راکێشانی ئەوانەی پسپۆرایەتییان هەبوو

نەوەستا، بەڵکوو لە رشتە زانستی و پسپۆڕییەکانی دیکەش کەسانی بەرجەستە و ناسراوی روانەی ئەو وڵاتە کرد. لەناو ئەوانەی کە لەلایەن دەوڵەتی یەکیەتیی سۆڤیەتەوە وەردەگیران، ئەگەر بە مەیلی خۆیان وڵاتیان بەجێ نەهێشتبا و بۆ کار روویان لە یەکیەتیی سۆڤیەت نەکردبا، لەو بارودۆخەدا و لەرووی ناچاری و بۆ درێژەی ژیان رێگای ئەو وڵاتەیان دەگرتە پێش، چونکە لە ئەڵمانیای شکست خواردوو و داڕووخاودا پاش شەڕی دووەمی جیهانی نەتەنیا هەر نازوخە، بەڵکوو هیچ پێداویستییەکی ژیان دەست نەدەکەوت و تەنانەت جووتێك پێڵاویش بۆ فرۆش بەدی نەدەکرا، مەگەر لە بازاری رەش و ئەویش بە نرخی زۆر گران. بارودۆخەکە بە لەونێ بوو کە پێشبینی ئەوە نەدەکرا لە داهاتوویەکی دووریشدا ئەو وڵاتە بتوانێ لەژێر باری ئەو گرفت و گرانییانە پشت راست بکاتەوە.

یەك لەو کەسانەی کە دەوڵەتی یەکیەتیی سۆڤیەت دەیهەویست روانەی ئەو وڵاتەی بکات و لەوێ بژی، زائربروخ بوو. رۆژێکیان ژێنەراڵ پڕۆفیسۆر "ویسنسکی" سەرۆکی رێکخراوی تەندروستیی ئەرتشی یەکیەتیی سۆڤیەت بۆ دیداری "زائربروخ" سەردانی نەخۆشخانەی کرد و پاش گەیشتنی وتی: بەردەوام ئاواتم ئەوە بووە بتوانم دیدارتان بکەم و ئێستا کە ئەو ئاواتەم هاتۆتە دی، شانازیمە کە سڵاوی گەرمی مارشاڵ "ژۆکوف"تان پێ رابگەیەنم. چونکە هەموو ئەو پزیشك و نەشتەرگەرانەی لە ئەرتشی ئێمەدا کار دەکەن هیوای ئەوەیان هەیە لە نزیکەوە بتانبینن، داوا دەکەم ئەگەر ئیمکانی هەیە بۆ دیدارێك لەگەڵیان رۆژێك دیاری بکەن و "زائربروخ"یش دوو رۆژ دواتری بۆ ئەو چاوپێکەوتنە دەست نیشان کرد و لە رۆژی دیاریکراودا کۆمەڵێك لە ئەفسەرانی یەکیەتیی سۆڤیەت کە هەموویان پزیشك بوون و لە بەشی تەندروستیی ئەرتشی سووردا سەرقاڵی کار بوون، بۆ دیدار لەگەڵ "زائربروخ" سەردانی نەخۆشخانەیان کرد و بە رێزگرتن لە ئوستاد هەموویان بە ریز راوەستان و "زائربروخ" وەکوو ئەفسەرێکی پایەبەرز کە سان لە ئەفسەرانی دیکە دەبینێ لە بەرامبەریانەوە تێپەڕی و لەگەڵ یەکە بە یەکەیان تەوقەی کرد.

ئەمڕۆکە دەزانین رێکخستنی ئەو رێوڕەسمانە لەلایەن ژێنەراڵ پڕۆفیسۆر "ویسنسکی"یەوە بۆ ئەوە بوو کە باوەڕ بە هەستی خۆپەرستیی "زائربروخ" بێنێ، هەرچەند ئەو نەشتەرگەرە بلیمەتە، خۆگر و خۆبەزلزان نەبوو، بەڵام ئاخۆ لە جیهاندا کەسێك پەیدا دەبێ کە لانیکەم تۆزقاڵێك هەستی خۆپەرستیی نەبێت؟ ئایا نازانین تەنانەت خاکەڕاترین کەسەکان، لە کاتی قسەکردندا ئەگەر بێت و لاتاو و سەرزەنشتێکیان گوێ لێ بێت کە پێوەندیی بە گۆشەیەك لە ژیانی ئەوانەوە بێت، دڵیان دەڕەنجێت، یان ئەگەر تاریفیان بکرێت شاد دەبن؟ ئاخۆ ئەوەمان ئەزموون نەکردووە کە ئەگەر تۆزقاڵێك حاشا لە توانایی و پسپۆڕایەتیی خاوەن پیشەیەك بکرێت، ئەو کەسە چۆن دڵی

دەرەنجێت؟

ئەو تۆران و دڵێشانە بەرەنجامی هەستی خۆپەرستییە، کەوایە لەناو مرۆڤەکاندا کەسێك پەیدا نابێت کە خۆپەرست نەبێت، مەگەر ئەو کەسانەی کە لەباری بیر و زەینەوە کەسێکی ئاسایی نین. "زائربروخ"یش مرۆڤێك بوو و سەرۆکی تەندروستیی ئەرتشی سوور دەیهەویست هەستی خۆپەرستیی کەم بکاتەوە هەتا بتوانێ ناچار بە قبووڵ کردنی پێشنیارەکەی بکات.

دوای ئەوەی بارودۆخی بەرلین پاش ڕۆژانی یەکەمی رووخانی ئەو شارە ئارام بۆوە، چەند کەس لە ئەفسەرانی ئەرتش کە بەهۆی نەخۆشی پێویستییان بە نەشتەرگەری بوو، لە ڕێگای سەرۆکەکەیانەوە نێردرانە لای "زائربروخ" و ئەویش کاری نەشتەرگەریی بۆ ئەنجام دان، بۆیە ژێنەراڵ پرۆفیسۆر "ویسنسکی" بۆ سەردان و دیدار لەگەڵ "زائربروخ" دەرەفەتی زۆری هەبوو. ناوبراو لە یەکێك لەو دیدارانەدا پێشنیاری پێکرد کە بۆ کارکردن بڕواتە مسکۆ و وتی دەوڵەتی یەکیەتیی سۆڤیەت لەوێ خانوویەك لە شار و ڤێلایەکی کوێستانیی پێی دەدات و ترۆمبێل و شۆفێری لە ئیختیار دەنێت و بڕە مووچەیەکیشی بە مەیلی خۆی و هەر ڕێژەیەك کە خۆی داوای بکات بۆی تەرخان دەکات.

"زائربروخ" لەوە ئاگادار بوو کە دەوڵەتی یەکیەتیی سۆڤیەت کۆمەڵێکی زۆر لە بیرمەند و فەرمانبەرانی پیشەیی و تەکنیکیی ئەڵمانیای بۆ لای خۆی ڕاکێشاوە و هەروەك دەنگۆ بڵاو بۆوە هەندێکیانی بە زۆرەملێ بردبوو. بۆیە پرسیاری لە سەرۆکی تەندروستیی ئەرتشی یەکیەتیی سۆڤیەت کرد کە ئاخۆ بۆ گواستنەوەی من لێرەوە بۆ مسکۆ بڕیارێك لەلایەن دەوڵەتەوە دەرکراوە. ژێنەراڵ "ویسنکسی" گوتی نا "گهیم رات". لەبەر ئەوەی گواستنەوەی من لێرەوە بۆ مسکۆ بە ناچاری و زۆرەملێ نیە، من بە باشی دەزانم هەر لێرە کار بکەم و ئەگەر بێت و گواستنەوەشم بکرێتە ناچاری وای بە باش دەزانم دەست لەکار بکشێنمەوە.

ئەم وتەیە کەلە بەشەکانی دیکەدا دێت، دواتر بوو بە بیانوویەك بۆ حکوومەتی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات هەتا ئەوەی زائربووخ لە کار وەلا بنێن. "ویسنسکی" وەڵامەکەی "زائربووخ"ی بردەوە بۆ "ژۆکوف" و ئەویش ئەو وەڵامەی گەیاندە مسکۆ هەتا بڕیار بدەن، وەڵامی مسکۆ ئەوە بوو کەلە "زائربروخ" گەڕێن کە هەروا لە بەرلین سەرقاڵی کار بێت و ژۆکوف کە قایمەقامی سەربازیی بەرلین بوو، "زائربروخ"ی بۆ پۆستی ڕاوێژکاری تەندروستیی بەرلین هەڵبژارد.

## تۆمەتێك كە ئەمریكاییەكان لە "زاتربروخ"یان دا

هەروەك دەزانین دوای ئەوەی بەرلین لەلایەن ئەرتەشی یەكیەتیی سۆڤیەتەوە داگیر كرا، ماوەیەك تێپەری هەتا ئەوەی ئەمریكاییەكان چوونە ناو بەرلینەوە. هاتنی ئەمریكاییەكان بۆ بەرلین بەهۆی دەسكەوتی سەربازی نەبوو، چونكە ئەرتەشی یەكیەتیی سۆڤیەت دوای ئەوەی بەرلینی داگیر كرد، هەتا سەد و شەست كیلۆمیتریی رۆژئاوای بەرلین هاتە پێش و دوایین سنووری پێشرەویی ئەرتەشی یەكیەتیی سۆڤیەت كە ئەمڕۆكە سنووری رۆژئاوای ئەڵمانیای رۆژهەڵات و سنووری رۆژهەڵاتی ئەڵمانیای رۆژئاوایە و هاتنی ئەمریكاییەكان بۆ ناو بەرلین، بەرەنجامی رێككەوتن و گفتوگۆ سیاسییەكان بوو كە پێش لە رووخانی بەرلین لە نێوان سەرانی دەوڵەتە سەركەوتووەكاندا لەسەری پێكهاتبوون. بەرلەوەی بەرلین داگیر بكرێت، سەرانی هاوپەیمانان بڕیارن دابوو دوای ئەوەی بەرلین داگیر كرا (جیالەوەی هەركەس داگیری بكات) چوار دەوڵەتی یەكیەتیی سۆڤیەت، ئەمریكا، بریتانیا و فەرەنسا بە هاوبەشی بەرپرسایەتیی ئیدارەی ئەو شارە بەدەستەوە دەگرن و هەركامەیان بەشێك لە بەرلین بۆ خۆی داگیر بكات.

بۆیە ئەمریكاییەكان دوای ئەوەی هاتنە ناو بەرلینەوە "زاتربروخ"یان بەوە تۆمەتبار كرد كە لەلایەن حكومەتی نازییەكانەوە پشتیوانیی لێكراوە. ئەوان وێنەیەكی "زاتربروخ"یان بە جلوبەرگی ژێنەراڵیی ئەرتەشی ئەڵمانیاوە كردە بیانوو و لە شۆرای هاوبەشی ئیدارەی بەرلین ئەویان لە پۆستی راوێژكاری تەندروستیی پایتەختی ئەڵمانیا وەلا نا.

هەربۆیە دوای ئەوەی بەرلین لەلایەن چوار دەوڵەتەوە داگیر و دابەش كرا، لەبەر ئەوەی "زاتربروخ" لە نەخۆشخانەی بەرلینی رۆژهەڵات كاری دەكرد و ئەو ناوچەیەش ناوچەی داگیركراو و ژێر دەسەڵاتی یەكیەتیی سۆڤیەت بوو، مارساڵ "ژوكوف" ئەوی وەك راوێژكاری تەندروستی دیاری كرد، بەڵام وێنەیەكی "زاتربروخ" بە جلوبەرگی ژێنەراڵیی ئەرتەشی ئەڵمانیاوە، هی كاتێك بوو كە ناوبراو لە كاتی خزمەتی سەربازیدا وەك ئەفسەری رێزێرڤی ئەرتەشی ئەڵمانیا كاری كردووە.

لە ئەرتەشی ئەڵمانیا ئەفسەرانی رێزێرڤ و ئامادە، وەكوو ئەفسەرانی دیكە پلەی سەبازییان پێدەدرا و لە ماوەیەكی دیاریكراو و پاش گوزەراندنی چەندین خول بەناوی (خولی راهێنانی

ئەفسەرانی ریزیرڤ) پلە و پۆستی بالاتریان پێ دەبەخشرا. دوای ئەوەی کە ئەرتەشی ئەڵمانیا لە شەری یەکەمی جیهانیدا، شەری بەجێهێشت، سیستەمی خزمەتی سەربازی لە ئەڵمانیا نەما و بەهۆی رێککەوتننامەی (ویرسای) کە لەلایەن دەوڵەتە سەرکەوتووەکانی ئەوکاتەوە بەسەر ئەڵمانیادا سەپا، ئەوەیان گونجاند کە ئەڵمانیا ئیدی لەمەوبەدوا سیستمی ئەرکی سەربازیی نامێنێ و بۆ پاراستنی ئەمنەیتی ناوخۆیی ئەرتەشێکی سەد هەزار کەسی لە سەربازانی خوازیار و مووچە بگیری هەمیشەیی پێك بهێنێ.

بەلام بەرلەوەی کە سیستمی ئەرکی سەربازی لە ئەڵمانیا هەڵبوەشێتەوە، "زائربروخ" کە (ئەفسەری ریزیرڤ) بوو چەندین پلەی لەو پۆستەی خۆیدا وەرگرت و کاتێك حکومەتی نازی لە ئەڵمانیا دەسەلاتی بەدەستەوە گرت و هیتلەر بوو بە سەرۆك رێککەوتننامەی "ویرسای" پێشێل کرد و سیستمی ئەرکی سەربازییە هێنایەوە گۆرێ و بە بریارێکی تایبەت بە کۆمەڵێك کەس و بۆ وێنە "زائربروخ" پلەی ژێنەراڵییان بەخشی کە پێشتر ئەفسەری ریزیرڤ بوون و هەر ئەوەش بووە هۆی تۆمەتێك کە ئەمریکاییەکان بەناوی هاوکاریی نازییەکان لە ناوبرایان دا، ئەمە لە حالێك دابوو دوای ئەوەی کە شەری سارد لە نێوان یەکیەتیی سۆڤیەت و ئەمریکا ساز بوو، ئەمریکاییەکان کەلکیان لە زانیاری و هاوکاریی کۆمەڵێك لە ئەفسەرانی پایەبەرزی ئەڵمانیا وەرگرت کە هەندێکیان تەنانەت هاوکاریی نازییەکانیان دەکرد.

***

خانمێك سەرەرای ئەوەی کە لەباری لەشساغییەوە بێ کێشە و کۆئەندامی زاوزێشی کامڵ و سووری مانگانەشی هەبوو، بەلام منداڵی نەدەبوو پێرەویی لە رێنوێنی ئاشنا و خزمەکانی کرد و سەدان نەخۆشخانەی "شاریتی" کرد. بەو ژنەیان گوتبوو هۆکاری نەزۆك بوونی ئەوەیە کە بەشێك لە کۆئەندامی زاوزێی نارێکە و ئەگەر بێت و ئەو بەشەی نەشتەرگەریی بۆ بکرێت، لەوەوە بەدوا منداڵی دەبێت. "زائربروخ" گوتبووی کە بە نەشتەرگەری دەکرێ ژنێك کە بەهۆی لار و نارێك بوونی بەشێك لە کۆئەندامی زاوزێی بۆتە کەسێکی نەزۆك، دەرمان بکرێت و سەرەنجام دەتوانێ ببێتە خاوەن منداڵ و دوای ئەوەی کە ئەو ژنە سەدانی نەخۆشخانەی شاریتی کرد، "زائربروخ" قبووڵی کرد کە نەشتەرگەریی بۆ بکرێت.

رۆژی نەشتەرگەرییەکەیان دیاری کرد و دکتۆر "مادلنر" یەکێك لە یاریدەدەرانی "زائربروخ" نەیدەویست لە ژووری نەشتەرگەری ئامادە بێت، بەلام دواتر بیری کردەوە کە بوونی ئەو لە ژووری نەشتەرگەری لەوانەیە بەکەڵك بێت و ئەگەر هات و دیسان "زائربروخ" تووشی بیرکورتی و

فەرامۆشی بێت، ئەو دەتوانێ پێش بە ئەنجام نەدانی نەشتەرگەری لەلایەن "زائربروخ"ەوە بگرێت. بەلآم دوای ئەوەی کە چووە ژووری نەشتەرگەرییەوە تێگەیشت کە "زائربروخ" هۆشی لەسەر خۆیەتی و بە باشی سەرقاڵی کارە.

وەك باوە، ئەو نەشتەرگەرانەی کە نەشتەرگەری بۆ ئەندامانی جیاوازی مرۆڤ دەکەن. نەشتەرگەریی کۆئەندامی ژنان دەسپێرنە نەشتەگەرە پسپۆڕەکان، بەلآم "زائربروخ" لە نەشتەرگەریی هەموو ئەندامانی لەشدا شارەزا و پسپۆڕ بوو وەدکتۆر "مادلنر" بینی ئەو پزیشکە بلیمەتە بە هەمان خێرایی کە نەشتەرگەری بۆ بەشەکانی دیکەی جەستە دەکات، نەشتەرگەریی بۆ کۆئەندامی ئەو ژنە ئەنجام دا و ژنەکەیان بۆ پشوودان لە ژووی نەشتەرگەری هێنایە دەر و پیاوێکیان هێنایە ژوورەوە و دەبوا نەشتەرگەری بۆ تومۆری پرۆستات (لکی ژێر میزڵدانی پیاوان)ی بکرێت.

"زائربروخ" بە هۆش و بیری کامڵەوە لە ژووری نەشتەرگەری هاتە دەرەوە و ژنێك لە فەرمانبەرانی نەخۆشخانە دەستەوانە پیسەکانی بۆ لەدەست داکەند و "زائربروخ" دەستەکانی شۆرد و جووتێك دەستەوانەی خاوێنی لەدەست کرد. تومۆری پرۆستات، تومۆرێکە کە بۆریی میزڵدان پێیدا تێدەپەڕێ. بۆ پیشاندانی تومۆری پرۆستات و شێوەی نەشتەرگەری کردنی دەبێ زۆری لەبارەوە بوترێت و نامیلکەیەکی پزیشکیی لەسەر بنووسرێت، بەلآم لەبەر ئەوەی ئێمە لە نووسینەوەی ژیانی "زائربروخ"دا مەبەستمان نووسینی نامیلکەی پزیشکی نیە، بە کورتی و بە شێوەیەکی سادە تومۆری پرۆستات بە خوێنەران دەناسێنین. تومۆرێك بهێننە بەرچاو کە قەوارەی چەشنی ئاڵقەیەکە و بۆریی میزڵدان پێیدا تێدەپەڕێت.

ئەو تۆمۆرە تەنیا لە جەستەی پیاواندا هەیە و ژنان تومۆری پرۆستاتیان نیە، بۆیە تووشی ئەو نەخۆشیەش نابن. "پرۆستات" وشەیەکە کەلە زمانی یۆنانییەوە هاتۆتە ناو زاراوە پزیشکییەکانەوە و واتاکەی لە زمانی یۆنانیدا (بە واتای لە پێشەوە)یە، چونکە پرۆستات لەژێر میزڵدانەوە هەڵکەوتووە و بۆریی میز پاش ئەوەی لە میزڵدانەوە دێتە دەر لە تومۆری پرۆستاتەوە تێدەپەڕێ و پاشان دەڕواتە ناو دوایین بەشی بۆریی میزەوە.

سەرەتا، بۆریی میز کەلە گورچیلەکانەوە دەست پێدەکات دوو بۆرییە کە یەکیان لە گورچیلەی لای ڕاست و ئەوی دیکەشیان لەناو گورچیلەی لای چەپەوە، دەگەنەوە بە میزڵدان، بەلآم پاش ئەوەی بۆریی میز لە میزڵدان جیا بۆوە، یەك دانەیە و ئەو بۆرییە لە لەشی پیاواندا لە تومۆری پرۆستاتەوە دەگوزەرێت. تومۆری پرۆستات لە کاتی منداڵی و لاویەتیی پیاواندا دۆخی نائاسایی

نیە، مەگەر ئەوەی بەدەگمەن، بەڵام لە دەورانی پیریدا، هەندێ لە پیاوان، تومۆری پرۆستاتیان تووشی دۆخی ناناسایی دەبێ. دۆخی ناناسایی تومۆری پرۆستات، لە دەورانی پیریی پیاواندا، بە دوو شێوە دەردەکەوێ، یەکیان ئەوەیە کە پرۆستات سست یان خاو، یان سفت و رەق دەبێتەوە.

ئەگەر بێت و تومۆری پرستات هەڵبماسێت و سفت بێتەوە، لەبەر ئەوەی بۆریی میز پێیدا تێدەپەڕێ، ئەو کەسەی کە تووشی هەڵمسینی تومۆری پرۆستات بێت، سەرەتا بە سەختی میزی پێدەکرێت و بەرەبەرە دەبێتە هۆی بەسترانی بۆریی میز و ناتوانێ میز بکات.

بەڵام ئەگەر بێت و تومۆری پرۆستاتی پیاوێك لە دەورانی پیریدا سست و شل ببێتەوە، ئەو کەسە سەرەتا هەست بەوە دەکات کە ناتوانێ میزی خۆی رابگرێت و پاش ماوەیەك تووشی "سلس البول" دەبێت و بەبێ ئیرادەی خۆی، میز بەخۆیدا دەکات و هەرکام لەم دوو نەخۆشییە کە بۆ پیاوێکی بەساڵاچوو بێتە پێش زۆر ئەستەم و دژوارە. ئێستا کە بە سادەیی و بەبێ چوونە ناو باسە ئاڵۆزە زانستییەکان، پرۆستاتمان بە خوێنەران ناساند، دەڵێین چەندین سەدە و(لەوانەیە هەزاران ساڵ) ئەو پیاوانەی کەلە دەورانی پیری و بەساڵاچووییدا، تووشی یەکێك لە مەرەزەکانی تومۆری پرۆستات بوون، باقی تەمەنی خۆیان بە ئازار و ژانەوە دەگوزەراند و دەرمان نەدەکران هەتا ئەوەی کە "زائربروخ" بە نەشتەرگەری بۆ تومۆری پرۆستات نەخۆشە پرۆستاتییەکانی لەو ئازار و ژانە رزگار کرد و رێکار و مەکتەبێکی دەرمانیی مەزنی بۆ لەناو بردنی ئازاری نەخۆشەکان داهێنا.

دەبێ بڵێین کە لەبارەی مێژووی یەکەم نەشتەرگەری بۆ نەخۆشیی پرۆستات بیروڕای جیاواز و ناکۆکی لە گۆڕێ دایە و کۆمەڵێك دەڵێن هەر لەو کاتەدا کە "زائربروخ" نەشتەرگەریی تومۆری پرۆستاتی وەك داهێنانێکی خۆی دەزانی، کەسانی دیکە بۆ وێنە پزیشکانی یەکیەتیی سۆڤیەتیش ئەو نەشتەرگەرییەیان ئەنجام دەدا، بەڵام راستییەکەی ئەوەیە کە "زائربروخ" نەشتەرگەریی پرۆستاتی بۆ هەر نەخۆشێك کردبێت ئەنجامی بەسوودی هەبووە و نەخۆشەکە لە سەداسەد چاك بۆتەوە.

بەهەرحاڵ دکتۆر "مادلنر" کە دەیبینی "زائربروخ" بە هۆشی کامڵ و بەبێ هیچ گرفتێك و بە خێراییەوە سەرقاڵی کاری نەشتەرگەرییە، لە ناخەوە بە زیرەکیی ئەو پزیشکە ئێرەیی دەبرد و دوای ئەوەی کە نەشتەرگەریی پرۆستات کۆتایی پێهات، نەخۆشێك کە دەبوا نەشتەرگەریی ئاپاندیسی بۆ بکرێت، هێنایانە ژوور و "زائربروخ" زۆر بە ئارامی و بە لەسەرەخۆیی، دەستەوانەکانی گۆڕی و نەشتەرگەریی ئاپاندیس کە بۆ کەسێکی وەك ئەو کارێکی زۆر ئاسایی بوو، بە سەرکەوتوویەوە ئەنجام درا.

"زائربروخ" به رۆژدا له نەخۆشخانه له بیری خواردنی نانی فراڤیندا نەبوو و هەتا ئەوکاتەی که سەرقاڵی کار بوو، بەبێ خۆراك و غەزا کاری دەکرد و فەرمانبەرانی نەخۆشخانەش دەیانزانی به رۆژدا هەست به برسێتی ناکات و ئەگەریش برسیی بێت، دەری نابڕێت.

ئەو رۆژە پاش ئەنجامدانی دوایین نەشتەرگەری رووپۆشەکەی لەبەر داکەند و کتێبەکەی که لەناو ترۆمبێلەکە دەیخوێند هەڵگرت و بەرلەوەی له نەخۆشخانه دەرکەوێت، بەرنامەی کار و نەشتەرگەرییەکانی خۆی بەو وێنانەی که لەبارەی نەخۆشییەکانەوە له نەخۆشخانه گیرابوو، چاو لێکرد هەتا ئەوەی که بۆ کارەکانی بەیانیی پێشینەی زەینیی هەبێت. ئەمە کاری هەموو نەشتەرگەرەکانه و چەند رۆژ پێش له ئەنجامدانی هەر نەشتەرگەرییەك پەروەندەی نەخۆشەکە دخوێنن و له رێگای ئەو وێنانەی کەله ناوەوەی جەستەی نەخۆشەکە گیراوە لێی دەکۆڵنەوە و هەموو زانیارییەکی نەخۆش لەباری تەمەن و پێشینەی نەخۆشی و زەختی خوێن و رەوشی ئەندامە سەرەکییەکانی جەستە و بەتایبەت دۆخی دڵ بەدەست دێنن و لێکۆڵینەوەی لەبارەوە دەکەن.

## مێشکی نەخۆشی وەکوو کیك پارچە پارچە کردەوە

یەك لەو پەروەندانەی کە لەلایەن "زائربروخ"ەوە لێکۆڵینەوەی لەسەر کرا، هی ژنێکی تەمەن ٥٥ ساڵە و یەکێك لە خزمانی شارەداری (درسد) بوو کە سەرۆکی نەخۆشخانە ئەو ژنەی بە یەکێك لە نەخۆشە گرنگەکان لە قەڵەم دەدا. ئەو ژنە تومۆرێك لەناو سەریدا بوو کە دەبوا بەدەستی "زائربروخ" نەشتەرگەریی بۆ بکرێت، سەرەڕای ئەوەی کەلە شاری "درسد" چەندین نەشتەرگەری بەتوانا هەبوون، بەڵام ئەو ژنە هاتە بەرلین هەتا ئەوەی کە گهیم رات (ئوستادی زانا) نەشتەرگەریی بۆ بکات. "زائربروخ" باسمان کرد چۆن لەگەڵ ئەو وێنەگرانەی کە دەیانەویست بێنە ژووری نەشتەرگەرییەوە و لە کارەکانی فیلم هەڵبگرنەوە، دژایەتی دەکرد، لە هەمبەر خوێندکارانی رشتەی پزیشکیدا میهرەبان بوو و رەزامەندیی دەنواند کە بێنە ژووری نەشتەرگەرییەوە و لە نزیکەوە کارەکانی ببینن و شتی لێوە فێر بن.

بە رەزامەندیی "زائربروخ" بڕیار درا رۆژێ دواتر کە ئەو ژنە ٥٥ ساڵەیە نەشتەرگەریی بۆ دەکرا، کۆمەڵێك لە خوێندکارانی پزیشکی لە ژووری نەشتەرگەری ئامادە بن. لەبارەی رێژەی ئەو خوێندکارانەی کەلە کاتی دەرهێنانی ئەو تومۆرە مێشکییەدا ئامادە بوون ناکۆکی و رای جیاواز هەیە و هەندێك لەو بوەڕە دان کە سی کەس بوون و هەندێکی دیکەش رێژەیان بە بیست کەس لە قەڵەم داون، لەوانەیە بیست کەسەکە راست بێت، چونکە ئەو ژوورەی کە شوێنی نەشتەرگەریی "زائربروخ" بوو هێندە بەربڵاو نەبوو هەتا سی خوێندکار تێیدا جێگایان ببێتەوە. ئەو رۆژەی کە دەبوا "زائربروخ" تومۆرێك لە مێشکی ئەو ژنە نەخۆشە بهێنێتە دەر، لە دوایین کاتەکانی پێش دەسپێکی نەشتەرگەرییەکە دکتۆر "مادلنر" لەلایەن سەرۆکی نەخۆشخانەوە بۆ کارێکی بەپەلە بانگهێشت کرا، هەر بۆیە لەو کاتەدا لە یاریدەدەرانی شارەزای "زائربروخ" کەسێك لە ژووری نەشتەرگەری ئامادە نەبوو.

مووی سەری ژنەکەیان تاشیبوو، لە حالێکدا کە خوێندکاران بە وردی سەیری شوێنی نەشتەرگەرییەکەیان دەکرد، "زائربروخ" دەستی کرد بە کردنەوەی کەللەسەری ژنە نەخۆشەکە. "زائربروخ" بەشێك لە ئێسکی کەللەسەری پاش بڕینەوە، بەرز دەکردەوە و لەسەر سەری دادەنا (وەکوو دەرپیچەیەك کەلە زەوین هەڵیبگرن و لە حالێکدا بە بۆرییەکانەوە پێوەندە، لەسەر زەویی

دایبنێن) تا ئێسکێك کەلە کەللەسەر جیا دەکرێتەوە، پێوەندیی بە ئێسکی سەرەکییەوە بمێنێ هەتا خانەکانی نەمرن.

"زائربروخ" دەیزانی تومۆرێك کە ئەو ژنە نەخۆشە ئازار دەدات لە کوێی مێشك هەڵکەوتووە، هەر بۆیە کونێکی لەناو مێشکی نەخۆش و رێك لەو جێگایەی کە تومۆرەکەی تێدا بوو، هەڵکەند. نەشتەرگەری کردن بۆ مێشك کاری ئەو پزیشکانەیە کە لەو بارەوە پسپۆرن. مێشك یەکێك لە ئەندامە سەرەکی و ئاڵۆزەکانی جەستەی مرۆڤە و سەرەڕای ئەوەی کەلە سەدەی هەڤدەی زایینی بەملاوە، زانیاریی پزیشك و کارناسانی لەشی مرۆڤ لەبارەی مێشکەوە زۆر پەرەی سەندەوە، هێشتا لەناو مێشك، بەشگەلێك هەن کە شێوازی کارکردنیان بە نیسبەت کار و ئەرکی سەرەکیی بەشەکانی دیکەی جەستەوە بۆ پزیشك و زیندەوەرزانان نادیار و ناڕوونە.

ئەو نەشتەرگەرەی کە نەشتەرگەری بۆ مێشك دەکات، دەبێ بەباشی مێشك بناسێ و ناساندنی مێشکیش پێویستیی بە خولێکی فێربوونی جیددییە و کێردی نەشتەرگەر نابێ بڕواتە ناو بەشی سەرەکیی مێشك بەناوی "کرتکس"ەوە (ئەم وشەیە دەبێ لەسەر کێشی کرست (کرستی ژنانە) ئەدا بکرێت ـ و. فارسی). چونکە ئەگەر بێت و کێردی نەشتەرگەری بڕواتە ناو بەشی سەرەکیی "کرتکس"ەوە، دوو ئەرکی هەستیار و سەرەکیی جەستە کە یەکیان حەرەکەت و جووڵەی دڵ و ئەوی دیکەشیان حەرەکەتی سیپەلاکەکانە، رادەوەستن و مرۆڤ دەمرێت.

دوای ئەوەی کە قاپلۆخی کەللەسەر کرایەوە، "زائربروخ" بەو خوێندکارانەی کەلە ژوورەکە بوون گوتی نزیك بنەوە و مێشکی زیندوو ببینن و گوتی: بە ئێوەیان گوتووە کە مێشکی مرۆڤ دە میلیارد خانەی هەیە، لە حاڵێکدا تەنیا بەشێك لە مێشك کە "کرتکس"ە، چواردە میلیارد خانەی هەیە و هەموو خانەکان لە رێگای خوێنەوە زیندوون و خۆراکیان پێدەگات و لە نێوان هەموویاندا پێوەندیی دەماری هەیە، وەرنە پێشێ هەتا بە جوانی حەرەکەت و جووڵەی بەردەوامی سوورەدەمار (خوێنبەر) ببینن. پێتانیان گوتووە کە خانەکانی مێشك گۆڕانییان بەسەردا نایەت و ئەگەر بێت و خانەیەك لە مێشك جودا بکرێتەوە، دەمرێت. ئەوانەی کە ئەمەیان پێتانیان گوتووە نەزانن. دەستەکانتان بێننە پێشێ و چەند کەس لە خوێندکارەکان کەلە "زائربروخ"ەوە نزیکتر بوون، دەستیان بردە پێشەوە.

"زائربروخ" وەك ئەوەی نانە کیکێك دەبڕێت، کێردی نەشتەرگەرییەکەی رۆکردە ناو مێشکی ژنە نەخۆشەکەدا و پارچەیەك لە مێشکی جیا کردەوە و لەناو لەپی یەکێك لە خوێندکارەکانی دانا و ژنە پەرستارێك کەلە پەنا دەستی "زائربروخ" بوو بە تاپۆن خوێنەکانی ویشك کردەوە.

"زانربروخ" دیسان کێردەکەی کردە ناو مێشکی نەخۆشەکەدا و پارچەیەکی دیکەی مێشکی بڕی و هێنایەدەر و خستیە ناو دەستی یەکێکی دیکە لە خوێندکارەکانەوە و دیسان ژنە پەرستارەکە بە تانپۆن خوێنە رژاوەکەی سڕییەوە.

شەش جار کێردی نەشتەرگەریی "زانربروخ" کرایە ناو مێشکی نەخۆشەکەدا و هەر جارە پارچەیەك لە مێشکی دەردەهێنا و لەناو دەستی یەکێك لە خوێندکارەکانی دادەنا. هەموو ئەو خوێندکارانەی لەو ژوورە ئامادە بوون لە کۆلیژی پزیشکی وانەیان دەخوێند و دەیانزانی کە پارچە پارچە کردنی مێشك، دەبێتە هۆی مەرگ، بەڵام باوەڕ و یەقینی ئەوان بە زانست و شارەزایی "زانربروخ" بەرادەیەك بوو کە پێیان وابوو ئەو ئوستادە بلیمەتە هەڵە ناکات و ئەو کارەی ئەو هیچ خەسارێك بە نەخۆش ناگەیەنێت و بێگومان ئەو پارچانەی کەلە مێشکی جیا کردوونەتەوە، لەجێی خۆیانی دادەنێ و دیسان پێکەوە گوشتەزوو (پێوەند) دەدرێنەوە و مێشکی نەخۆش وەکوو خۆی لێدێتەوە.

"زانربروخ" جارێکی تر بە خوێندکارەکانی وت ئەو پارچە مێشکانەم پێتان دا هەتا بیبەن و لە تاقیگە و لەناو دەفرێك کە مادەی مێشکی خانەکانی تێدایە دابنێن و دەبینن کە پاش پازدە رۆژ دەبنە دوو هێندە و ئەوەی کە بەدی دێت دیسان پازدە رۆژی دیکە دەبێتە دوو هێندە و گەشەی خانەکانی مێشك ئەوەندە درێژەیان دەبێت کە ئەگەر ئێوە لە دانی خۆراك بە خانەکان بەردەوام بن، ئەوکات دەبینن ئەم وڵاتە جێگای خانەکانی مێشك نابێتەوە!! بەڵام مامۆستاکانی ئێوە کە هەموویان نەزانن، دەڵێن خانەکانی مێشك گەشە و زیاد ناکەن.! ژنە پەرستارەکان کەلە ژوورەکە بوون بە حەپەسان و سەرسوڕمانەوە چاویان لەو کارەی "زانربروخ" دەکرد و لەم کاتەدا دکتۆرێك کە بەرپرسی بێهۆشی بوو، لەوە تێگەیشت کە نەخۆشەکە مردووە.

پزیشکەکان، بەهۆی پەروەردەی زانستیانە هەمیشە لە بەرامبەر ئەو رووداوە چاوەڕوان نەکراوانەدا کە کاتی نەشتەرگەری دێنە پێشێ، لەلای کەسوکاری نەخۆش یان کەسانی دیکە کە بەپێی زانستی پزیشکی بێگانەن، ئارام و لەسەرەخۆن. ئەو رۆژەش لەو ژوورە بیست یان بەڕایەکی دیکە سی خوێندکاری پزیشکی ئامادە بوون، هەرچەند لە کۆلیژی پزیشکی وانەیان دەخوێند، بەڵام دکتۆری بێهۆشی هێشتا نەیدەتوانی ئەوان بە بەشێك لە رازداری پزیشکی دابنێت و لە حزووری ئەواندا و بە دەنگی بەرز بڵێت کە نەخۆش مردووە. دکتۆری بێهۆشی، گەرچی هەتا ئەوکاتە نەیدیبوو "زانربروخ" لە کاتی نەشتەرگەریدا، نەخۆشێك لەژێر دەستیدا بمرێت، بەڵام دەنگۆکانی نەخۆشخانەشی بیستبوو کە کاتێك دکتۆر "مادلنر" ویستبوی پێشی "زانربروخ" بگرێت، ئەو

پزیشکه به چەقۆ هێرشی کردبووە سەری. دکتۆری بێهۆشی کە تێگەیشت ئیتر ئەو کەسانی دیکە بۆ زیندوو کردنەوەی ئەو نەخۆشە هیچیان پێناکرێت و لە ترسی ئەوەی کە ئەوەکوو ریسوایی "زاثربروخ" لە حزووری بیست یان سی خوێندکاردا جارێکی دیکە دووپات نەبێتەوە، بۆیە لە ژووری نەشتەرگەرییەکە وەدەرکەوت هەتا داوای یارمەتی لە فەرمانبەرانی نەخۆشخانە بکات و بێن و پێش بە "زاثربروخ" بگرن و نەهێلن کارێکی دیکەی ناعەقلانی بکات.

کاتێك فەرمانبەرانی نەخۆشخانە لەگەڵ دکتۆری بێهۆشی و دکتۆر "مادلنر" کەلە دەرەوە لەگەڵیان کەوتبوو، هاتنە ژوورەوە، "زاثربروخ" بە بینینیان سەری سوڕ ما و هاواری کرد کە کێ ئیزنی بە ئێوە داوە بێنە ژوورەوە، مەگەر نازانن ئێرە ژووری نەشتەرگەرییە. بەڵام فەرمانبەرانی نەخۆشخانە هیچ سەرنجێکیان بە قسەکانی نەداوە و رژان بەسەریدا و دەستیان گرت و بە کێشەکێش و لە ژوورەکە بردیانە دەرەوە و لەبەر ئەوەی دەست و لاقی دەوەشاند، وەکوو شێتێکی راستەقینە و پڕ مەترسی دەست و لاقیان بەست. ئەو ریسواییەی کە بە ئامادەبوونی بیست یان سی کەس لە خوێندکارانی کۆلیژی پزیشکی و فەرمانبەرانی نەخۆشخانە کە دەست و پێی "زاثربروخ"یان بەست، بە چەشنێك دەنگی دایەوە کە ئیتر نەدەکرا پێش بە بڵاوبوونەوەی بگیرێت.

لەبەر چونکە لە بەرلینی رۆژهەڵات و ئەڵمانیای رۆژهەڵات رۆژنامەکان لەژێر چاوەدێریی حکوومەتدا بوون، هەواڵی ئەو رووداوە لەوێ بڵاو نەکرایەوە. بەڵام رۆژنامەکانی بەرلینی رۆژئاوا و ئەڵمانیای رۆژئاوا، بەبێ ئەوەی کە ناوێك لە "زاثربروخ" بێنن، نووسییان کەلە نەخۆشخانەی شاریتی نەشتەرگەرێك، بێ هۆ و بەبێ لەبەرچاوگرتنی زانستی پزیشکی لە کاتی نەشتەرگەریدا نەخۆشێکی کوشتووە. لەو کاتەدا، وەکوو ئەمڕۆ لە نێوان بەرلینی رۆژهەڵات و بەرلینی رۆژئاوا، دیواری سەرتاسەری نەبوو هەتا ئەوەی پێوەندییەك لە نێوان هەر دوو بەشی بەرلیندا نەبێت و لە بەرلینی رۆژئاوا خەڵك ئاگایان لەناوی ئەو پزیشکە بوو کەلە کاتی نەشتەرگەریدا ژنێکی کوشتبوو و زانییان کە ئەو کەسە "زاثربروخ"ی بەناوبانگە. بەڵام ئەو کەسانەی کە باوەڕ و ئیمانیان بە زانست و شارەزایی "زاثربروح" هەبوو، ئەو رووداوەیان بە دەنگۆ و دەسکردی رکەبەرانی ناوبراو لە قەڵەم دەدا.

## پیاوێك كە بە تەرمە نەشتەرگەری بۆ كراوەكان رادەگەیشت

لە نەخۆشخانەی شاریتی لە بەرلینی رۆژهەڵات پزیشكێك بەناوی دكتۆر "راسل" هەبوو، كە وەك پشكێنەری نەخۆشە مردووەكان پاش نەشتەرگەری كاری دەكرد. كاتێك نەخۆشێك پاش نەشتەرگەری دەمرد دكتۆر "راسل" تەرمەكەی دەپشكنی كە ئایا نەشتەرگەرییەكە بە پێی پێوەر و میتۆدە زانستی و پزیشكییەكان ئەنجام دراوە یان نا. هەڵبەت ئەمە كاتێك دەكرا كەلە خوێندنەوەی پەروەندەی و كۆبوونەوە و مۆڵەتی نەشتەرگەری پەی بە زانستی بوونی نەبردبا. ئەگەر نەشتەرگەرییەكی ئەنجام دابا و لە رێگای نفووزی خۆی و دەسكردەوە گوزارشتی كۆڕی بخستایەتە روو، بە دوو یان سێ پرسیاری دكتۆر "راسل" مەحكووم دەبوو و دوای ئەوە ئیتر نەیدەتوانی لە نەخۆشخانەكانی بەرلینی رۆژهەڵات كاری نەشتەرگەری بكات.

دكتۆر راسل سێ خاڵی بە هیچ بیانوو و پاساوێك قبووڵ نەدەكرد:

یەكەم ئەوەی كە نەخۆش لە كاتی نەشتەرگەریدا بمرێت. دكتۆر راسل دەیگوت ئەگەر نەخۆشێك لەژێر نەشتەرگەریدا بمرێت، ئەو نەشتەرگەرەی كە كاری نەشتەرگەریی بۆ كردووە، لە بەرامبەر مەرگیدا بەرپرسیارە، چونكە دكتۆرێك كە دەزانێ ئەگەری زۆرە نەخۆشەكەی لەژێر نەشتەرگەریدا بمرێت، نابێ نەشتەرگەریی بۆ بكات.

دووەم ئەوەی كە ئەگەر نەخۆش بەهۆی چڵك و كیم كردنی برینەوە بمرێت كە نیشانەی كەمكاری و كەمتەرخەمییە لە هەمبەر رەچاو نەكردنی پێوەرە تەندروستییەكان لە كاتی نەشتەرگەریدا.

سێیەم ئەوەی كە نەخۆشێك پاش نەشتەرگەری بەهۆی نەخۆشیی زكەڕەقە (كوزاز) بمرێت. دكتۆر راسل دەیگوت هەتا ژووری نەشتەرگەری و كەلوپەلی پزیشكی پیس و پۆخڵە نەبن، برینی نەخۆش پاش نەشتەرگەری چڵك و كیم ناكات و هەتا ژووری نەشتەرگەری و كەلوپەلەكان ئالوودە نەبن، نەخۆشێك خێرا پاش نەشتەرگەری تووشی نەخۆشیی كوزاز نابێت و لەو كاتانەدا دكتۆر راسل پزیشكەكەی بە بەرپرسیار دەزانی و ئەستەم بوو لە بڕیاری بێبەری كردنی خۆش بێت و پاشگەز بێتەوە. دكتۆر راسل لەبارەی هەركام لەو نەخۆشخانەی كە لەژێر نەشتەرگەریدا مردبوون یان پاشان بەهۆی كیم كردنی برین و نەخۆشیی كوزازەوە دەمردن، راپۆرتێكی ئامادە دەكرد نوسخەیەكی بۆ لێپرسراوی نەخۆشخانە دەنارد و نوسخەیەكی دیكەشی بۆ سەرپەرستی تەندروستی كە پاش پێكهاتنی حكومەتی ئەڵمانیای رۆژهەڵات بوو بە وەزیری تەندروستی، رەوانە دەكرد. دكتۆر راسل

پێشتر کە "زائربروخ" لە کۆلیژی پزیشکی وانەی دەوتەوە، یەکێك لە قوتابیانی ئەو پزیشکە بلیمەتە بوو و پاش کۆتایی هاتنی دەورەی خوێندن، بۆ ئەوەی بتوانێ بڕوانامەی دکتۆرا وەربگرێت، نامە و تێزەکەی نووسی. دکتۆر راسل بۆ ماوەی دوو ساڵ خەریکی نووسینی ئەو نامەیەکەی بوو کە لەبارەی نەخۆشیی خەوەوە بوو، هەتا تەواو کرد و پێشکەشی "زائربروخ"ی کرد تاکوو پەسندی بکات و پاشان دیپلۆمی دکتۆراکەی پێ ببەخشرێ.

لە ئەڵمانیا یاسا بەو چەشنێك بوو پاش ئەوەی کە مامۆستای سەرپەرستیار نامە و تێزی خوێندکارەکەی دەخوێندەوە، رۆژێکی بۆ (بەرگریی خوێندکار لە تێزەکەی دیاری دەکرد) و لەو رۆژەدا خوێندکار لەو کۆبوونەوەیەی کە مامۆستای راوێژکار و چەند مامۆستایەکی تر بوون، ئامادە دەبوو و وەڵامی ئەو پرسیارانەی دەدایەوە کە مامۆستاکان سەبارەت بە نامەکەی لێیان دەکرد و ئەگەر وەڵامەکان گونجاو بوایەت، نامەکەی پەسند دەکرا و لەلایەن کۆلیژی پزیشکی و بە واژۆی بەرپرسانی کۆلیژ و زانستگە بڕوانامەی دکتۆراکەیان پێ دەبەخشی.

ماوەیەك گوزەرا و "زائربروخ" دکتۆر "راسل"ی ئاگادار نەکردەوە کەلە چ رۆژێکدا دەبێ بەرگری لە نامەکەی خۆی بکات، بە جۆرێك کە ئیتر راسل تاقەتی نەما و رۆژێکیان کە "زائربروخ" لە ژوورەکەی خۆی لە کۆلیژی پزیشکی بە تەنیا دانیشتبوو، راسل سەردانی کرد و مەسەلەی نامەی دکتۆراکەی وەبیر هێنایەوە. ئوستاد کەشاو (چەکمەجە)ی میزەکەی کردەوە و نامەکەی "راسل"ی لێ دەرهێنا و پرسیاری لە راسل کرد ئایا تۆ هەتا ئێستا چەند کەس کە تووشی نەخۆشیی خەو بوون، دەرمانت کردوون؟ (زائربروخ زیاتر خەڵکی بەناوی تۆ بانگ دەکرد). راسل وەڵامی دایەوە کە من هەتا ئێستا کەسێك کە تووشی نەخۆشیی خەو بێت دەرمانم نەکردووە. "زائربروخ" پرسیاری کرد کەوایە ئەمانەت چۆن نووسیوە؟ راسل وتی من دوو ساڵ توێژینەوەم کردووە و چەندین کتێب و نامەی دکتۆرا و نامیلکەم لەبارەی نەخۆشیی خەوەوە خوێندۆتەوە و ئەوەی کە لەو نامەیەدا نووسراوە لەو سەرچاوانەوە وەرمگرتووە.

"زائربروخ" پرسیاری کرد کە ئاخۆ سەردانی ئەو ناوچانەت کردووە کە کەسانی تووشبوو بە نەخۆشیی خەوی لێیە و ئەو نەخۆشانەت بینیوە؟ دیسان پرسیاری کرد ئایا لە ئەڵمانیا کەسێکی تووشبوو بە نەخۆشیی خەوت بینیوە؟ راسل وتی لە ئەڵمانیا، نەخۆشیی خەو لە ئارادا نییە. "زائربروخ" نامەی دکتۆراکەی "راسل"ی بۆی فڕێ دا و وتی کەوایە ئەمەی کە تۆ نووسیوتە نامیلکەیەکی ئەدەبییە نەك نامەیەکی پزیشکی، چونکە نامەی پزیشکی ئەوەیە کە تۆ ئەو مەسەلەیەت بە چاوی خۆت دیبێت و لە دەرمانکردنی نەخۆشدا بەشداریت کردبێت.

نموونەی ئەم ڕووداوە بۆ یەکێك لە پزیشکە ناودارە ئێرانییەکانیش هاتە پێش. ئەو پزیشکە ئێرانییە کە پاش تەواوکردنی خوێندنی دکتۆرا لە ئێران گەیشتە پلەی بەرزی پزیشکی و "سیاسی"، لە ئەڵمانیا دەیخوێند و یەکێك لە قوتابیانی "زائربروخ" بوو و دوای کۆتایی خوێندن، بابەتی نامە و تێزەکەی جۆرێك نەخۆشیی شێرپەنجی زار کە ناوەکەی بە زمانە ئەورووپاییەکان "نوما" و بە زمانی عەرەبی "سەرەتان ئەلما"یە هەڵبژارد. پزیشکە ئێرانییەکە ماوەیەك تێکۆشا و نامەی تێزەکەی نووسی و چاوەڕێی دیاریکردنی ڕۆژی خوێندنەوە و بەرگری لە نامەکەی مایەوە. بەڵام لەوە دەچوو کە "زائربروخ" مەسەلەی نامەی ئەو پزیشکە ئێرانییەی لەبیر کردبێ، بۆیە ناچار بوو کە وەبیری بێنێتەوە و "زائربروخ" پێی گوت کە بەیانی سەردانی نووسینگەکەی خۆی بکات.

ڕۆژی دواتر پزیشکە ئێرانییەکە سەردانی ژوورەکەی "زائربروخ"ی کرد و پرسیاری لێکرد کە ئایا بۆ خۆت کەسێك کە تووشی نەخۆشیی "بوما" بێت بینیوتە؟ پزیشکە ئێرانییەکە وەڵامی نای دایەوە. پرسیاری کرد کە ئایا ئەم جۆرە نەخۆشییە شێرپەنجەییە لە ئەڵمانیا هەیە یان نا؟

پزیشکە ئێرانییەکە وەڵامی دایەوە ئەم جۆرە شێرپەنجەیە لە ئەڵمانیا نیە. "زائربروخ" نامەی تێزی دکتۆرە ئێرانییەکەی بە جۆرێك بۆی فڕێ دا کە لاپەڕەکانی بەناو ژوورەکەدا بڵاو بوونەوە و گوتی ئەوەی کە تۆ نووسیوتە نامەی دکتۆرای پزیشکی نیە! پزیشکە ئێرانییەکە لاپەڕەکانی نامەکەی خۆی کۆ کردەوە و لە ژوورەکە وەدەرکەوت و بە ڕێنوێنیی یەکێکی تر لە مامۆستاکان نامەیەکی دیکەی نووسی. بەپێی ئەو پێشینانە و دوای ئەوەی کە "زائربروخ" بە کێردی نەشتەرگەری هێرشی کردە سەر دکتۆر "مادلنر" و کاتێك دەیانەوست ڕاگیری بکەن و هێوری بکەنەوە، بۆ ڕزگار کردنی خۆی دەست و لاقی دەوەشاند، دکتۆر ڕاسل ڕاپۆرتێکی ئامادە کرد و بۆ دکتۆر "هاڵ"یشی نارد و ڕاشکاوانە "زائربروخ"ی بە بەرپرسی کوشتنی نەخۆشەکە لە قەڵەم دا و گوتی ئەم پیاوە ئیتر نابێ کاری نەشتەرگەری ئەنجام بدات. وەزیری تەندروستیی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات پاش بینینی ڕاپۆرتەکە دکتۆر "ڕاسل" و دکتۆر "هاڵ"ی بانگ کرد.

دکتۆر "ڕاسل" پێش ناردنی ئەو ڕاپۆرتە، لەبارەی ڕەوشی "زائربروخ"ەوە لەگەڵ دکتۆر "هاڵ" قسەی کردبوو و دوای ئەوەی کە لەگەڵ دکتۆر "هاڵ" ڕۆیشتنە لای وەزیری تەندروستی، ئەنجامی دیداری خۆی لەگەڵ دکتۆر هاڵ بۆ وەزیری تەندروستی باس کرد و گوتی ئێمە هەموومان قوتابیی "زائربروخ"ین و لەگەڵ بلیمەتیی ئەو لە نەشتەرگەریدا ئاشناین بەڵام ئەم پیاوە، ئەمڕۆ شێتێکی تەواوە و نابێ ئیزن بدرێت لەمەودوا کاردی نەشتەرگەری بەدەستەوە بگرێت.

وەزیری تەندروستی وتی: منیش حەزم نەکرد ئەم دۆخەی کە ئێوە لە ڕاپۆرتەکەدا باستان کردووە

بێته پێشێ، بەڵام ئەم پیاوە لەلایەن کەسانی بە نفووز و پایەبەرزی حیزب و دەوڵەتەوە پشتیوانیی لێدەکرێت و منیش نامەوێ لەم بارەوە رێکاری زۆرەملێ بگرمە بەر. دکتۆر "راسل" رایگەیاند کە لەگەڵی قسە بکەن و پێشنیاری پێ بکەن کە خۆی خانەنشین بکات، هەرچەند "زائربروخ" گرنگی بە مەسەلەی مادی نادات، بەڵام لەبەر ئەوەی مرۆڤێکە و هەر کەسەش بۆ بژیوی ژیانی پێویستی بە لایەنی مادییە و ئەگەر بزانێت کە پاش خانەنشینی هەموو ئەو مافانەی کە ئێستا وەردی دەگرێت، پێی بدرێ، رەزامەندی نیشان دەدات کە دەست لەکار بکشێنێتەوە و دەبێ بۆ رەزامەندیی "زائربروخ" گەڵاڵەیەکی یاسایی پەسند بکەن کە ماف و پێویستییەکانی ئێستای "زائربروخ" هەتا ئەوکاتەی زیندووە پێی بدرێت.

وەزیری تەندروستی گوتی من ئەم مەسەلەیە لە کابینەی دەوڵەت دێنمە بەرباس و دوای پەسندکردنی لەلایەن وەزیرانەوە، بۆ گفتوگۆ "زائربروخ" بانگ دەکەم، بەڵام لەوانەیە ئەو بۆ وتووێژ نەیەتە لای من. دکتۆر راسل گوتی ئەگەر بانگتان کرد و نەهات خۆتان سەردانی بکەن.

# مەسەلەی خانەنشین کردنی زائربروخ

لێژنەی وەزیرانی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات ڕەزامەندییان لەسەر پێشنیاری وەزیری تەندروستی نیشان دا و بڕیار درا کە وەزیری تەندروستی گەلاڵەی یاسایی پێوەندیدار بە خانەنشین کردنی "زائربـروخ" وێڕای پاراستنی هەموو ماف و حقوقەکانی کار و پیشەی ئامادە بکات، بۆیە وەزیری تەندروستی "زائربروخ"ی بانگهێشت کرد. نەشتەرگەری بلیمـەت پێـچەوانەی بۆچـوون و چـاوەڕوانیی وەزیـری تەندروستی، ڕۆیشتە سەردانی. ئەو ڕۆژە سەرەڕای ئەوەی کەلـە ژووری چاوەڕوانیی وەزیـر، چـەند کەسی دیکەش چاوەڕێی دیداری بوون، هەرکە هەواڵی پێگەیشت کە "زائربروخ" هـاتووە، وەزیـری تەندروسـتی خۆی هاتە پێشوازییەوە و لە نـەیوانی نێـوان ژووری چـاوەڕێ هـەتا ژوورەکـەی خـۆی لەگەڵی کەوت و لە ژووری کارەکەشی لە تەنیشتی دانیشت و گوتی بڕواتان هەبێت ئەمڕۆ مـن لـە دیدارتان گهیم رات (زانا و ئوستادی گەورە) زۆر خۆشـحاڵ بـووم. سـەرەڕای ئـەوەی کـە وەزیـری تەندروستی دەیهەویست ئەو مژدەیە بە "زائربروخ" بدات کە ئەگەر بێت و خانەنشین بکرێت مـاف و مووچەی ئێستای هەتا کۆتایی تەمەن وەردەگرێت، نەیدەزانی بابەتی سـەرەکیی دیدارەکـە چـۆن باس بکات و سەرەنجام گوتی "گهیم رات" بە منیان گوتووە کـە بەتـەمان پـشوو بـدەن و دەسـت لەکار بکشێننەوە.

"زائربروخ" پرسیاری کرد ئەم قسەتان لە کێ بیستووە.

وەزیری تەندروستی وەڵامی دایەوە بە شێوەی زارەکی بیستومە و "زائربروخ" گوتی من ماندوو نیم هەتا دەست لەکار بکشێنمەوە. وەزیری تەندروستی کـە بیـستبووی چـەند سـاڵ لەمـەوپێش و کاتی هێرشی رووسەکان بۆ بەرلین، "زائربروخ" بە کەسی نێردراوی مارشاڵ "ژوکوف"ی گوتبوو کە دەست لەکار دەکـشێنێتەوە، بۆیـە وتـی مەگـەر ئێـوە لـە سـاڵی ١٩٤٥ بـە نوێنـەری مارشـاڵ "ژوکوف"تان نەگوت کە بەتەمان خانەنشین بن؟ "زائربـروخ" لـە پـشتی چـاویلکەکەیەوە، چـاوە بریقەدارەکانی بڕییە چاوانی وەزیری تەندروستی و وتی من هیچکات ئـەم قـسەیەم نـەکردووە کـە بەتەمام خانەنشین ببم، چونکە ئەوکاتەش وەکوو ئەمڕۆ، درێژەی ژیانم پێوەنـدیی بـە کارەکەمـەوە هەبوو و منیش بەبێ کار کردن نەمدەتوانی درێژە بە ژیان بدەم.

وەزیری تەندروستی ڕایگەیاند کەوایە بەم پێیە، سەرۆکی تەندروستی ئەرتەشـی سـوور کـە بـە

نوێنەرایەتیی مارشال "ژوکوف" قسەی لەگەڵتان دەکرد، قسەکانی ئێوەی چەواشە کردووە. "زائربروخ" وتی من لەگەڵیان لەبارەی خانەنشین بوونم قسەم نەکرد و تەنیا گوتم ئامادە نیم بڕۆم بۆ مسکۆ و لەوێ کار بکەم و ئەگەر بێت و بیانەوێ بە زۆر من ڕەوانەی مسکۆ بکەن، لەکار دەکشێمەوە. بێدەنگییەك لە نێوانیاندا هاتە ئاراوە و "زائربروخ" کە لەو کاتەدا هۆشی بە تەواوەتی لەسەرخۆ بوو، پرسیاری لە وەزیری تەندروستی کرد ئایا بۆ خانەنشین کردنی من بڕیارێکتان پێکراوە؟

وەزیری تەندروستی پرسیاری کرد پێت وایە لەلایەن کێیەوە بڕیارێك بە من درابێت؟

"زائربروخ" وەڵامی دایەوە لەلایەن دەوڵەتەوە. وەزیری تەندروستی لە وەڵامدا وتی کەس لەبارەی ئێوەوە بڕیارێکی بە من نەداوە، بەڵام من بە زارەکی بیستوومە کە ئێوە دەتانەوێ پشوو بدەن و ئەگەر مەیلتان لە حەسانەوە هەبێت ئێمە یاسایەك بۆ پەسند کردن گەڵاڵە دەکەین هەتا هەموو ئەو ماف و حقووقەی کە ئەمڕۆ وەری دەگریت، هەتا کۆتایی تەمەنتان پێتان بدرێت. "زائربروخ" گوتی هەروەك گوتم ژیانی من بەستراوە بە کارەکەمەوە و منیش بەبێ کارکردن ناتوانم بژیم و هەتا ڕۆژێك زیندووم درێژە بەکار کردن دەدەم.

وەزیری تەندروستی ڕایگەیاند کە لەم وڵاتە و وڵاتانی دیکەش، هەرکەسە کە ناوی ئێوەی بیستووە، حەزی لێیە ئێوە بەردەوام بن لە کارکردن و بە بلیمەتیی خۆتان هەر ساڵە کۆمەڵێك لە مەرگ ڕزگار بکەن، بەڵام سروشتی ژیان وایە کە هەموو کەس پاش ماوەیەك کارکردن هەست بە ماندوویەتی دەکات و تەنانەت بلیمەتگەلێکی وەکوو ئێوە لەوانەیە لە لەبەرگرەوەی ئەو یاسا گشتیەش دەگەن و ئەبێ کاتێك ئێمە پاش تەمەنێك کارکردن هەستمان بە ماندوویەتی کرد، باشتر وایە دەست لەکار هەڵبگرین و بحەسێینەوە و بیرەوەرییەکانمان بنووسینەوە... ڕاستی مامۆستای بلیمەت، ئێوە بەتەما نین بیرەوەرییەکانی خۆتان بنووسنەوە؟ ئایا سەرنجی ئەوەتان داوە کە ئەگەر بێت و بیرەوەرییەکانتان، وەکوو کتێب بڵاو بێتەوە چ قازانجێکی بۆ نەوەکانی داهاتوو دەبێت؟ هەرچەند ئەمڕۆ ئێوە بەرپرسی خزمەتێکی مەزنن بە مرۆڤایەتی و هەتا ئێستا هەزاران کەستان لە مەرگ ڕزگار کردووە، بەڵام نەوەکانی داهاتوو لە تاقیکردنەوەکانی ئێوە کە هەرکامەیان تایبەتن سوودمەند دەبن، ئەوەش کاتێك دەبێ کە بیرەوەرییە زانستییەکانتان وەك کتێب بڵاو بکرێتەوە.

وەزیری تەندروستی هەستی کرد بۆ ئەوەی پێش بە درێژەی کاری نەشتەرگەریی "زائربروخ" بگرێت بیانوویەکی دۆزیوەتەوە و ئەگەر "زائربروخ" دەست لەکار بکشێنێتەوە و لە ماڵەوە دەست

بکات بە نووسینەوەی بیرەوەرییەکانی، نارازی نابێت و لایەنگرەکانیشی نارەزایەتیی دەرنابرن.

ئەوە بوو کە وەزیری تەندروستی پێی وابوو هەلێکی لەباری بۆ خانەنشین کردنی "زائربروخ" دەست خستووە و مامۆستای زیاتر هان دا و گوتی: ئێمە چاوەڕێ نابین هەتا نووسینەوەی بیرەوەرییەکانتان کۆتایی پێ بێت و دواتر چاپ و بڵاویان بکەینەوە، بەڵکوو هەر جارە هەرچەندەیان نووسرانەوە، دەست دەکەین بە چاپ کردنیان، ئایا هەتا ئێستا هەوڵێکت بۆ نووسینەوەی بیرەوەرییەکانت داوە؟ ئایا دەتوانن پێشبینی بکەن کە بیرەوەرییەکانتان وەك کتێب دەبنە چەند بەرگ و ئایا دەزانن بیرەوەرییەکانتان لەناو بیرەوەریی بیرمەندانی دنیا، لە رابردوو و ئەمڕۆدا دەبێتە سەرنجڕاکێشترین کتێبی پزیشکی. کاتێك وەزیری تەندروستی بێدەنگ بوو، پرۆفیسۆر "زائربروخ" ماوەیەك تێڕاما و دواتر رایگەیاند من لەمەڕ ئەو کارانەی کە کردوومن یادداشتی زۆرم هەیە کە هێشتا وەکوو کتێب ئامادە نەکراون، بەڵام پێشبینی دەکەم بیرەوەرییەکانم دەبنە دە بەرگ.

وەزیری تەندروستی وتی ئەی مامۆستای بلیمەت، با بڵاوبوونەوەی بیرەوەرییەکانتان دوانەکەوێ، چونکە بەهۆی ناسەقامگیریی بارودۆخی ئەورووپا و دنیا ئەم مەترسییە لە گۆڕێ دایە کە هیچکات بڵاو نەبێتەوە و بەو پێیەی کە هێشتا ئاسەواری خراپی و وێرانیی شارەکانمان لە زەوی هەڵنەگیراون، باس لە ئەگەری روودانی شەڕێکی تر دەکرێت و لە وەها ژینگە و بارودۆخێکی نێودەوڵەتیدا، ئێوە هەرچی بۆ چاپی بیرەوەرییەکانی خۆتان پەلە بکەن باشترە و من دتوانم یەك یان دوو کەس لە فەرمانبەرانی وەزارەتی تەندروستی بنێرمە یارمەتیتان هەتا لە نووسینەوەی بیرەوەرییەکانتاندا یارمەتیتان بکەن. سەرەڕای هەموو ئەو بەخێرهاتن و پێشوازییە گەرمە و وادە و بەڵێنییانە "زائربروخ" لەو داوە نەکەوت کە وەزیری تەندروستی بۆی دانابوو و رایگەیاند من بۆ نووسینەوەی بیرەوەرییەکانم پێویستیم بە یارمەتی نیە و دەتوانم پاش کاری رۆژانەم هەر شەو یەك یان دوو کاتژمێر کاتی خۆم بۆ نووسینەوەی بیرەوەرییەکانم تەرخان بکەم.

وەزیری تەندروستی رایگەیاند، بۆ هەر شەوێك دوو یان سێ کاتژمێر کەمە و ئێوە دەبێ رۆژانەش سەرقاڵی نووسینەوەی بیرەوەرییەکانتان بن. "زائربروخ" گوتی من ئێوارانیش کاری نەشتەرگەریم نیە و دەتوانم هەموو ئێوارەیەکیش خۆم سەرقاڵی نووسینەوە بکەم، بەڵام لە کاری سەرەکیم کە نەشتەرگەرییە دەست هەڵناگرم و هەتا ئەو رۆژەی کە زیندووم درێژە بەم کارە دەدەم. پاش ئەو قسەیە "زائربروخ" بۆ رۆیشتن هەستایە سەرپێ و وەزیری تەندروستیش بە ناچاری هەتا بەر دەرگاکە رەوانەی کرد و کاتێك مامۆستا رۆیشتە ناو ژووری چاوەڕوانییەوە، هەموو ئەو

کەسانەی کە لەویٚ چاودێری دیداری وەزیر بوون، بە نیشانەی ڕێزگرتن لـە "زانربـروخ" هەسـتانە سەرپێ و "زانربروخ" پاش هاتنە دەرەوە لە وەزارەتـی تەندروسـتی بـە ترۆمبێلـی خـۆی ڕۆیـشتە نەخۆشخانە و بە دکتۆر "مادلنر"ی گوت نازانم چ کەسێك بەٚ وەزیری تەندروستیی گوتووە کە مـن بەتەمام خانەنشین ببم، لە حاڵێکدا من هیچکات ئەم بڕیارەم نەداوە، لەوانەیە وا بیر بکەنەوە پاش ئەو ڕووداوەی کەلە نەخۆشخانەی "شاریتی" ڕووی دا و باسمـان لـەبارەوە کـرد پێـشیان بـە کـاری "زانربروخ" لەو نەخۆشخانەیە گرتووە و پێیان وتووە بگەڕێتەوە ماڵی خۆی. بەڵام ئەو کارە نەکرا و هەمان ڕۆژ کـە "زانربـروخ" لەگـەڵ وەزیـری تەندروسـتی دیـداری کردبـوو، دیـسان لـە هـەمان نەخۆشخانە درێژەی بـە کـاری نەشـتەرگەری دا و بـەپێی خەسـڵەتی خـۆی دەسـتەکانی شـۆرد و ڕووپۆشی تەندروستیی لەبەر کرد و دەسـتەوانەی نەشـتەرگەریی لەدەسـت کـرد و ڕۆیـشتە ژووری نەشتەرگەرییەوە.

ڕۆژی دوای ئەو ڕووداوە دکتۆر "ڕاسل" هەروەك دەزانین کارەکەی پێڕاگەیشتن بـە وەزعـی ئـەو کەسانە بوو کەلە کاتی نەشتەرگەری یان دواتر دەمردن، هاتە نەخۆشخانە و جەستەی ژنە نەخۆشـە مردووەکەیان پیٚ نیشان دا کە هێشتا لە نەخۆشخانە بوو و بـۆی دەرکـەوت کـە "زانربـروخ" ئـەو ژنەی کوشتووە، بۆیە ڕاپۆرتێکی ئامادە کرد هەتا لـە ڕێگـای لێپرسـراوی نەخۆشـخانەوە بدرێتـە وەزیری تەندروستی. سەرۆکی نەخۆشخانە وتی پاش ڕیسوایی ڕۆژی پێشوو ئەستەمە ئێمە ڕازی بین کە "زانربروخ" جارێکی تر پـیٚ بنێتـە نـاو ژووری نەشـتەرگەرییەوە و ئەگـەر هـات و شـارەداری "درسد" پرسی بۆچی یەکێك لە دەست نیشان کراوەکانی بەدەستی "زانربروخ کوژراوە، پێی دەڵـێین کە بەرپرسی کوژرانی ئەو ژنە خۆی و لێپرسراوانی دیکـەی پایەبـەرزی حیـزبین کـە پـشتیوانی لـە "زانربروخ" دەکەن و ئیزنیان داوە دیسان درێژە بـە کـاری نەشـتەرگەری بـدات، دەنـا ئێمـە لـەم نەخۆشـخانەیە دەرگـای ژووری کارمـان بەسـەردیدا دادەخـست و ئێـوەش وەکـوو پـشکێنەری مردووەکانی نەخۆشخانە، پتر لە هەموان بۆ وتوویژ لەگەڵ "زانربروخ" گونجاوترن و بڕۆنە ماڵەکـەی و پێی بڵێن کە ڕازی بێت خانەنشین بکرێت و هەموو مـاف و حقـووقی ئێـستاشی پـیٚ دەدرێـت و ئەگەر ڕازی نەبوو پێی ڕابگەیەنن کە لەمەوبەدوا لە هیچ نەخۆشخانەیەك ئیزنی کارکردنی نابێت. ڕۆژێك کە دکتۆر ڕاسل سەردانی ماڵی "زانربوخ"ی کرد بۆ ماوەی سـیٚ کاتـژمێر لەگـەڵی قـسەی کرد کە گێڕانەوەی دوور و درێژ و بیٚ سوودە، بە کورتی قسەکانی دکتۆر ڕاسل ئەمە بوو و هـەوڵی دا "زانربـروخ" تێبگەیـەنیٚ کـە ئـەو بـەهۆی سـفت بوونـەوەی خانـەکانی مێـشکی تووشـی لەبیرچوونەوەی کاتی بووە و ئەو شێتیەش بەردەوام لە کـاتی ئەنجامـدانی نەشـتەرگەریدا سـەرهەڵ

دەدات، بۆیە ئیتر نابێ کار بکات، مەگەر ئەوەی کە دەرمان بکرێت و بسەلمێنرێ کە تووشی شێتی و فەر امۆشی نابێتەوە. راسل هەوڵی دا بە "زائربروخ" بلێت کە ئەو و پزیشکانی دیکەی ئەڵمانیا لە وەلاتانی بەناچاریی ئەو لە کاری نەشتەرگەری بەداخن و نانایانەوێ زانستی پزیشکی و نەشتەرگەریی ئەڵمانیا، لە هاوکاریی وەها مامۆستایەکی بلیمەت بێبەش بکرێت، بەڵام کاتێک خۆشەویسترین خزمی مرۆڤ کۆچی دوایی دەکات ئایا بۆ مرۆڤ ئەو ئیمکانە هەیە بەهۆی هۆگری و خۆشەویستییەك کە بۆی هەیەتی، لە ئەسپەردە کردنی خۆی بپارێزێ؟ هەرچەندە دکتۆر "راسل" تێکۆشا "زائربروخ" بە خانەنشین کردن رازی بکات و لاپەڕەیەك کە هەر بەو مەبەستە بردبووی، واژۆی بکات، "زائربروخ" رەزامەندیی نیشان نەدا و رایگەیاند نامەوێ خانەنشین بیم و دکتۆر راسل پاش سێ کاتژمێر وتووێژ وتی ناتوانم لەوە زیاتر لەگەڵتان بدوێم و تەنیا پێتان رادەگەیەنم کە ئیتر لەمەوبەدوا نە لە نەخۆشخانەی "شاریتی" و نە لە هیچ نەخۆشخانەیەکی تر ئیزنتان پێنادەن بڕۆنە ژووری نەشتەرگەرییەوە.

دوای ئەوەی کە دکتۆر "راسل" لە ماڵی "زائربروخ" گەڕایەوە، ئەنجامی وتووێژی خۆی لەگەڵی گەیاندە وەزیری تەندروستی و وتی "زائربروخ" ئامادە نیە خانەنشین بکرێت و لەبەر ئەوەی کە ئامادە نیە بە رەزامەندیی خۆی خانەنشین بکرێت، دەبێ بەپێی رێوشوێنی گشتیی خانەنشینی، لەکار وەلا بنرێت و خانەنشین بکرێ. لەو دەورانەدا لە ئەڵمانیا، تەمەنی ناچاریی خانەنشینی لەبارەی ئەو کەسانەی کەلە بوودجەی گشتیی مووچەیان وەردەگرت، حەفتا ساڵەیی بوو.

بەڵام نموونەی دەگمەنیش هەبوو و دەوڵەتی ئەڵمانیا لە خانەنشین کردنی هەندێ لە فەرمانبەران کە تەمەنیان لە حەفتا ساڵیش تێدەپەڕی، خۆی دەبوارد و هەبوون کەسانێك کە تەمەنیان پتر لە حەفتا ساڵیش بوو و دوای ئەوەی کە هەندێ لە کاتی خانەنشینییان دەگوزەرا، بەهۆی نیاز بە پسپۆڕییەکەیان هەمیسان بۆ خزمەت بانگیان دەکردەوە. بەهەرحاڵ حکوومەتی ئەڵمانیای رۆژهەڵات دەیهەویست "زائربروخ"ی پێچەوانەی مەیلی خۆی خانەنشین بکات، بەڵام وەزیری تەندروستی بە دکتۆر "راسل"ی گوت لەبەر ئەوەی زائربروخ لەناو خەڵك خاوەنی خۆشەویستی و ناوبانگێکی زۆرە، ئەگەر بێت و پێچەوانەی ویستی خۆی خانەنشینی بکەین، لەناوخۆ و دەرەوەی ئەڵمانیا رەنگدانەوەی خراپی دەبێت، ئایا لەوە تێدەگەن کە مەبەستم لەو بەرەنجامە خراپەی کەلە دەرەوەی ئەڵمانیا دەبێت چییە؟

دکتۆر "راسل" گوتی دەزانم مەبەستی ئێوە ئەمەیە کە پیاوە سیاسییەکانی یەکیەتیی سۆڤیەت سەریان سوڕ دەمێنێ و ناڕەزایەتی دەردەبڕن. دواتر دکتۆر "راسل" جانتاکەی کردەوە و

پەروەندەیەکی تێدا دەرهێنا و رایگەیاند ئێمە ئەم پەروەندەیە کە ئاسەواری جینایەتی ناعەقلانیی "زائربروخ"ە، رەوانەی دەوڵەتی یەکیەتیی سۆڤیەت دەکەین هەتا ئەوانیش بزانن کە ئێمە ناچار بووین "زائربروخ" خانەنشین بکەین. وەزیری تەندروستی رایگەیاند، کەوایە من بە باشی دەزانم "زائربروخ" لەسەر ویست و مەیلی خۆی خانەنشین بکرێ و من لەم بارەوە لەگەڵ دکتۆر "راگش" قسە دەکەم و هیوادارم بەڕێزیان لەمەڕ خانەنشین بوون قەناعەت بە "زائربروخ" بێنێ.

دکتۆر "براگش" سەرۆکی کۆلیژی پزیشکیی ئەڵمانیای رۆژهەڵات بوو و کۆمەڵگەی ئەڵمانی رێز و حورمەتیان بۆ سەرۆکی کۆلیژی پزیشکی دادەنا و ئێستاش لە ئەڵمانیا ئەو رێز و حورمەتە هەر ماوە. سەرۆکەکانی کۆلیژی پزیشکی لە ئەڵمانیا، هەمیشە لەناو مامۆستایانی توێژەری پزیشکی یان نەشتەرگەریدا هەڵدەبژێردران و لە رابردوودا ئەگەر لە خودی ئەڵمانیا ئەگەر بۆ سەرۆکایەتیی کۆلیژی پزیشکی مامۆستایەك نەبوایە کە ئەو تایبەتمەندییانەی هەبێت، گرفت نەبوو لەوەی کە مامۆستایەکی بیانی بکەنە سەرۆکی کۆلیژی پزیشکی، هەروەك لە سەدەی شازدەیەمی زایینی "پاراسلس"ی سویسراییان کردبووە سەرۆکی کۆلیژی پزیشکیی ئەڵمانیا و پاراسلس یەکەم پزیشکە کە هەندێ لە نەخۆشەکانی لە رێگای ئاسن کێش یانی بەو تایبەتمەندییەی کە موغناتیزی ئاسن کێش هەیەتی دەرمان و چارەسەر کرد. شێوازی دەرمانی "پاراسلس" بەم چەشنە بوو کە ئاسن کێشەکەی لەسەر ئەو ئەندامەی لەشی نەخۆش کە ئازاری هەبوو دەبەست و پاش چەند رۆژ، بەبێ ئەوەی کە نەخۆشەکە دەرمانێك بخوات، بە تەواوەتی ئازاری نەدەما و چاك دەبۆوە.

براگش سەرۆکی کۆلیژی پزیشکیی ئەڵمانیای رۆژهەڵات ساڵی ۱۹۳۵ بە یارمەتیی "دماك" بیرمەندێکی ئەڵمانی، دەرمانەکانی ناسراو بە "سولفامید" کە بۆ چارەسەریی بەشێك لە نەخۆشییەکانە، کەشف کرد. لەو کاتەدا کەشفی دەرمانەکانی "سولفامید" لە دنیای پزیشکیدا دەنگدانەوەی زیاتری لە کەشفی دەرمانەکانی ئانتی بیۆتیك (پنی سلین) لە ساڵانی دواتردا هەبوو، چونکە بە دەرمانەکانی سولفامید دەرد و ئازاری زیاتر سارێژ دەکران و ئیتر کەمتر دەرمانی ئانتی بیۆتیکیان لە رێگای دەرزییەوە بەکار دەهێنا، بەڵکوو دەیان دا بە نەخۆش کە بیخوات، چونکە گرفتی پاراستن و وەشاندنی دەرزیی پنی سیلینی نەبوو. براگش سەرۆکی کۆلیژی پزیشکی بەهۆی ئەو پلە زانستییەی و هەروەها ئەو حورمەتەی کە لەلای نەشتەرگەران و لەناو کۆمەڵگەی ئەڵمانی هەیبوو، تاقە کەسێك بوو کە دەیتوانی قەناعەت بە "زائربروخ" بێنێ بە خانەنشین بوونی قەناعەت بێنێت.

دکتۆر براگش بە دەستخەتی خۆی نامەیەکی بۆ "زائربروخ" نارد و بۆ چایی ئێوارە بانگهێشتی

ماڵی خۆی کرد و پاش هاتنی "زائربروخ" لەگەڵ هاوسەر و کوڕەکەی پێشوازیان لێکرد هەتا ئەو دیدارە وەك دیدارێکی دۆستانە و بنەماڵـەیی بێتـە ئـەژمار و وەك دیـدارێکی فـەرمی لـە قەڵـەم نەدرێت. سەرۆکی کۆلیژی پزیشکی لە هەموو بابەتێکەوە قسەی کرد بێجگەلە هۆکاری سـەرەکیی بانگهێشتی ئەو پزیشکە مەزنە. خودی "زائربروخ" هەروەك گومان بێجگەلە لەو کاتانەی شێتی و فەرامۆشی رووی تێدەکرد، هۆش و بیری لەسەرخۆ بوو و تێدەگەیشت کە "براگش" بە مەبەستێکی تایبەت بانگهێشتی کردووە و گوتی من هەست دەکەم ئەم کۆبوونەوە دۆستانە بێهۆ نیە و بێگومان ئێوە کارێکتان پێم هەیە.

براگش لە وەڵامدا گوتی: بەڵێ "فێردیناند"ی ئازیز (ناوی بـچووکی زائربـروخ)، مـن دەمـەوێ ئامۆژگارییەکتان بکەم چونکە خۆشتانم دەوێ. "زائربروخ" پرسیاری کرد ئەو ئامۆژگارییە چییە؟

"براگش" رایگەیاند، بەبێ ئـەوەی کـە بـەوێ زێـدەڕۆیی بکـەم، دەڵـێم ئێـوە بەرجەسـتەترین نەشتەرگەرن کەلە پانسەد ساڵی رابردوودا لە دنیای پزیـشکیدا سـەریهەڵداوە و لـە مـاوەی پێـنج سەدەدا لە بواری پزیشکیدا کەسی دیکە نیە کە لەگەڵ ئێوەدا بەراورد بکرێت و باس لە هەرکـەس بکرێت ناوی لە دوای ئێوەوەیە و ئەویش بە ئاستێکی زۆرەوە، من حەز دەکەم شانازییەکان و نـاوی مەزنی ئێوە، بۆ هەمیشە لە مێژووی زانستی پزیشکی و نەشتـەرگەریدا بمێنێتەوە و هیچ پەڵەیـەك نەتوانێ لە درەوشاوەیی ناوی ئێوە کەم بکاتەوە.

"زائربروخ" هیچی نەگوت و چاوەڕێی درێژەی قسەکانی "براگش" مایـەوە. سـەرۆکی کۆلیـژی پزیشکی گوتی ئێوە لە من باشتر دەزانن کە نەشتەرگەرێك هەرچـەندەش خـاوەنی وەزە و توانـایی بێت، رۆژێك بەهۆی چوونەسەری تەمەن، تووشی سـستی و لاوازی دەبێـت و ئەگـەر بێـت و لـە رێگای بەهێزکردنی لێنزی چاویلکەکەیەوە، ئاسـتی بینینـی خـۆی بپـارێزێ، (زائربـروخ بـەردەوام چاویلکەی بەکار دەهێنا) ناتوانێ پێش بە لەرزەی دەستەکانی بگرێت و ئەوکات ئیتر ناچار دەبێـت کە دەست لە کـارکردن هـەڵبگرێت. ئایـا باشـتر نیـە ئێـوە لـە لووتکـەی شانازی و ناوبـانگ و خۆشەویستیدا لە کار بکشێنەوە، هەتا ناوی مەزنتان بۆ هەمیشە بە گەورەیی لە مێژووی پزیشکی و نەشتەرگەریدا بمێنێتەوە و پاشماوەی تەمەنتان بۆ نووسینەوەی بیرەوەرییە پزیشکییەکانت تـەرخان بکەیت بۆ ئەوەی هەموان و تەنانەت نەوەکانی داهاتووش سوودی لێ بگرن.

سەرۆکی کۆلیژی پزیشکی پاش ئەم قسانە چونکە پێشبینیی دەکرد کـە وتووێژەکـەیان دەگاتـە شوێنێکی هەستیار، ئاماژەی بە هاوسەر و کچ و کوڕەکەی کرد کـە ژوورەکـە چـۆڵ بکـەن. پـاش رۆیشتنی ئەوان "زائربروخ" گوتی من بەپێچەوانەی ئەو وتانەی ئێوە وا هەست دەکەم دەیانەوێ لە

کارکردن وەلام بنێن. "براگش" وتی: فێردیناندی ئازیز باوەڕ بکەن، ئێوە هەمیشە لەلایەن کەسانی دیکەوە ئێرەییتان پێدەبرێ و ئێستاش هەر وایە، بەلاّم بڕواتان هەبێ مـن لـە ڕیـزی چاوچـنۆکانی ئێوەدا نیم، چونکە جیا لە هەستی دۆستانەی پێشوو، من نەشتەرگەر نیم هەتا ئەوەی کە ئێرەیتان پێ ببەم و ئەوەی کە دەیلێم لەڕووی دۆستایەتی و هۆگری و شانازییە بە ناوی پاکتان.

بۆیە ئامۆژگاریتان دەکەم و پێشنیار دەکەم بـە فـەرمانی خانەنـشینییەکەتان ڕازی بـن و مـن دەزانم کە ئێوە وەك هەمیشە زانستتان بۆ خزمەت و هاوکاریی مرۆڤ ویستووە و هیچکات لە بیری پێکەوەنانی ملك و دارایی لە ڕێگای زانست و هونەرەوە نەبوون و سەرەڕای ئەوەی کـە دەتـانتوانی لە ڕێگای دەسەلاّتداران و سەرۆکانی دیکەی ئێودەولّەتی کە مەعلیجە و نەشتەرگەریت بۆ کردوون، هەر شتێك کە بخوازن لێیان وەربگرن. ئەمڕۆکە بەهۆی پشت گوێ خستنی پارە و سامان و موڵکی دنیا هیچتان نیە کە پاش دەست هەلگرتن لە کاری پزیشکی پێوەی بژین، بۆیە من ئەو متمانەتان پێدەدەم بەهۆی ئەو یاساوە کە پەسند دەکرێت هەمرو ئەو حقووق و مووچەیەی کە ئێستا هەتانـە، هەتا کۆتایی تەمەن پێتان دەدرێت، بۆیە ئێوە بە هیچ لەونێ لـەباری بـژێوی ژیانـەوە هەسـت بـە کەموکوڕی ناکەن.

"زانربروخ" پاش بیستنی ئەو قسانە گوتی من سەرسـامم کـە لەبەرچـی ماوەیەکـە پێـداگری دەکەن کە من لەکار بکشێمەوە و خانەنشین ببم؟ "براگش" گوتی: "فێردیناند"ی ئازیز، بەوپـەڕی ڕێز و حورمەتێك کە بۆتام هەیە و تۆ بە یەکێك لە بلیمەتەکانی مرۆڤایەتی دەزانم، دەبێ ئـەوەتان پێ بلّێم کە ئێوە ماوەیەکە لە کاتی ئەنجامدانی نەشتەرگەریدا شـێت دەبـن و ئـەو نەخۆشـەی کـە لەبەر دەستت دایە دەیکوژی و کاتێك دەیانەوێ پێشت پێبگرن، بـەو کـاردە نەشـتەرگەرییەی کـە بەدەستتەوەیە هێرش دەکەیە سـەر کەسـانی دەورووبـەرت، بەداخـەوە هـەتا ئێـستاش کۆمـەڵێك نەخۆش بەدەستی تۆ کوژراون و تۆش ئاگات لە شێتیی خۆت نیـە، چـونکە پـاش ئـەوەی مـاوەی سەرهەلّدانەوەی شێتی و فەرامۆشییەکەت تێپەڕی ئیدی لەبیرت دەچێتەوە کە چت کردووە و هـەتا ئەمڕۆکە جیا لەوەی کە تووشی چەندین حاڵـەتی کوشـتن بـووی، بـەهۆی ڕێزدانـان بـۆ پێـشینەی درەوشاوەت، نەیانوسیتووە لە لایەنی یاساییەوە ڕووبەڕووی سزات بکەنەوە، بەلاّم لەمەوبەدوا ئـیتر ئەستەمە بهێڵن لە نەخۆشخانەی "شاریتی" یان نەخۆشخانەکانی دیکەی ژێر چاوەدێریی وەزارەتـی تەندروستی کاری نەشتەرگەری بکەیت.

من دەزانم کە تۆ ئێستا ئەو جینایەتانەی کەلـە کـاتی نەشتەرگەریدا ئـەنجامت داون، وەبـیرت نایەنەوە، چونکە خەسڵەتەکانی شێتیی دەروویی و کاتی ئەمەیە کە پیـاو یـان ژنـی دێوانـە پـاش

ئەوەی دەورەی هێرشی فەرامۆشییەکەی تێپەڕی، ئەو کارانەی کە لەو ماوەیەدا کردوویە فەرامۆش دەکات و تۆ کە نەشتەرگەرێکی بلیمەتی، باشتر لە من دەزانی کە شێتیی دەورەیی و فەرامۆشیی کاتی چۆنە و لەلای هەر کەسێك ئەو حاڵەتە لە کاتێکی تایبەتدا سەرهەڵدەدات، بەداخەوە ئەو حاڵەتە لای تۆش بە بەردەوامی کاتێك سەرهەڵدەدات کەلە ژووری نەشتەرگەری کاردت بەدەستەوەیە و سەرقاڵی کاری نەشتەرگەریت.

بەڵام "زائربروخ" دیسان قەناعەتی نەکرد و بە فەرمانی خانەنشینییەکەی رەزامەندی نیشان نەدەدا و "براگش" پێی گوت، "فێردیناند" کاتێك دەبینی کەس خوازیاری درێژەی کاری نەشتەرگەریی تۆ نیە و هەموان لەسەر ئەوە کۆکن کە ئیتر نابێ کار بکەیت، بۆچی پێداگری لەسەر کار کردنت دەکەیت و ئایا ئەم پێداگرییە، لەگەڵ پێگە و کەسایەتیی زانستیی ئێوە ناتەبا نیە؟

"زائربروخ" بەهۆی پێداگریی سەرۆکی کۆلێژی پزیشکی بە فەرمانی خانەنشین بوونی خۆی رازی بوو و بڕیار بوو "براگش" ئەو هەواڵە بگەیەنێتە وەزیری تەندروستی و لە رۆژی دیاریکراودا "زائربروخ" سەردانی وەزیر بکات و رازی بوونی خۆی بە نووسراوە پێشکەش بکات هەتا ئەوەی وەزیری تەندروستی کار و رەوتە یاساییەکانی پێوەندیدار بە خانەنشین بوونی بۆ بە ئەنجام بگەیەنێ.

"براگش" کە پێشبینیی ئەوەی دەکرد "زائربروخ" مەسەلەی رۆیشتن بۆ لای وەزیری تەندروستی فەرامۆش دەکات یان ئەگەریش لەبیری نەچێتەوە نایهەوێ بڕوات، بۆیە لە رۆژی دیاریکراودا، سەردانی ماڵی ئەو نەشتەرگەرەی کرد و لەگەڵ خۆی بردی بۆ لای وەزیری تەندروستی. وەزیری تەندروستیش کە پێشبینیی کردبوو لەوانەیە "زائربروخ" حاشا لەو کارانەی بکات، داوای لە دکتۆر "هاڵ" و دوکتر "راسل" و سەرۆکی نەخۆشخانەی شاریتی داوای کرد لە وەزارەتی تەندروستی ئامادە بن و پەروەندی پێوەندیدار بەو کەسانەی کە بەدەستی "زائربروخ" مردوون، لەگەڵ خیان بهێنن کە ئەگەر پێویستی کرد، بەڵگەکانی ئەو پەروەندانە پیشانی ئەو نەشتەرگەرە بلیمەتە بدرێت.

پاش ئەوەی "براگش" لەگەڵ "زائربروخ" هاتنە ناو وەزارەتی تەندروستییەوە، بە تەنیایی رەوانەی ژووری وەزیری کرد و خۆی رۆیشتە ژوورێکی تر کە دکتۆر هاڵ و کەسانی دیکە لێی دانیشتبوون.

وەزیری تەندروستی بە رێز و حورمەتەوە پێشوازیی لە "زائربروخ" کرد و گوتی زۆر خۆشحاڵم بەوەی کە ئێوە بڕیارتان داوە لەمەوبەدوا کارێکی زۆر بەکەڵك کە گەرەنتیی پەروەردەی نەوەکانی ئەڵمانیا و هەم مرۆڤایەتی و هەم هۆکاری هەرمانیی ناوی مەزنی خۆتانە دەست پێکردووە و من

بەڵێنیتان پێدەدەم کە بیرەوەرییەکانتان لە کتێبدا بڵاو دەبێتەوە و بۆ ئەوەش کە خەڵك زووتر لە ئەزموونەکانتان کەڵك وەربگرن هەر ئەندازە لە بیرەوەرییەکانتان کە ئامادە بکرێ، بەرگ بە بەرگ بڵاویان دەکەینەوە، بەڵام بۆ ئەوەی مەسەلەی خانەنشین بوونتان رەوتی یاسایی خۆی بپێوێ، تکایە بڕیاری خۆتان بکەنە نووسراوەیەك.

"زائربروخ" لە پشتی چاویلکەوە، چاوەکانی کە وەك چاوی منداڵ ساف و مەزلوومانە بوو، بڕییە چاوەکانی وەزیری تەندروستی و پرسیاری کرد مەبەستی ئێوە لەوەی کە من بڕیاری خۆم بهێنمە سەر کاغەز چییە؟ وەزیری تەندروستی رایگەیاند مەبەستم ئەوەیە بنووسن کە بەتەمان خانەنشین بکرێن. زائربروخ لە وەڵامدا گوتی من بەتەما نیم خانەنشین ببم.

وەزیری تەندروستی گوتی مەگەر ئێوە لە دیدار لەگەڵ دکتۆر "براگش" سەرۆکی کۆلیژی پزیشکی رەزامەندیی خۆتان بەم مەسەلەیە رانەگەیاند؟ "زائربروخ" وەڵامی دایەوە لە ماڵی دکتۆر "براگش" بەڕێزیان پێداگریی کرد کە من لەکار بکشێمەوە و لەبەر ئەوەی من ڕێز بۆ دۆستایەتیی نێوانمان دادەنێم، نەمویست دەستی نا بە روویەوە بنێم. وەزیری تەندروستی کە نەیدەویست بەتەنیایی لەگەڵ "زائربروخ" وتوویژ بکات وتی بە دکتۆر "براگش" و ئەوانی دی رابگەیەنن بێنە ژوورە و ئەوانیش لە ژوورەکەی دیکەوە هاتنە ژووری وەزیر.

بۆ چەند ساتێك بێدەنگی ژورەکەی داگرت و پاشان وەزیر بە "زائربروخ"ی گوت:

بڕوا بکەن من پتر لە هەموان لە وەلاتانی ئێوە لە کار بەداخم، لەو باوەڕە دام کە ئێوە یەکێك لە شانازییەکانی تەندروستیی ئەڵمانیان، بەڵام رەوشی ئێوە بە چەشنێکە کە ئیتر ناتوانن درێژە بەکار بدەن، مەگەر ئەوەی بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ بحەسێنەوە و چارەسەر بکرێن و دڵنیا بن کە نەخۆشییەکەتان لەناو چووە. "زائربروخ" حاشای لە نەخۆشییەکەی کرد و وەزیری تەندروستی پرسیاری لە دکتۆر "راسل" کرد کە ئایا ئەو پەروەندەتان هێناوە. دکتۆر "راسل" لە جانتاکەی پەروەندەیەکی دەرهێنا و لەبەردەم وەزیری تەندروستیی دانا.

وەزیری تەندروستی پەروەندەکەی کردەوە و روو بە "زائربروخ" گوتی من وێڕای ئەوەی کە زۆر بەداخم، بەڵام ناچارم کورتەی ئەو شتەی کە لەناو ئەم پەروەندە دایە بۆتانی باس بکەم هەتا بزانن کەلە ماوەی یەکساڵی رابردوودا لە نەخۆشخانەی شاریتی بەڕێزتان بەهۆی فەرامۆشی و نەخۆشیی دەورەیی ئێوە تووشی چ هەڵەگەلێك بوون. پاشان وەزیری تەندروستی دەستی کرد بە باس کردنی ناوەرۆکی پەروەندەکە کە پێوەندیی بەو جینایەتە نا ئیرادەییانەوە بوو کە "زائربروخ" لە ژووری نەشتەرگەری ئەنجامی دابوون. پاش ئەوەی وەزیری تەندروستی کورتەیەك لە هەرکام لە جینایاتە

غەیرە ئیرادەییەکانی "زانربروخ"ی هاوکات لەگەڵ ناوی کوژراوەکـان و چـۆنیەتیی نەشـتەرگەری و ڕێکەوتی کارەکەی بۆ "زانربروخ""" باس کرد، ئەو پزیـشکە وتـی ئەمانـە ئـەو تۆماتەنانـەن کـە چاوچنۆکەکان بۆ منی هەڵدەبەستن و من بە درێـژایی تەمـەنم زۆر کـەس لـە هاوکـارانم ئێرەییـان پێبردووم.

وەزیری تەندروستی وتی وای دابنێین کە دکتۆر "راسـل" و دکتـۆر "هـاڵ" و ئـەو پزیـشکانەی کەلە ژووری نەشتەرگەری یاریدەدەرتان بوون ئێرەییان پێبردووی لـەخۆڕا تۆمـەتیان لێـداوی، ئایـا خوێندکارانی کۆلیژی پزیشکی کە بۆ وانـەی فێرکـاری هاتبوونـە ژووری نەشـتەرگەری و ئێوەیـان وەکوو خودا دەپەرست بەشێکن لەوانەی کە ئێرەییتان پێدەبەن؟ ئەوەی کـە ئـەوان لـەو ڕۆژەدا لـە ژووری نەشتەرگەری بینییـان، واتـە مێـشکی نەخۆشـەکەتان وەکـوو پارچـە کێـك دەبـڕی لـەناو دەستیانت دادەنا، ئەوەندە بەلایانەوە سەیر و و ترسێنەر بوو کە نەیانتوانی لە لەقاودانی خۆ ببوێرن و ئەگەر ئێوە حاشای لێبکەن، من هەموو خوێندکارانی کۆلیژی پزیشکی کە ئـەو ڕۆژە لـە ژووری نەشتەرگەرییەکە بوون، دەنێرمە لاتان هەتا لە یەکە بە یەکەیان پرسیار بکەن بۆ ئەوەی بزانن لـەو ڕۆژەدا چیتان کردووە؟

"زانربروخ" هێشتا قبوولی نەکردبوو کە ئەوەی لەو پەروەندەیەدا نووسراوە، هەقیقەتە و وەزیری تەندروستی بۆ ئەوەی کۆتایی بەو باس و وتووێژە بێنێت گوتی جەنابی "گهیم رات" ئەم بەڕێزانەی کە لێرە ئامادەن دەزانن من لەو کەسانەم کە ڕێز و حورمەتتان بۆ دادەنێم و لـە ئـەبوونی ئێـوەدا، هەمیشە پشتیوانم لێکردوون. منیش سـەرەتا کـە بیـستم ئێـوە لـە ژووری نەشـتەرگەری بـەهۆی فەرامۆشی و لەبیرچوونەوەی نائیرادییەوە، تووشی کوشتنی نەخۆشەکان دەبن، یان نەخۆشەکان ناقز و ئیفلیج دەکەن پێم وابوو ئێرەییت پێدەبەن، بەڵام پاش لێکۆڵینەوە بۆم دەرکەوت ئـەوەی دەیڵـێن ڕاستە و ئێستا من بەهۆی ئەو ئەرك و بەرپرسایەتییەی کە هەمە، ناچارم لە کـار وەلاتـان بنـێم و ئەگەرچی پێچەوانەی ویـستی ئێـوەش بێـت و لەمەویـەدوا لـە هـیچ نەخۆشـخانەیەك کـە لـەژێر چاوەدێریی وەزارەتی تەندروستی دایە، ئیزنی ڕۆیشتنە ناو ژووری نەشـتەرگەریتان پێنادرێت، بـەڵام هەموو ئەو ماف و مووچەیەی کە ئەمڕۆ وەردی دەگـرن هـەتا ئـەو ڕۆژی زینـدوون، بـەهۆی ئـەو یاساوە کە بەیانی پێشکەشی پارلەمان دەکرێت، پێتان دەدرێت.

"زانربروخ" پـاش چـەند سـاتێك بێـدەنگی گـوتی هەرچـتان حـەزتان لێیـە بیکـەن. وەزیـری تەندروستی پرسیاری کرد ئایا رازی دەبیت خانەنشین بکرێیت؟

زانربروخ گوتی: بەڵێ.

وەزیری تەندروستی کاغەز و پێنووسێکی دایە دەستی "براگش" سەرۆکی کۆلیژی پزیشکی کەلە پەنای "زانربروخ" دانیشتبوو، هەتا واژۆی بکات. سەرەڕای ئەوەی کە "زانربروخ"ی مامۆستا لە وەڵامی وەزیری تەندروستیدا گوتی "بەڵێ" بەڵام لە واژۆی ئەو کاغەزەی کە خانەنشین بوونی مسۆگەر و یەکلایی دەکردەوە خۆی بوارد و دواتر هەستایە سەرپێ و چاوێکی لە ئامادەبوان کرد هەتا لە ژوورەکە وەدەرکەوێ "براگش" سەرۆکی کۆلیژی پزیشکی گوتی "فێردیناند" چەند ساتێك راوەستێ. "زانربروخ" راوەستا و وەرسووڕا و "براگش" هەستایە سەرپێ و بەرەو لای هات و ماچی کرد.

دوای ئەو وەزیری تەندروستی بە "زانربروخ" نزیك بۆوە و لە باوەشی گرت، بەڵام ئەوانی دیکە نەیانوێرا "زانربروخ" ماچ بکەن، چونکە لە بەرامبەر ئەودا خۆیان زۆر بە بچووك دەزانی.

## ئەنجامی پەلەی هەواڵنێرێکی فەرەنسی

بارودۆخی بەرلین کاتێك ئەو رووداوانە روویان دەدا، لە بواری سیاسییەوە لەگەڵ دۆخی ئەمرۆ جیاوازیی هەبوو، ئێستا لە نێوان بەرلینی رۆژهەڵات و بەرلینی رۆژئاوادا هیچ جۆرە پێوەندییەك لە گۆڕێدا نیە و دیوارێکی گەورە کە رۆژ و شەو بەهۆی نیگابان و تێلدڕوو و سەگی پارێزەرەوە چاوەدێری دەکرێت و دوو بەشی "بەرلین"یان لێك جیا کردۆتەوە و کەس ناتوانێ هاتوچۆی هیچ بەشێکیان بکات. (هەڵبەت نووسەر کاتی دابەش بوونی بەرلین بە دوو بەشەوە ئەم دێرانەی نووسیوە و ئێستا وا نیە و یەکیان گرتۆتەوە و: ك).

بەڵام لەو بارودۆخەدا هەردوو بەشی بەرلین، وەکوو ئەمرۆکە لێك جیا نەبوون و هەواڵنێرانی دانیشتووی بەرلینی رۆژئاوا ئاگایان لە رووداوەکانی بەرلینی رۆژهەڵات بوو و هەروەها بە پێچەوانەش، یەکەم هەواڵنێری دانیشتووی بەرلینی رۆژئاوا کە هەواڵی خانەنشین بوونی "زائربروخ"ی زانی "پل ـ رائوو" هەواڵنێری هەواڵدەریی فەرەنسا بوو. ئەو نەتەنیا پێگەی زانستیی "زائربروخ"ی بەرز دەنرخاند، بەڵکوو یەکێك لە هاوەڵەکانی بوو و جارێك هاورێ لەگەڵ هاوسەرەکەی لە ماڵی "زائربروخ" مابۆوە.

"پل ـ راوو" تەلەفۆنی بۆ ماڵی "زائربروخ" کرد، بەڵام "زائربروخ" لە ماڵ نەبوو و خزمەتکارەکەیان وەڵامی پرسیاری هەواڵنێری هەواڵدەریی فەرەنسای دایەوە و گوتی هەواڵی خانەنشین بوونی جەنابی "زائربروخ" راستە. "پل ـ رائوو" کە خزمەتکاری ناسراو بە "نان یس"ی دەناسی، بۆ بەدەستهێنانی زانیاریی زیاتر سەردانی ماڵی "زائربروخ"ی کرد. "نان یس" کە دەیزانی هەواڵنێری فەرەنسی یەکێك لە دۆستانی "زائربروخ"ە، بۆیە بێ ترس وەڵامی دایەوە و گوتی لە هۆکاری خانەنشین کرانی جەنابی "زائربروخ" نازانم و هەر ئەوەندە دەزانم کە خانەنشینیان کردووە.

پاشان "نان یس" گوتی:

ئەمرۆ کاتێك بەرێزیان هاتنەوە ماڵ، من لە چێشتخانە بووم و هاتە ژوورەوە و گوتی "نان یس" منیان دەرکردووە. منیش گوتم بەرێز چۆن دەبێ کەسێکی وەك ئێوە لە کار دەربکەن؟ ئەو بەرێزە وەڵامی دایەوە هەر ئەوەی کە گوتم منیان لە نەخۆشخانە دەرکرد و گوتیان ئیدی نابێ لە

نەخۆشخانەکان کار بکەم، هەواڵنێرەکە پرسیاری کرد ئایا ئێوە پرسیارتان نەکرد لەبەرچی دەریان کردووە؟

"ئان یس" وەڵامی دایەوە نا ئەمن ئەمەم لە بەرپرسیان نەپرسی و بۆ خۆشی هۆکاری دەرکردنەکەی باس نەکرد.

"پل ـ راوو" کە پێشبینیی ئەوەی نەدەکرد خانەنشین بوونی ئەو مامۆستایە هۆکاری تێکچوونی باری دەروونی بێت و لەلای بوو بە یەقین کە لەکار وەلانانی "زائربروخ" هۆکاری سیاسییە. هەواڵنێری فەرەنسی پرسیاری لە ژنە خزمەتکارەکە کرد کە بەرپرسیان چ کاتێک دەگەڕێنەوە ماڵ هەتا من لەگەڵ خۆیان قسە بکەم "ئان یس" وەڵامی دایەوە کاتی گەڕانەوەی بە من نەوتووە، بەڵام پێم وایە پێش لە کاتی شێو خواردن بگەڕێتەوە. یەکێك لە ئەرکەکانی هەواڵنێرانی رۆژنامە و هەواڵدەرییەکان خێراییە لە گەیاندنی هەواڵەکان بۆ ناوەندی رۆژنامە و هەواڵدەرییەکان، بۆیە "پل ـ راوو" تاقەتی نەهێنا هەتا ئەوەی کە خودی "زائربروخ" ببینێ و هۆکاری سەرەکیی خانەنەشین بوونی لەزاری خودی ئەو پیاوەوە ببیستێ، چونکە گەیاندنی هەواڵ بە ناوەندی هەواڵدەری (پاریس) وەدوا دەکەوت، بۆیە هەواڵێکی لەم چەشنەی رەوانە کرد: (پرۆفیسۆر فێردیناند "زائربروخ"، نەشتەرگەری بلیمەت کە یەکێك لە شانازییەکانی ئەڵمانیایە، لەوپەڕی توانایی جەستەیی و رۆحیدا لەلایەن وەزارەتی تەندروستیی حکومەتی ئەڵمانیای رۆژهەلاتەوە خانەنشین کراوە و شیمانەی ئەوە دەکرێت کە ناوبراو بوویێتە قوربانیی پاکانە و کایەی سیاسی ...).

هەواڵدەریی فەرەنسا هەواڵێك کە لەلایەن "پل ـ راوو"وە نێردرابوو وەك هەمیشە بە هەموو دونیادا بڵاوی کردەوە و ئەو هەواڵە لە هەموو رۆژنامەکانی ئەورووپا و ئەمریکا کە "زائربروخ"یان دەناسی چاپ و بڵاو کرایەوە و لە هەندێ لە رۆژنامەکانی ئاسیا و ئەفریقاش کە ناوی "زائربروخ"یان بیستبوو، بڵاو کرایەوە.

لە وڵاتانی ئەڵمانیای رۆژئاوا و رۆژهەڵات و سویسرا، تەنانەت رۆژنامەیەك نەبوو کە ئەو هەواڵە چاپ و راڤە و شرۆڤەی نەکات، لە وڵاتی سویسراش وەکوو ئەڵمانیا "زائربروخ"یان بە باشی دەناسی، چونکە ئەو نەشتەرگەرە بلیمەتە ماوەیەك لە سویسراش کاری کردبوو. سەرلەبەیانیی رۆژی دواتر کە هەواڵی خانەنشین بوونی "زائربروخ" لە هەموو رۆژنامەکاندا بڵاو کرابۆوە، "پل ـ راوو" دیسان پێوەندیی لەگەڵ ماڵی "زائربروخ" گرت کە لەگەڵ خۆی سەبارەت بە هۆکاری خانەنشین بوونی وتووێژ بکات و "زائربروخ" پێی گوت نیوەڕۆ وەرەوە ماڵێ هەتا پێکەوە

قسە بکەین.

"پل ـ راوو" کە رۆژی پێشتر ئەو هەواڵەی ناردبوو، پێشبینی ئەوەی نەدەکرد کە بڵاو بوونەوەی ئەو هەواڵە لە رۆژنامەکاندا بۆ "زانربروخ" و وەزارەتی تەندروستیی ئەڵمانیای رۆژهەڵات چ گرفت و کێشەیەك دەخولقێنێ. ئەگەر هەواڵی خانەنشین بوونی "زانربروخ" بەبێ رادەربرینی هەواڵنێری فەرەنسی بڵاو کرابایەوە، هیچ کێشەیەك ساز نەدەبوو، چونکە "زانربروخ" کە تەمەنی ببووە حەفتاوچوار ساڵ ـ بەتایبەت بۆ نەشتەرگەردکان، بە تەمەنی خانەنشینی دەهاتە ئەژمار، بەڵام چونکە هەواڵنێری فەرەنسی، نووسیبووی "زانربروخ" بۆتە قوربانیی پاکانە حیسابی سیاسی، وەزارەتی تەندروستیی ئەڵمانیای رۆژهەڵات دەبوا خۆی و حکورمەتی ئەڵمانیای رۆژهەڵات لە تاوان بەری بکات و دەبوا بێدەنگیی خۆیان لەبارەی "زانربروخ"ەوە بشکێنن و هۆکاری سەرەکی باس بکات و رابگەیەنێ کە ئەو نەشتەرگەرە بلیمەتە شێت بووە.

رۆژی دواتر کە رۆژنامەکان هەواڵی خانەنشین بوونی ئەو مامۆستایەیان بڵاو کردەوە، یەکەم کەس کە سەرنجی دا ئەو هەواڵە دەبێ راست بکرێتەوە، دکتۆر "مادلنر" بوو. بەو پێشینە و زانیاریەی کە دکتۆر "مادلنر" لە باری رۆحیی "زانربروخ"ی هەیبوو، پێشبینی کرد بڵاوبوونەوەی هەواڵی هۆکاری وەلانانی "زانربروخ" کەلە رۆژنامەکان چاپ بووە لە رێگای خۆیەوە نەبووە، چونکە ئەگەر "زانربروخ" ویستبای هۆکاری وەلانانی خۆی باس بکات، بێگومان دەیگوت ئێرەیی و چاوچنۆکیی هاوکارەکانی منی خانەنشین کردووە و نەیدەگوت بوومەتە قوربانیی پاکانە حیسابی سیاسی. دکتۆر "مادلنر" هاورێ لەگەڵ سەرۆکی نەخۆشخانە رۆیشتن بۆ ماڵی "زانربروخ" و لەوێ دەرکەوت کە ئەو پیاوە سەبارەت بە هۆکاری خانەنشین بوونی خۆی هەواڵێکی بە هەواڵنێری هەواڵدەریی فەرەنسا نەداوە و ئەو هەواڵنێرە تەنیا پێوەندیی بە "خزمەتکارەکەی (ئان یس)"ەوە کردووە.

نیوەرۆ پاش ئەوەی کە "پل ـ راوو" گەیشت و ئەو دوو کەسەی کە لەلای "زانربروخ" بوون دەیناسین و دەستبەجێ پێنووسەکەی لە گیرفان دەرهێنا هەتا بە گومانی خۆی بۆ کامڵ کردنی هەواڵی رۆژی پێشووی خۆی، لە "زانربروخ" و هەم لەو دوو کەسەش زانیاریی تازەتر وەدەست بخات. دکتۆر "مادلنر" بۆ چەند ساتێك کە سەرۆکی نەخۆشخانە بە هێواشی لەگەڵ "زانربروخ" سەرقاڵی قسەکردن بوو، کەلکی وەرگرت و بە هەواڵنێری فەرەنسی گوت کەلە ژوورەکە دەرکەوێت و پێی گوت جەنابی "راوو" ئێوە دەبێ ئەو هەواڵەی کە ئەمرۆ لە رۆژنامەکان چاپ و بڵاو کراوەتەوە راستی بکەنەوە.

"پل ـ راوو" پرسیاری کرد کام بەشی دەبێ بگۆردرێ؟

دکتۆر "مادلنر" وەڵامی دایەوە ئەو بەشەی کە پێوەندیی بە هۆکاری خانەنشین بوونی پرۆفیسۆر "زانربروخ"ەوە هەیە دەبێ راستی بکەنەوە، چونکە هۆکاری خانەنشین بوونی ئەو مامۆستایە، ئەو مەسەلەیە نیە کە ئێوە نووسیوتانە.

"پل ـ راوو" پرسی ئەی هۆکاری خانەنشین بوونەکەی چییە؟

دکتۆر "مادلنر" لە وەڵامدا گوتی ناتوانم پێتان بڵێم، بەهەرحاڵ ئێوە دەبێ هەواڵی ئەمڕۆی رۆژنامەکان بەم چەشنە راست بکەنەوە کە هۆکاری خانەنشین بوونی "زانربروخ" پاکانە حیسابی سیاسی نیە. هەواڵنێری فەرەنسی وای لێك دایەوە کە ئەگەر بێت و ئەو هەواڵە پڕاست نەکرێتەوە، "زانربروخ" دەکەوێتە ژێر گوشاری حکوومەتی ئەڵمانیای رۆژهەڵات و حیزبی کۆمۆنیستی ئەو وڵاتەوە. پاش چوونە ژوورەوەی و پرسیار لە خودی "زانربروخ" ئەوە تێگەیشت کە ئەویش پێی باشە ئەو هەواڵە پڕاست بکرێتەوە و بەڵێنیی دا کە دەستبەجێ راستکردنەوەی هەواڵەکە بۆ پاریس بنێرێت و بەڵێنییەکەی خۆشی بەجێهێنا. بەڵام رۆژنامەکانی سویسرا و بەتایبەت رۆژنامەکانی ئەڵمانیای رۆژئاوا، بەدواداچوونیان بۆ هەواڵی خانەنشین بوونی "زانربروخ" کرد و زۆربەی رۆژنامەکانی ئەڵمانیا و بەرلینی رۆژئاوا، وەلاتانی "زانربروخ"یان بە هۆکاری سیاسی لە قەڵەم دا.

هەر بەو جۆرەی کە وەزیری تەندروستی گوتبووی پاش ئەوەی "زانربروخ" خانەنشین کرا (دەزانین ئەو مامۆستایە بەڵگەی خانەنشین بوونی واژۆ نەکرد)، لە هیچکام لە ماف و پێداویستییەکانی کاتی کارکردنی بۆ وێنە ترۆمبێل و شۆفێری تەندروستی بێبەش نەکرا. رۆژی پازدەیەمی مانگی دیسامبر لە ماڵی "زانربروخ"ەوە پێوەندییان بە دەرکەوانی نەخۆشخانەی "شاریتی"یەوە کرد کە ئوستاد سواری ترۆمبێلەکەی بووە و بەرەو نەخۆشخانە کەوتۆتە رێ، دەرکەوانیش ئەو هەواڵەی گەیاندە سەرۆکی نەخۆشخانە و پرسیاری کرد کە ئایا پێش بە ترۆمبێلی "زانربروخ" بگرێت یان نا؟

سەرۆکی نەخۆشخانە گوتی پێش بە هاتنی ترمبێلەکەی مەگرن، چونکە هاتنی بۆ نەخۆشخانە کێشە نیە، بەڵام نابێ بچێتە ناو بەشی نەشتەرگەرییەوە. "زانربروخ" لە نەخۆشخانەی "شاریتی" ژوورێکی تایبەتی هەبوو و ئەو رۆژە دوای ئەوەی کە هاتە نەخۆشخانە و لە ترۆمبێلەکە دابەزی رۆیشتە ژوورەکەی خۆی، سەرۆکی نەخۆشخانە تەلەفۆنی بۆ دکتۆر "مادلنر" کرد کە گوایە "کەیم رات" هاتوە کەلوپەلە تایبەتییەکانی خۆی لە ژوورەکەی بباتەوە؟

دکتۆر "مادلنر" وەڵامی دایەوە کە ئەگەر بیویستبا کەلوپەلە تایبەتییەکانی خۆی ببات، شۆفیرەکەی بەدوایدا دەنارد. فەرمانبەرانی لاوی نەخۆشخانەی "شاریتی" کە دەیانزانی "زائربروخ" خانەنشین کراوە لە هاتنی بۆ نەخۆشخانە سەریا سوڕ دەما، بەڵام فەرمانبەرە بەپێشینە و بەساڵاچووەکان بە هۆکاری هاتنی "زائربروخ"یان پەی بردبوو، دەیانزانی پیاوێك کە بۆ ماوەی ساڵانێکی زۆر لە دامەزراوەیەکدا کاری کردووە و هەر ڕۆژە کارەکەی خۆی بە هۆگری و تەنانەت بە عەشقەوە لە یەك شوێن دەست پێکردووە، ناتوانێ بە یەکجاری لەو شوێنە دابڕێ، هەر بۆیە بیرەوەریی ئەو هەموو ساڵە بەو دامەزراوەی دەبەستێتەوە.

"زائربروخ" پاش ئەوەی کە ڕۆیشتە ژوورەکەی خۆی دەرکەکەی لەناوەوە قفڵ کرد، چونکە کەس نەدەڕۆیشتە ناو ژوورەکەوە، کەس نەیدەزانی لەوێ چ دەکات. لای نیوەڕۆ، یەکێك لە ژنە پەرستارەکان بەهۆی کونجکۆڵییەوە خۆی گەیاندە پشت پەنجێرەی ژوورەکەی "زائربروخ" کە بزانێ لەو ژوورە چ دەکات و بینی ئەو پیاوە هەر دوو دەستەکەی لەسەر میزەکە ناوەتە ژێر سەری و لەوە دەچوو کە خەوی لێکەوتبێ. لەو ڕۆژەوە بەدوا "زائربروخ" هەر ڕۆژە وەك ئەوکاتانەی کە کاری دەکرد لە کاتی دیاریکراودا دەڕۆیشتە نەخۆشخانە و لە ژوورەکەی خۆی لە پشتی میزەکە دادەنیشت و هەردوو دەستی لەژێر سەری دادەنا و هیچ کەس نەیدەزانی کە ئاخۆ لەو حاڵەدا، دەخەوێت یان بەخەوەرە یان ڕۆیشتۆتە ناو خەیاڵی پیشووی کاتی کارکردنییەوە.

دوو جار خودی دکتۆر "مادلنر" زائربروخ"ی لە پشتی پەنجێرەی ژوورەکەیەوە لەو حاڵەدا بینی و زۆر کاریگەریی لەسەر دانا، ئەو پیاوە مەزنە، لەو حاڵەتەدا و بەو ژێستەوە، بەلایەوە وەکوو سەرچاوەی نائومێدی بوو و فیلمێکی بەناو "فریشتەی ناوی" وەبیر هێنایەوە کە تێیدا "مارلن دیتریش" ژنە هونەرمەندی بەناوبانگی ئەڵمانی لە سەردەمی سینەمای بێدەنگدا ڕۆڵی بینیبوو.

لەو فیلمەدا "مارلن دیتریش" ڕۆڵی ژنێکی دڵڕفێن و هەوەسبازی دەگێڕا کە مامۆستایەکی زانستگای خستبووە داوە و سەرەنجام ئەو مامۆستای زانستگایە بەدنێو و تێك دەشکێ و کار و پیشەکەی لەدەست دەدات و لە ئەنجامدا ئەڕواتەوە ئەو زانستگەیەی کە تێیدا وانەی گوتۆتەوە و لەو ژوورەی کە وانەی وتۆتەوە سەر دەخاتە سەر میزەکە و هەرلەوێ دەمرێت. "زائربروخ"یش لە ژوورەکەی خۆی لە حاڵێکدا سەری نابووە سەر میزەکە بەلای دکتۆر "مادلنر"ەوە وەکوو ئەو مامۆستای زانستگایە دەهاتە پێش چاو.

یەك دوو کەس لە فەرمانبەرانی نەخۆشخانە، بۆ خۆ شیرین کردن بە وەزیری تەندروستییان گوت کە "زائربروخ" ڕۆژانە دێتە نەخۆشخانە و وەزیریش لەباتی سەرۆکی نەخۆشخانە کە ڕۆیشتبووە

سەفەر، بە دکتۆر "مادلنر" گەورە نەشتەرگەری نەخۆشخانەی گوت کەسێك کە خانەنشین کراوە نیتر نابێ وەك فەرمانبەرێك هەر رۆژە بە رێکوپێکی لەسەر کارەکەی ئامادە بێت، چونکە بوونی فەرمانبەرێکی خانەنشین لە شوێنی کار، پێچەوانەی رێوشوێنەکانە و نەزمی کارەکان تێك دەدات و ئێوە دەبێ پێش بە هاتنی "زانربروخ" بگرن.

دکتۆر "مادلنر" لە وەلامی وەزیری تەندروستیدا گوتی شوێنی کاری "زانربروخ" لەم نەخۆشخانەیە، ژووری نەشتەرگەری بوو نەك ژوورەکەی خۆی و ئیدی ئەویش نایەتە ژووری نەشتەرگەرییەوە، بۆیە نەزمی کارەکان ناشێوێنێ، چونکە پاش هاتنی بۆ نەخۆشخانە ئەڕواتە ژوورەکەیەوە و لەوێ دەرناکەوێ مەگەر ئەوەی کاتێ بڕواتەوە بۆ ماڵ و هەموان دەزانین چونکە "زانربروخ" ساڵانێك لەم نەخۆشخانەیە کاری کردووە و تەنانەت لە ساڵانی شەڕیشدا هەر لێرە بووە، ناتوانێ هەر وا بە سووك و ئاسانی دڵ لێرە هەڵبکەنێ و لەباری ئینسانییەوە دوورە لە ویژدان و جوامێری کە ئێمە لەم رۆژانەی کۆتایی تەمەنیدا لەو تاقە هۆکارەی کە سوکنایی دەریەتی، بێبەشی بکەین، تکایە ئیزن بدەن با بێتە ئێرە هەتا ئەو رۆژەی کە سروشت لێرەی دابڕێ و ئەگەر ئەمڕۆ ئێمە پێش بە هاتنی ئەو پیاوە بۆ نەخۆشخانە بگرین دەبێتە هۆی ئازار و دڵ ئێشانی.

لە سەرەتای ئەم یادداشتانەدا گوتمان پیشەی دکتۆر "هاڵ" راوێژکاری کۆلیژە پزیشکییەکان بوو، بەلام سەرەڕای ئەوەی کە کاری دکتۆر "هاڵ" راوێژکاری بوو، بەلام لە بەشی ماڵیی کۆلیژە پزیشکییەکانیشدا کاری دەکرد، بۆیە وەزیری تەندروستی پێی گوت بڕواتە لای "زانربروخ" و بەڵگەکانی خانەنشینی پێ واژۆ بکات. دکتۆر "هاڵ" بە مەبەستی دیداری "زانربروخ" رۆیشتە نەخۆشخانە و چووە ناو ژوورەکەیەوە و "زانربروخ"ی زۆر بە سستی و زەلیلی هاتە بەرچاو، بۆ ئەوەی ئەو حاڵەتەی لێ دوور بخاتەوە، هەندێ سەبارەت بە پێشینەی نەشتەرگەرییەکانی ئەو مامۆستایە قسەی کرد و سەری قسەی بەرەو لای خانەنشینی کێشا و هەوڵی دا هەر وەکوو وەزیری تەندروستی "زانربروخ" لە بواری مووچە و بژیوی ژیانەوە لە ساڵانی کۆتایی تەمەنیدا خاترجەمی بکات و گوتی، تەواوی ئەو مافانەی کە ئێستا وەریان دەگری، هەتا کۆتایی ژیانت مسۆگەرن، بەلام رەچاوکردنی رێوشوێنی گشتیی خانەنشینی لەم ولاتە، سەرەکییە کە ئەگەر بێت و بایەخی پارە دابەزێت، بڕی پارەی خانەنشینی زیاد دەکات.

"زانربروخ" بەبێ ئەوەی کە قسەکانی دکتۆر "هاڵ" بڕێ، گوێی لە قسەکانی گرت و پاش ئەوەی کە قسەکانی ئەو پیاوە تەواو بوون، لەناکاو تووڕە بوو و بە تووڕەییەوە گوتی ئێوە پێتان

وایه من فەرمانبەرێکی نوسینگەی دەوڵەتیم کە چاوم بڕیبێتە مووچەی خانەنشینی؟ من پیاوێکم کەلە سەرەتاوەی هەتا ئەمڕۆ، لە بەهرەی کاری خۆم نانم خواردووە و لەمەویەدواش لە بەهرەی کاری خۆم نان دەخۆم، لە ئەڵمانیا و وڵاتانی دیکەش دەیان نەخۆشخانە هەن کە دەرگای ژوورەکانی نەشتەرگەرییان بەڕووی مندا دەکەنەوە و من ئەگەر هەر ڕۆژە، تەنیا یەك نەشتەرگەری ئەنجام بدەم، بژێوی خۆم دابین دەکەم.

دکتۆر "هاڵ" کە دیتی "زائربروخ" تووڕە بووە، نەختێ بێدەنگی نواند و دواتر گوتی من ئەمڕۆ هاتووم تاکوو ئەو بەڵگانەی کە پێوەندییان بە مەسەلەی خانەنشینیی تۆوەیە واژۆیان بکەیت. "زائربروخ" بە هەمان تووڕەییەوە وەڵامی دایەوە پێویستم بە مووچەی خانەنشینی نیە و هیچ بەڵگەیەکیش واژۆ ناکەم. دکتۆر "هاڵ" بە ناچاری هەستا و ماڵاوایی لە "زائربروخ" کرد و لە ژوورەکە وەدەر کەوت و ڕۆیی.

سێ ڕۆژ دوای ئەو ڕووداوە، کاتێك "زائربروخ" وەکوو ڕۆژانی پێشوو لە کاتژمێری دیاریکراودا هاتە ناو نەخۆشخانەوە و بەرەو لای ژوورەکەی ڕۆیی، بینی کە دەرگاکەیان قفڵ کردووە. "زائربروخ" بۆ ماوەی چارەکە سەعاتێك ماتڵ بوو کە بزانێ کلیلی ژوورەکەی بەدەستی کێیە، بەڵام سەرەنجام ڕوون نەبۆوە. ئەو پزیشکە بلیمەتە ڕۆژی دواتر دیسان هاتەوە، بەڵام دیسان دەرگاکە داخرابوو.

یەکێك لە فەرمانبەرانی نەخۆشخانە کە دڵی بۆ "زائربروخ" دەسووتا، لێی نزیك بۆوە و بە هێواشی گوتی "گەهیم رات" چاوەڕێی کلیلەکە مەبن، چونکە بڕیار دراوە کە ئیدی ئێوە نابێ کەڵك لەم ژوورە وەربگرن و بێنەوە نابێ بێنەوە نەخۆشخانە. بەم چەشنە "زائربروخ" لەو نەخۆشخانەیەی کە نزیك بە ١٥ ساڵ تێیدا کاری دەکرد، وەدەرنرا.

پاش ئەوەی کە "زائربروخ" لە وەرگرتنی مووچەی خانەنشینی خۆی بوارد، بۆ جارێکی تر ناوی لە ڕۆژنامەکانی ئەڵمانیا و چەند وڵاتێکی ئەورووپایی چاپ کرایەوە و هەموان نوسییان کە ئیدی ناهێڵن "زائربروخ" لە نەخۆشخانەی "شاریتی" کار بکات و ئەو نەشتەرگەرە سەرەڕای ئەوەی کە هیچ سەروەت و سامانێ‌ی نیە، بەڵام حازر نیە مووچەی خانەنشینی وەربگرێت.

# زانربروخ بۆ بژێوی ژیانی تووشی چەرمەسەری بوو

"زانربروخ" لەڕاستیدا هیچ سەروەت و پاشەکەوتێکی نەبوو، چونکە ئەو پیاوە بە درێژایی تەمەنی، لە هەمبەر مەسەلەی دارایی و ساماندا کەمتەرخەم بوو و تەنیا بەو رادەیەی کە بژێوی رۆژانە و مانگانەی بگوزەرێ، پارەی پێویست بوو. چەند کەس لە دۆستانی "زانربروخ" کە دەیانزانی مووچەی خانەنشینیی قبووڵ نەکردووە و بە باشی دەیانزانی هیچ پاشەکەوتێکی نیە، بۆیە کەوتنە بیری ئەوەی بۆ رێزگرتن لە ناوبراو و هەروەها بۆ ئەوەی یارمەتییەکی باری مالیشی بکەن، چەندین کۆنفرانسی بۆ رێك بخەن.

"زانربروخ" پێشنیاری دۆستانی قبووڵ کرد و بڕیار درا ئەو مامۆستایە، یەکەم کۆنفرانسی خۆی لە شاری "هانور" هەلکەوتوو لە ئەڵمانیای رۆژئاوا ببەستێ. "هانور" یەکێکە لە شارە گەورە پیشەیی، زانستی و هەم هونەرییەکانی ئەڵمانیای رۆژئاوا و تەلارێکی گەورەی بەناوی "بێتهۆڤێن" هەیە کە یەکێکە لە تەلارە مێژووییەکانی ئەڵمانیا و بڕیار درا "زانربروخ" لەو شوێنە کۆنفرانسەکەی بگرێت و تەوەری کۆنفرانسەکەش نەخۆشیی شێرپەنجە دەست نیشان کرا.

ئەوکاتە ئەو دیوارەی کە ئەمڕۆ لە نێوان ئەڵمانیای رۆژهەڵات و رۆژئاوادا هەیە لە گۆڕێدا نەبوو و هاتوچۆ لە نێوان ئەو دوو بەشەدا گرفتی ساز نەدەکرد، هەربۆیە پاش ئەوەی کاتی بەڕێوەچوونی کۆنفرانسەکەی "زانربروخ" دیاری کرا، کەسانێك تەنانەت لە ئەڵمانیا و بەرلینی رۆژهەلاتەوە رۆیشتن بۆ "هانور" کە کۆنفرانسی "زانربروخ"دا کە لەبارەی شێرپەنجەوە بوو،بەشداری بکەن.

ئەو شەوەی کە دەبوا "زانربروخ" لە تەلاری "بێتهۆڤێن" قسە بکات، نەتەنیا پزیشك و نەشتەرگەرەکان، بەلکوو بەشێکی بەرچاو لە کەسانی پایەبەرز لە توێژی نووسەر، هونەرمەند و مامۆستایانی زانکۆ و تەنانەت چەند کەس لە پیاوانی بەناوبانگی بازرگانی و پیشەیی ئەڵمانیای رۆژئاوا لە تەلارەکە ئامادە بوون و هەروەها نزیك بە سەد کەس لە هەواڵنێری رۆژنامە و گۆڤار و رادیۆ هاتبوون هەتا قسە و لێدوانەکانی "زانربروخ" گوێ لێبگرن و بۆ رۆژنامە و گۆڤار و رادیۆکانی بگوازنەوە.

هەموو ئەو کەسانەی بۆ گوێگرتن لە ئاخاوتنی "زانربروخ" لەو تەلارە ئامادە بوون، سەبارەت بە نەخۆشیی شێرپەنجە زانیارییان هەبوو و هەندێکیان کە نەشتەرگەری شێرپەنجە بوون سەبارەت

بەو نەخۆشییە زانیاری و ئاگایی بەربلاویان هەبوو، بەلام هەموان دەیانزانی بێگومان لە زمانی "زائربروخ"ەوە لەبارەی شێرپەنجە شتگەلێك دەبیستن کە هەتا ئەوکات نەیانبیستووە و نەیانخوێندۆتەوە. چونکە خودی "زائربروخ" نەشتەرگەری بۆ کۆمەڵێکی بەرچاو لە تووشبوان بە نەخۆشیی شێرپەنجە کردبوو و ریشاڵەی شێرپەنجەی لە هەناوی نەخۆشەکان بینیبوو و لە رێگای نەشتەرگەرییەوە لە ئەندامانی ساغی جەستەی جیا کردبۆوە. "زائربروخ" پاش کۆتایی نەشتەرگەری دیتبووی کە چۆن چۆنی نەخۆشەکان چاك دەبنەوە، یان پاش ماوەیەك دیسان تووشی گرێ و نەخۆشیی شێرپەنجە دەبنەوە.

کاتێك "زائربروخ" هاتە ناو تەلارەکەوە پیاو و ژنانی ئامادە لەوێ هەموان هەستانە سەرپێ و چەپڵەیان بۆ لێدا هەتا کاتێك ئەو مامۆستایە رۆیشتە شوێنی ئاخاوتنە و دواتر بە ئاماژەی "زائربروخ" لە شوێنی خۆیان دانیشتنەوە. ئەو نەشتەرگەرە لەناو جانتایەك کە لەگەڵ خۆی هێنابووی کۆمەڵێك کاغەزی دەرهێنا و لەسەر میزەکەی دانا و قسەکانی دەست پێکرد. سەرەتای قسەکانی "زائربروخ" دەربڕی ئەوە بوون کە ئەوەی دەیڵێت شتێکی سەرنجراکێشە.

چونکە گوتی دەبێ بە خوشەکان و خوشك و برایان رابگەیەنم من لەو کاتەوە کە بۆ یەکەم جار تومۆرێکی شێرپەنجەم لە جەستەی نەخۆشێك دەرهێنا هەتا ئەمرۆ، نەمبینیوە دوو تومۆر و ریشاڵەی شێرپەنجە لەناو جەستەدا لەباری رەنگ و ئەو ریشانەوە کە دایدەگوتی بە تەواوەتی لێك بچن. بەلام لە دەرەوەی جەستە تومۆرە شێرپەنجەییەکان، لەباری رەنگەوە لێك دەچن، بەلام لەناو جەستەدا لێکچوونێك لە نێوان تومۆرە پڕ مەترسییەکان و دۆخ و جۆری ریشەیاندا نابینرێ.

دواتر "زائربروخ" دەستی لەژێر چەنەی دانا و سەری داخست و بۆ چەند ساتێك بێدەنگ بوو و دوای ئەوەی کە سەری هەڵێنا، گوتی "ئێستا دەبێ وەزیر لە مەترسی رزگار بکەین و چەند ساتێکی تر وتی دەبێ هەر سێ مۆرەکە بگۆڕین، وەزیر رووبەرووی مەترسی بۆتەوە". ئەم دوو رستە بێجێیە کە هیچ پێوەندییەکیان بە بابەتی کۆنفرانسەکەوە نەبوو، گوێگران و ئامادەبوانی زۆر تووشی سەرسوڕمان نەکرد. چونکە هەندێ جار پەیڤەر، باس لە بابەتگەلێك دەکات کەلە رواڵەتدا پێوەندیی بە بابەتە سەرەکییەکەوە نیە، بەلام دوای چەند ساتێکی تر دەردەکەوێ ئەو باسە زەمینەیەکە بۆ پێوەندی لەگەڵ بابەتە سەرەکییەکەدا و پەیڤەر بەو بۆنەوە ئەو بابەتە بە رواڵەت لاوەکییانەی هێناوەتە زمان کە زیاتر سەرنجی گوێگران رابکێشێ، بەلام کاتێك ئاخاوتنی "زائربروخ" لەو بوارەدا درێژەی کێشا دەرکەوت کە ئوستاد لەوە دەچێ بابەتی سەرەکیی کۆنفرانسەکەی فەرامۆش کردبێ و تەنیا سەبارەت بە مۆرەکانی شەترەنج وەکوو ئەسپ و فیل و

وەزیر و سەرباز قسە دەکات و وەك ئەوە وایە تەختە شەترەنجێك رووبەرووی دانرابێ و مۆرەکان دەبینێت و لەبارەی چۆنیەتیی حەرەکەت کردنیانەوە قسە دەکات.

لەناکاو "زانربروخ" لە بابەتی حەرەکەتی مۆرەکانی شەترەنجەوە ئاماژەی بە بابەتی بنگلە یان کەوێلّ (خانووچکەیەکی بچووکی کوێستانی) کرد کەلە کاتی ژیانی لە وڵاتی سویسرا بە کرێی گرتبوو و هەندێکیش سەبارەت بە دۆخی ئاو و هەوای ئەو وڵاتە دوا و دواتر، ڕێڕەوی قسەکانی بەرەو لای کڕینی ترۆمبێل کێشا. بۆ دۆستانی "زانربروخ" کەلە تەلارەکە بوون دەرکەوت کە دەنگۆی شێتیی دەورەیی ئەو نەشتەرگەرە کە ببووە هۆی لابردنی لە کاری نەشتەرگەری راستە، چونکە شك و گومانێك لەئارادا نەبوو کە "زانربروخ" تووشی لەبیرچوونەوە و فەرامۆشی بووە.

دۆستانی "زانربروخ" لە ڕواڵەتدا بەناوی سپاس لەو پەیڤەرە نزیکی میزەکە بوونەوە، هەتا لەو شوێنەی دوور خەنەوە، بەڵام "زانربروخ" نەیدەویست لە میزەکە و شوێنی ئاخاوتنەکەی دوور کەوێتەوە و دەیگوت من هێشتا قسەکانم کۆتاییان پێنەهاتووە، بەڵام سەرەنجام بە زۆری ئەویان لەو شوێنە دوور کردەوە و داوایان لە هەواڵنێر و ڕۆژنامە، گۆڤار و ڕادیۆکان کرد کە بە نیشانەی سوپاس و پێزانینی ئەو خزمەتانەی کە "زانربروخ" بە زانستی کردووە و لە ڕابردوودا سەدان کەسی لە مەرگ رزگار کردووە، بۆیە ئەو بەشەی قسەکانی "زانربروخ" کە پێوەندیی بە بابەتەکەوە نەبووە لە ڕاگەیەنەکان بڵاو نەکەنەوە و نەڵێن ئەو بیرمەندە تووشی لەبرچوونەوە و فەرامۆشی بووە و ئەوانیش لە بڵاوکردنەوەی ئەو بەشەی هەواڵەکە خۆیان بوارد.

"زانربروخ" هیچکات لەبیری پاشەکەوت و مڵك و ساماندا نەبووە کەلە دەورانی پیری یان پەککەوتەییدا یارمەتییەکی بواری بژێوی ژیانی بێت و بەردەوام لەبیری کاری نەشتەرگەری و لێکۆڵینەوەدا بوو بەبێ ئەوەی کە لەو کارە لێکۆڵینەوانە سەروەت و سامانێك پێکەوە بنێ، ئەوانەی کە عاشق و ئۆگری کاری خۆیانن و ناتوانن دەستی لێهەڵبگرن، کار و لێکۆڵینەوەیان بۆ بەدەستهێنانی پارە ناوێت و عەشقی ئەوان بە کار و توێژینەوە دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەگەر بێت و سەروەت و سامانیان هەبێ، ئامادەن لە گیرفانی خۆیان پارە بدەن بەو مەرجەی کە کار و لێکۆڵینەوەکەیان ڕانەوەستێ.

"زانربروخ"یش یەکێك لە عاشقانی کار و توێژینەوە بوو و لە هیچکام لە قۆناغەکانی ژیانیدا لە بیری کۆکردنەوەی ماڵ و ساماندا نەبووە و ئەو ڕۆژەش کە پێشیان بە درێژەی کارەکەی گرت، ڕازی نەبوو بەڵگەکانی خانەنشینی واژۆ بکات هەتا باقیی تەمەنی، مووچەی خانەنشینی وەربگرێت.

ئەو پیاوە سەرەڕای ئەوەی کە دەیزانی هیچ پاشەکەوتێکی نیە، بەڵام ئامادە نەبوو مووچەی خانەنشینی وەربگرێت. بۆ چەند جار "زانربروخ" کەلە واژۆی بەڵگەکانی خانەنشینی و لە ئەنجامدا مووچە و حقووق خۆی بوارد، بە تەواوەتی لە حاڵەتی ئاساییدا بوو و هۆشی لەسەرەخۆ بوو و هەست بەوە دەکرا کە ئەحۆشیی فەرامۆشی بوویێتە هۆی ئەوەی کە لە وەرگرتنیان خۆی ببوێرێ.

هۆکاری خۆبواردنی "زانربروخ" لە مووچەی خانەنشینی، ئەوە بوو کە پێی وابوو هەرکەسە خانەنشینی [illegible] و مووچەی پاش کارکردن وەربگرێت، لە رواڵەت و دەروونـدا باوەڕ بەوە دێنێ کە [illegible] بە کاری نیە.

وەزیری تەندروستی بە نیسبەت "زانربروخ" بەتی پاك بوو و نەیدەویست مووچەی ئەو تشتەرگەرە بیچڕێ، بەڵام ئەویش ناچار بوو پەیڕەوی لە رێوشوێن و یاسا گشتییەکان بکات و مووچەی کەسێك کە تیتر نابێ کار بکات، ببڕێت. لە کابینەی وەزیرانی ئەڵمانیای رۆژهەڵاتدا باس کرا کاتێك مووچەی "زانربروخ" ببڕن، ئەویش ناچار دەبێت مووچەی خانەنشینییەکەی قبووڵ بکات.

"مووچەکەی "زانربروخ" بڕدرا و هاوکات ترۆمبێلێك کە هی وەزارەتی تەندروستی بوو لێی سەنرایەوە و. زۆری نەکێشا کە نەبوونی داهات و بژێوی ژیان لە ماڵی "زانربروخ" دەرکەوت و هاوسەرەکەی (مارگۆ) نیدی نەیدەتوانی پێویستییەکانی ماڵەوە بکڕێت.

## شێوازی پەی بردنی زائربروخ بە نەخۆشیی سفلیس (سفیلیس)

کاتێك "زائربروخ" بە رێکوپێکی لە نەخۆشخانەی شاریتی کاری دەکرد، رۆژێکیان دکتۆر "مادلنر" بۆی دەرکەوت لەو ژوورەی کە لەوێوە دەڕۆیشتنە ناو ژووری نەشتەرگەرییەکەوە، کتێبێك دانراوە هەرکە کتێبەکەی بینی تێگەیشت هی "زائربروخ"ە، چونکە ئەو نەشتەرگەرە عادەتی وابوو لەنێوان رێگای ماڵەوە و نەخۆشخانە لەناو ترۆمبێلدا سەرقاڵی کتێب خوێندنەوە بێت. ئەو کتێبەی کە دکتۆر "مادلنر" بینی هی زائربروخ و بەجێی هێشتبوو، کتێبێك بوو لەبارەی نەخۆشیی سفلیسەوە، بەڵام نووسەرەکەی "زائربروخ" نەبوو.

"زائربروخ" لە کاتی خوێندنەوەی کتێبە زانستییەکاندا را و بۆچوونی خۆی لە پەراوێزی لاپەڕەکاندا دەنووسی و دکتۆر "مادلنر" دیتی لەو کتێبەدا، مەرگەر بەدەگمەن دەنا لاپەڕەیەك نیە کەلە پەراوێزەکەیدا بە دەستخەتی "زائربروخ" نەنووسرابێتەوە و پاش وردبوونەوە لە پەراوێزەکان، کە پێوەندییان بە نەخۆشیی سفلیسەوە بوو لە دڵەوە ئافەرینی بە "زائربروخ" گوت.

لەڕاستیدا "زائربروخ" لەبارەی نەخۆشیی سفلیسەوە بەهۆی پیشەی نەشتەرگەرییەوە، زانیاری و ئاگایی زیاتری لە هەموو پزیشکانی سفلیس ناسی هاوچەرخ هەبوو، چونکە ئەوان لە دەرەوەی جەستەی مرۆڤ لێکۆڵینەوەیان لەبارەی ئاسەواری نەخۆشیی سفلیسەوە دەکرد، بەڵام "زائربروخ" پێکهاتە و هەوێنی نەخۆشییەکە و ئاسەوارەکانی لەناو جەستەی مرۆڤدا بە چاوەکانی خۆی دەبینی. "زائربروخ" لە کاتی نەشتەگەریدا لەناو جەستە ئەندامێکی بەدی دەکرد کە تووشی هەڵمسانی دەورەی سێیەمی نەخۆشیی سفلیس بووە و پزیشکی پسپۆڕی سفلیس تێنەگەیشتبوو کە کام بەش لە جەستە تووشی دەوری سێیەمی نەخۆشیی سفلیس بووە؟

نەخۆشیی سفلیس سێ دەورەی هەیە، لە قۆناغی یەکەمدا نیشانەی ئەو نەخۆشییە وەك دومەڵێك وایە کە لەسەر کۆئەندامی جینسی، یان لەسەر لێو یان لەلای ئەو پزیشکانەی کە سەروکاریان لەگەڵ میکرۆبی سفلیس هەیە هەندێ جار لەسەر قامك، دەردەکەوێ و ئەو جۆشە (قرحە) لە زاراوەی پزیشکیدا بە "شانکر" ناسراوە. ئەگەر بێت و لە قۆناغی یەکەمدا چارەسەر نەکرێت، نیشانەکانی قۆناغی دووەم وەدەر دەکەون و ئەو جۆشە لەناو دەچێت و هەندێ جۆشی دیکە لەسەر دەست و لاق دەردێن و دەنگی مرۆڤ دەگۆڕێ و ئەم نیشانەیەش پاش ماوەیەك نامێنێ

و ناسەواری ڕواڵەتیی نەخۆشییەکە لەبەرچاو ون دەبێت.

پاشان دەورەی سێیەمی ئەم نەخۆشییە دەست پێدەکات و کەسێك کە تووشی قۆناغی سێیەمی ئەم نەخۆشییە، لە ڕواڵەتدا جیاوازییەکی لەگەڵ کەسانی لەشساغ نیە و هیچ پزیشکێکی پسپۆڕی بواری سفلیس، لە ڕێگای نیشانە ڕواڵەتییەکانییەوە ناتوانێ بەو ئەنجامە بگات کە ئاخۆ کەسێك تووشی دەورەی سێیەمی نەخۆشیی سفلیس بووە یان نا؟

نیشانەکانی دەورەی سێیەمی نەخۆشیی سفلیس جۆراوجۆرن و هەموویشیان جێگای مەترسین و نەخۆش لە حاڵێکدا پێی وایە تەندروستە و بە نیشتیاوە خۆراك دەخوات و دەخەوێ، لەناکاو تووشی کوێری دەبێت یان نەخۆشیی ئیفلیجیی گشتیی جەستە دەگرێت. "زائربروخ" کە نیشانەکانی دەورەی سێیەمی نەخۆشیی سفلیسی لەناو جەستەی مرۆڤ دەبینی، یەکەم کەسە کە پەی بەوە برد و گوتی لە لەشی مرۆڤدا هیچ ئەندامێك نیە کەلە ئەگەری تووشبوون بە ئازار و نیشانەکانی دەورەی سێیەمی نەخۆشیی سفلیس ڕزگاری بێت.

یەکێك لە نیشانە پڕمەترسییەکانی دەورەی سێیەمی نەخۆشیی سفلیس شێتییە و نەخۆش کە خۆی بێ ئاگایە لەوەی کە نەخۆشە، لەوانەیە لەناکاو شێت ببێ و ئەگەر بێت و کەسی تووشبوو بە نەخۆشیی سفلیس بەتەواوەتی چارەسەری خۆی نەکات، نیشانەکانی ئەو نەخۆشییە دەگوازێتەوە بۆ کەسانی دەوروبەر و بەتایبەت منداڵەکانی و لەوانەیە ئەوانیش شێت، کوێر یان تووشی لاوازیی زەینی و فەرامۆشی ببن. چەند جارێك ڕووی دا کەسانێك کە لەلایەن پزیشکانەوە بۆ چارەسەری نەخۆشیی جۆراوجۆر نێردرابوون کە "زائربروخ" نەشتەرگەرییان بۆ بکات و لە کاتی نەشتەرگەریدا "زائربروخ" نیشانەکانی نەخۆشیی سفلیس کە ئەو پزیشکانە پەییان پێ نەبردبوو، لە هەندێ لە بەشەکانی لەشدا بینی و پزیشکەکانی لێ ئاگادار کردەوە کە ئەو کەسە پاش ئەوەی کەلە نەخۆشخانە هاتە دەشت، دەبێ بۆ دەرمانی نەخۆشیی سفلیس چارەسەریی پزیشکی بۆ بکرێت.

بەرلە "زائربروخ" پزیشکێك کە دەیهەویست بزانێ ئایا کەسێك تووشی دەورەی سێیەمی نەخۆشیی سفلیس بووە یان نا، دەبوا تاقیکردنەوەیەکی کردبا کەلە زانستی پزیشکیدا بە "واکنش واسرمان" ناسراوە، "واسرمان" کەسێکی میکرۆبناسی ئەڵمانی بوو کە ساڵی ١٩٢٥ی زایینی کۆچی دوایی کردووە و بۆ کەشفی بوونی میکرۆبی سفلیس لە جەستەی مرۆڤدا، تاقیکردنەوەی "واکنش واسرمان"ی داهێناوە کە باسکردنی تێروتەسەلە و لانیکەم نامیلکەیەکی پزیشکی هەڵدەگرێ. بەهۆی بەکارهێنانی "واکنش واسرمان" و بە زمانی فەرەنسی (ڕاکسیۆن ـ دوو ـ واسرمان) دەیانتوانی بە تەواوەتی تێبگەن کە ئایا میکرۆبی سفلیس لەناو جەستەی کەسێکدا

هەیە یان نا؟

بەڵام بەکارهێنانی "واکنش واسرمان" بۆ پەی بردن بە بوونی میکرۆبی سفلیس لەناو جەستەی کەسێك، دوو گرفت لەئارادا بوو، یەکەم ئەوەی کە پرۆسە جیاجیاکانی ئەو تاقیکردنەوە ماوەیەکی دەخایاند، دووەمیش ئەوە بوو کە بەبێ بوونی تاقیگەیەکی تۆکمە و گەورە نەدەکرا ئەو تاقیکردنەوەیە ئەنجام بدرێت. پزیشکانی سفلیس ناسی ئەڵمانی و پزیشکانی دیکەی ئەورووپا چۆنکە لەو شارانە دەژیان کە تێیاندا ئەو تاقیگە گەورانە هەبوو، دەیانتوانی ئەو تاقیکردنەوەیە ئەنجام بدەن، بەڵام لە وڵاتانی ئەفریقا و ئاسیا کە لەو سەدەمەدا، تاقیکردنەوە نەبوو، کەڵك وەرگرتن لەو تاقیکردنەوە پزیشکییە ئیمکانی نەبوو، بەڵام "زائربروخ" لە ئەنجامی ئەزموونی کردەیی شێوازێکی بۆ پەی بردن بە نەخۆشیی سفلیس لەناو جەستەی مرۆڤ داهێنا کە تەنانەت پزیشکێکی دوورخراوەترین شوێنەکانی ئەفریقا یان ئاسیا کە دەستیان بە تاقیگە رانەدەگەیشت، دەیتوانی لەو رێگایەوە تێبگات کە ئایا کەسی تووشبوو بە نەخۆشیی سفلیس لە "دەورەی شاراوە" دایە یان نا؟

شێوازی پەی بردنی "زائربروخ" بە میکرۆبی نەخۆشیی سفلیس بەو چەشنە بوو کە نەختێ لە خوێنی جەستەی ژن یان پیاوی جێگای گومان بەو نەخۆشیەی دەگرت و لەگەڵ خڵتی جەستەی لە یەکێك "گانگلیۆن"ەکانی (بە قۆقزی و هەڵمسانی لنفاتیکی گەردن دەڵێن گانگلۆن) کە بە دەرزی دەریدەکێشا کە ئەو کارە زیاتر لە دوو خولەکی نەدەخایاند. دواتر ئەو دوو تراوەی لەناو دەفرێکی بچووك تێکەڵ دەکرد و دایدەنا هەتا بنیشێت و دواتر ئاوی خوێن دەکەوتە سەر دەفرەکە و "زائربروخ" ئەو ئاوی خوێنەی لە دەفرێکی دیکە دەکرد و هەندێ مادەی دیکەی بەناوی "تراوی رینجر"ی تێکەڵ دەکرد (تراوی رینجر مادەیەکی سوێرە کەلە تاقیگەکان بەکاری دێنن و دەیانەوێ میکرۆبی تێدا پەروەردە بکەن) و دوای ئەوەی کە "زائربروخ" ئەو مادەیەی دەکردە ناو ئاو خوێنەکە لە ماوەی پێنج خولەکدا ئەگەر میکرۆبی سفلیس لە جەستەی ئەو کەسەدا هەبایە، بە جوانی دەردەکەوت.

بەو شێوەیە، هەر پزیشکێك دەیتوانی تەنانەت لەو شوێنانەش کە تاقیگەیەك لە گۆڕێدا نەبوو، لە ماوەیەکی زۆر کەمدا بیسەلێنێ کە ئایا کەسێك تووشی نەخۆشیی سفلیسی شاراوە بووە یان نا. هەرچەند ئەم داهێنانەی "زائربروخ" لە ساڵانی نێوان دوو شەڕی یەکەم و دووەمی جیهانیدا بێدەنگیی لێکرا و دەنگ و هەرای نەنایەوە، بەڵام شاکارە نەشتەرگەرییەکانی ئەو پیاوە دەنگدانەوەی جیهانییان هەبوو، کە یەك لەو شاکارانەی پێوەند دانی دەست و لاقی جیابۆوەی

بریندارانی شەڕ بوو کەلە سەرەتای سەربوردەی ژیانی "زائربروخ"دا بە کورتی ئاماژەمان پێکـرد و خێرا بەسەریدا بازمان دا و لەوانەیە خوێنەران سەرنجیان نەدابێ کە ئەو شاکارە پزیـشکییانەی کـە هەتا ئەمڕۆش کەس ناوێرێ خۆی لە قەرەیان بدات، لەو سەردەمەدا چەندە بابەخیان هەبووە.

## "شتۆفان برك" كه قەستی گیانی هیتلەری كرد

یەك لەو كارە نەشتەرگەرییانەی كە "زائربروخ" لە شەڕی دووەمی جیهانیدا ئەنجامی دا و زۆر دەنگی دایەوە و تەنانەت سەرنجی "هیتلەر" سەرۆكی حكومەت و دیكتاتۆری ئەڵمانیای راكێشا، دەرمانی "شتۆفان برك" ئەفسەری ئەرتەشی ئەڵمانیا بوو كەلە باكووری ئەفریقا بە توندی بریندار ببوو.

"شتۆفان برك" هەمان ئەفسەرە كە رۆژی بیستەمی مانگی ژوئیەی ساڵی ١٩٤٤ی زایینی بۆمبێكی كاتژمێری لە ژوورەكەی "هیتلەر" نایەوە و خۆی لە ژوورەكە دەركەوت و بۆمبەكە تەقایەوە. لەو ژوورە كە كۆنفرانسێكی سەربازیی تێیدا بەسترا چەند كەس كوژران، بەڵام هیتلەر هیچ بریندار نەبوو. مەسەلەی ئەو تەقینەوەیە كە پاش كۆتایی شەڕی دووەمی جیهانی بۆ ماوەی چەند ساڵ لە رۆژنامە و گۆڤار و كتێبەكاندا لەبارەیەوە نووسرا و بابەت بڵاو كرایەوە، دوور و درێژە و بە كورتی ئەوە بوو ئەفسەرانی هێزە چەكدارەكانی ئەڵمانیا دەیانزانی ئەڵمانیا لە شەڕدا شكست دێنێ و دوای ئەوەش لەوانەیە بسڕدرێتەوە، بۆیە هاتنە سەر ئەو باوەڕە كە بە كوشتنی "هیتلەر" كۆتایی بە شەڕ بێنن و لەگەڵ وڵاتانی ئەمریكا، بریتانیا و یەكیەتیی سۆڤیەت ئاشتی بكەن، بەڵام پاش كۆتایی شەڕ ئەڵمانیا غەرامەیەك بەو وڵاتانە بدات و ئەفسەرانی ئەڵمانیا دانی غەرامەیان لە هەمبەر لە لەناوچوونی ئەڵمانیا بە باشتر دەزانی.

"شتۆفان برك" ئامادە بوو كە بۆمبێكی كاتژمێریی بەهێز لەناو ژوورەكەی "هیتلەر" بنێتەوە و لە رۆژی بیستەمی مانگی ژوئیەی ساڵی ١٩٤٤ی زایینی بۆمبەكە كە لەناو جانتایەكی دەستیدا بوو لە ژووری كۆنفرانسی سەربازی (لە ناوچەیەك هەڵكەوتوو لە رۆژهەڵاتی ئەڵمانیا لە بەرەی شەڕ لەگەڵ روسیا) لە نزیك هیتلەر دانا و بە بیانووی هێنانی نووسراوەیەكی زەروری لە ژووری كۆنفرانسەكە وەدەركەوت و بە فڕۆكە لەو ناوچەیە دوور كەوتەوە.

بۆمبەكە لە كاتی دیاریكراودا تەقییەوە، بەڵام هیتلەر نەتەنیا نەكوژرا، بەڵكوو برینداریش نەبوو و دوای ئەو پیلانە، نزیك بە هەزار كەس لە ئەفسەرانی هێزە چەكدارەكانی ئەڵمانیا و هاووڵاتییانی مەدەنی دەستبەسەر و لە سێدارە دران و هەندێكیان بە قەڵانگ یان چنگاڵی دووكانە قەسابییەكانەوە هەڵواسران و "شتۆفان برك"یش پاش دەستبەسەر كران لە سێدارە درا. "شتۆفان برك" ئەفسەرێكی دلێر و زیرەك بوو، لە باكووری ئەفریقا لە كاتی هێرشی یەكێك لە هاوپەیمانەكان

به توندی بریندار بوو، پلەی سەرگورد، پێشەنگ (راند)ی هەبوو، لە هێرشی بوێرانەی خۆیدا بۆ سەر هێزی بریتانیا بە جۆرێك بریندار کرا کە پزیشکان و نەشتەرگەرەکان لە باکووری ئەفریقا، لە دەرمان کردنی خۆیان بوارد و گوتیان بەهۆی ئەو هەموو برینەوە کەلە تەوای جەستەیدا هەیە، بێگومان دەمرێت.

مارشال "رومل"ی ناسراو کەلە باکووری ئەفریقا فەرماندەی هێزی چەکداری ئەڵمانیا بوو و ئەو ئەفسەرە بوێرەی زۆر خۆش دەویست، پاش وتووێژ لەگەڵ بەرلین، بڕیاری دا "شتۆفان بکر" کە لەڕاستیدا جەستەی لەت و پەت کرابوو، ڕەوانەی بەرلین بکرێتەوە کە لەوانەیە لەوێ بتوانن دەرمان و چارەسەری بۆ بکەن. لە بەرلین "زائربروخ" جەستەی لێك هەڵوەشاوی "ئەشتۆفان برك"ی دیت، گوتی من لام وا نیە بتوانم لە مەرگ رزگاری بکەم بەڵام هەوڵی خۆم دەدەم. پاش گواستنەوەی "شتۆفان برك" بۆ نەخۆشخانەی بەرلین "زائربروخ" دەستی راستی بە جۆرێك ئێسکەکانی شکابوون کە ئەو نەشتەرگەرە بلیمەتە نەیدەتوانی بیانخاتەوە جێ و نیشانەی "قانقاریا" (کوتران و ڕەشبوونەی بەشێك لە لەش یان ئەو شوێنەی خوێنی پێناگات)ش کە لەسەر دەستەکانی دەرکەوتبوون، بڕینی و گوتی ئەگەر دەستێك کە شکاوە نەبڕدرێتەوە، قانقاریا تەشەنە دەکاتە سەر بەشەکانی دیکەی جەستە و سەرەنجام نەخۆشکە دەکوژێت.

چاوی چەپی "شتۆفان برك"یش بریندار ببوو کە "زائربروخ" بە هیچ لەونێ نەیدەتوانی دەرمانی بکات و بە ناچاری چاوی چەپی بە یەکجاری دەرهێنا. دەستی چەپی "شتۆفان برك" بێجگەلە قامکی ئەسپێ کوژە (قامکە گەورە) هەمووی ساغ بوو، بەڵام تەقینەوەی بۆمب قامکە گەورەی دەستی چەپی پەڕاندبوو. قامکی ئەسپێ کوژە لە هەر دەستێکدا، بۆ بەکارهێنانی قامکەکانی دیکە، پێویستییەکی حاشاهەڵنەگرە و بەبێ قامکە گەورە، قامکەکانی دیکە بۆ کارکردن بەکار نایەن. لە نێوان پێنج قامکی دەستدا، قامکی ئەسپێ کوژە تاقە قامکە کە رووی لەو چوار قامکەکەی دیکەیە و ئەوانی دیکە بە جۆرێك لەپەنای یەك جێگایان گرتووە کە روویان لە یەکتر نیە "زائربروخ" بۆ ئەوەی کارێك بکات کە قامکەکانی دەستی چەپی "شتۆفان برك" بەکەڵکی بێن، بڕیاری دا قامکی دۆشاومژە لەباتی قامکی گەورەی دابنێت هەتا بتوانێ لە سێ قامکی ناوەڕاست (زەرنەقووتە و تووتە کوژە) کەڵك وەربگرێت.

"زائربروخ" لە نێوان قامکی ئاماژە و سێ قامکی دیکەی دەستی چەپی بریندارەکەدا مەودای ساز کرد و قامکی ئاماژەی جۆرێك لێکرد کە رووی لە سێ قامکەکەی دیکەی بێت. هاوکات لەگەڵ ئەو کارانەی کە لەسەر دەستی چەپی "شتۆفان برك" دەیکرد، بەشەکانی دیکەی جەستەشی

که به توندی بریندار ببوون، نەشتەرگەری بۆ کرد، بۆ وێنە سێ ئێسکی لە جەستەی سێ کەروێشك دەرهێنا و لە سێ شوێنی جەستەی بریندارەدا داینا.

دەڵێن لە ئەڵمانیا، یەکەم کەس کە بۆ پێشگیری لە چڵك کردنی برین، لەلایەن "زائربروخ"ەوە دەرمانی "پنی سیلین"ی بۆ بەکار هێنرا "شتۆفان برك" بووە. "پنی سیلین" هەروەك دەزانین بریتانیاییەکان دایانهێنا و لە سەرەتاشدا دەرمانێك بوو کە گرفتی هەبوو و پاییزی ساڵی ۱۹٤۳ کە "چێرچیل" سەرۆك وەزیری بەریتانیا لە باکووری ئەفریقا تووشی نەخۆشیی "زاتولریە" (دەردەسی، ژانەسی) ببوو (لورد موران) پزیشکە پسپۆڕەکەی گوتی ئەگەر "پنی سیلین"ی لێنەدرێ، بێگومان دەمرێت و ئەمڕۆش دەرمانێکی کاریگەرە بۆ نەخۆشیی زاتولریە، بەو پێیەی کە یەك یان هەردووویان (سیپەلاکێك یان هەر دووکیان بریندار ببێت) دەرمانی ئانتی بیووتیك (پنی سیلین)ە و ئەو ڕێژە دەرمانە "پنی سیلین"ەی کە بۆ دەرمانی چرچیل بەکار هێنرا، بەهۆی کەمبوونی پنی سیلین بەنرخی ئەوکاتە ٦۰۰ لیرەی بریتانی بوو. بەڵام ئەمڕۆکە پتر لە چەند مارك بایەخی نیە.

ئەڵمانییەکان، بەو لێهاتوویی و نەزمەی کە لەناویاندا هەبوو، دوای ئەوەی کە پەیبیان بە تایبەتمەندییەکانی "پنی سیلین" برد توانییان لە ماوەیەکی کەمدا، ڕێژەیەکی زۆر "پنی سیلین" بەرهەم بهێنن، بە چەشنێك کەلە هاوینی ساڵی ۱۹٤٤ بەدواوە، زۆرێك لە سەربازە بریندارە ئەڵمانییەکان، کە بەهۆی برین و نەخۆشییەوە پێویستییان بە دەرمانی ئانتی بیووتیك بوو، "پنی سیلین" بۆ وەشێنرا.

"شتۆفان برك" دوای ئەوەی کەلە نەخۆشخانە ئازاد بوو، هەرچەند یەك دەست و یەك چاوی نەبوو، بەڵام دەیتوانی دەستی چەپی بە چوار قامکەوە بەتەواوەتی بەکار بێنێ. دوای ئەوەی کە "شتۆفان برك" لە نەخۆشخانە هاتەوە، هیتلەر بانگهێشتی کرد و گوتی دەبینم "زائربروخ" لەسەر جەستەی تۆ پەرجوو (معجزە)ی کردووە. دوای ئەوەی کە "شتۆفان برك" لە ئەفریقا بریندار کرا گەیشتە پلەی سەرهەنگ (عەقید)ی پێدرا و ئەو ڕۆژەی کە "هیتلەر" ئەو ئەفسەرەی پاش ئازاد کران لە نەخۆشخانە بینی، وەك سەرۆکی ستاد و بنکەی هێزی ئامادە و ڕیزێرڤ هەڵیبژارد و لە ئەڵمانیا ئەو پۆستەیان بە کەسێك دەدا کە لانیکەم پلەی سەرلەشکر (فەریق)ی هەبێت.

دوای ئەوەی کە "شتۆفان برك" دەستبەسەر کرا و لە دادگای سەربازی وتی پێشەوا (هیتلەر)م خۆش دەوێ و ڕێزی دەگرم، بەڵام خۆشەویستیی نیشتمانم (ئەڵمانیا) پترە لە خۆشەویتسیم بۆ هیتلەر و دەمزانی کە تاقە شانس و ڕێگاچارەی ڕزگاریی ئەڵمانیا لە لەناوچوون ئەوەیە کە ئەو وەلا

بنرێت.

بە قەولی هیتلەر "زانربروخ" لەسەر نەشتەرگەریی ئەو ئەفسەرە پەرجووی کرد، بەڵام لە نێوان ڕێکەوتێك کە "شتۆفان برك" لە نەخۆشخانە ئازاد کرا و ئەوکاتەی کەلە سێدارەیان دا، ماوەیەکی زۆری نەخایاند و "هیتلەر" هەتا دوایین ڕۆژی ژیانی ئەو کەسانەی لە سێدارە دا کەلە پیلانی دژی ئەودا کە ڕۆژی بیستەمی مانگی ژوونیەی ساڵی ١٩٤٤ ڕووی دا بەشدارییان کردبوو. هەروەك نۆ ڕۆژ پێش ئەوەی کە خۆی و خۆشەویستەکەی (ئوابرۆن) کەلە دوایین ڕۆژی ژیانیدا بوو بە هاوسەری، لە سەرداوی پەسێوگەی ئەمارەتی ئەعزەمی ئەڵمانیا خۆیان بکوژن، دەریاسالار (کەنارێس) سەرۆکی دەزگای سیخوڕیی و دژە سیخوڕیی ئەڵمانیای لە سێدارە دا. چونکە ڕاپۆرتی ئەوەیان پێدابوو "کەنارێس" لە پیلانی ئەو کەسانەی کە بەتەمابوون لە ڕێگای بۆمبەوە "هیتلەر" بکوژن، ئاگادار بووە، بەڵام ئەوی لەو پیلانە ئاگاداری نەکردۆتەوە و پێشی بە بەڕێوەچوونی ئەو پیلانەش نەگرتووە.

## کارکردنی "زائربروخ" له پۆستی بارێدەدەرداد

لەبەر ئەوەی ڕۆژنامەکانی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات لەبارەی شتێتیی دەروونیی و فەرامۆشیی "زائربروخ"ەوە شتێکیان بڵاو نەدەکردەوە، لە ئەڵمانیای ڕۆژئاواش خەڵك و تەنانەت نەشتەرگەرەکانیش ئاگایان لەو نەخۆشیەی "زائربروخ" نەبوو و تەنیا بەهۆی بڵاوبوونەوەی هەواڵێك کە پێشتر باسی لێوە کرا، دەیانزانی کە خانەنشین بووە (لە حاڵێکدا دەزانین "زائربروخ" بەڵگەکانی خانەنشینیی واژۆ نەکرد).

لە بەرلینی ڕۆژئاوا نەخۆشخانەیەکی بچووك هەبوو بەناوی نەخۆشخانەی دکتۆر "ژونك بلوت" و ئەو نەشتەرگەرە ماوەیەك دوای خانەنشین بوونی "زائربروخ" بڕیاری دا بانگهێشتی بکات تاکوو لە نەخۆشخانەکەی دەست بەکار بێت. چونکە هەموو نەخۆشخانەکانی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات بەڕووی "زائربروخ"دا داخرابوون و ئەو پیاوەیان لە هیچکام لە نەخۆشخانەکان وەرنەدەگرت و مووچەی فەرمیی ئەو ئوستادەشیان بڕی و بنەماڵەی "زائربروخ"یش بێ سەرچاوەی بژێوی ژیان مابوونەوە، بۆیە ئەو نەشتەرگەرە مەزنە پێشنیاری دکتۆر "ژونك بلوت"ی بۆ کارکردن لە نەخۆشخانەکەی قبووڵ کرد و لەوانەیە پێویست نەکات بە تێروتەسەلی باس لەوە بکەین کە مەبەستی دکتۆر "ژونك بلوت" کە لەبەرچی ئەو پزیشکە مەزنەی بە نووسراو بانگهێشتی کردووە، بەڵکوو مەبەستی کەڵك وەرگرتن لە ناو و ناوبانگی "زائربروخ" بوو و دەیهەویست بە ڕاکێشانی ئەو پیاوە ناودارە بۆ نەخۆشخانەکەی خۆی، نەخۆشخانەکەی خۆی پێ گەورە بکاتەوە هەتا ئەو نەخۆشانەی کە پێویستییان بە نەشتەرگەرییە نەتەنیا لە هەموو شوێنێکی ئەڵمانیا، بەڵکوو لە وڵاتانی دیکەی ئەورووپاشەوە سەردانی نەخۆشخانەکەی بکەن.

ڕۆژێك کە "زائربروخ" بۆ یەکەم جار سەردانی نەخۆشخانەی بچووکی "ژونك بلوت"ی لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا کرد، "ژونك بلوت" و ژنەکەی و هەموو فەرمانبەرانی ئەو نەخۆشخانەیە، لەبەر دەرگا، بۆ پێشوازی لەو نەشتەرگەرە بلیمەتە بە ریز ڕاوەستان و سەریان نەوەی کرد و دواتر پاش وی چوونە ناو نەخۆشخانەکەوە و دکتۆر "ژونك بلوت" بەشە جیاجیاکانی ئەو نەخۆشخانە بچووکەی پیشانی زائربروخ دا. کاتێك "زائربروخ" لە نەخۆشخانەی "ژونك بلوت" دەستی بەکار کرد، هەرچەند خەڵکی زیاتر ڕوویان لەو نەخۆشخانەیە کرد، بەڵام داهاتی فەرقێکی ئەوتۆی نەکردە

چونکە ئەو کەسانەی کە سەردانی ئەو نەخۆشخانەیان دەکرد، زیاتریان خەڵکی ئەڵمانیا و بەرلینی رۆژهەڵات بوون و ئەوکاتەش هاتوچۆ ئازاد بوو و زۆربەشیان خوویان گرتبوو کە بەهای کاری نەشتەرگەری بە نرخی هەرزانی ئەڵمانیای رۆژهەڵات بدەن و دکتۆر "زائربروخ"یش لەو زیاتری داوا نەدەکرد و یەکێك لە رازەکانی خۆشەویستیی "زائربروخ" لەناو خەڵك هەمان رەفتاری قەناعەتی بوو بە مولکی دنیا و داهات.

بەڵام دکتۆر "ژونك بلوت" کە مەبەستی لە بانگهێشتی "زائربروخ" بۆ هاوکاری بردنە سەری رێژەی داهاتی نەخۆشخانەکە بوو، دەیهەویست لەناو و ناوبانگی ئەو مامۆستا مەزنە کەڵك وەربگرێت. لە ئەڵمانیای رۆژئاوا دامەزراوەیەك هەبوو بەناوی "فۆکس فیلم" کە سەرقاڵی کاری فیلمی دیکیۆمێنتاری بوو و دوای ئەوەی کە "زائربروخ" لە نەخۆشخانەی "ژونك بلوت" دەست بەکار بوو، ئەو دامەزراوەیە پێشنیاری بە بەڕێوەبەری نەخۆشخانەکە کرد تاکوو لە یەکێك لە نەشتەرگەرییەکانی "زائربروخ" فیلم هەڵبگرنەوە و دیکیۆمێنتێك ساز بکەن.

دکتۆر "ژونك بلوت"یش بە هیوایەی سازکردنی دیکیۆمێنت، یارمەتیی برەوی کارەکەی و ناوبانگی نەخۆشخانەکەی دەدات، پێشنیاری دامەزراوەی "فۆکس فیلم"ی قبووڵ کرد و قەناعەتی بە "زائربروخ"یش هێنا کە فیلم هەڵگرەکان لە ژووری نەشتەرگەری ئامادە بن و فیلم هەڵبگرنەوە. رۆژێك کە دەبا فیلم هەڵگرەکان هاتبان دکتۆر "بلوت" پێی راگەیاندن، ئەگەر پاش چوونە ناو ژووری نەشتەرگەری، هەستتان بەوە کرد کە "زائربروخ" بە هاتنتان قەڵس و تووڕە بووە، مەڕەنجێن و تەنانەت ئەگەر بەرامبەرتان توندوتیژیشی نواند، کارەکەتان جێ مەهێڵن.

دکتۆر "بلوت" سەرەڕای ئەوەی کە رەزامەندیی "زائربروخ"ی بۆ هاتنی فیلم هەڵگرەکان بەدەستهێنا بوو، بەڵام پێشبینی دەکرد لەوانەیە ئەو نەشتەرگەرە ناڕەزایەتی دەربڕێت و فیلم هەڵگرەکانیش بەو بۆنەوە کارەکەیان بەجێ بهێڵن. ناوبانگی "زائربروخ" ئەوەندە زۆر بوو کە ئەو رۆژە خودی بەڕێوەبەری دامەزراوەی "فۆکس فیلم" لەگەڵ ستافی کارەکە هاتبووە نەخۆشخانە. ئەو رۆژە، بڕیار بوو لە نەخۆشخانەی دکتۆر "بلوت" یەکێك لە گورچیلەکانی ژنێکی نەخۆش کە تووشی نەخۆشیی گورچیلە ببوو، دەربهێنن و "زائربروخ" هەرکە هاتە ناو نەخۆشخانەوە بە دکتۆر "بلوت"ی راگەیاند کە ئەمن ئەمڕۆ کاری نەشتەرگەری ناکەم و دەبە یاریدەدەری ئێوە.

ئایا "زائربروخ" لەو کاتەدا بەهۆی فەرامۆشی، خۆی لەو کاتەدا بینیوە کە هێشتا نەبۆتە نەشتەرگەرێکی سەربەخۆ و پێی وابووە کە دەبێ لە ژووری نەشتەرگەری وەکوو یاریدەدەر کار بکات؟ ئێمە لەو ئەندێشە و هۆکارانەی کە ببوونە هۆی ئەوەی کە ئەو رۆژە "زائربروخ" ئەو

پێشنیارە بە دکتۆر "بلوت" بکات بێ ئاگاین و دکتۆر "بلوت"یش لە پێشنیاری بلیمەتێکی وەکوو "زائربروخ" زۆر سەرسام بوو، چونکە ئەو پێشنیارە لەوە دەچوو کە مامۆستایەکی مەزن بە قوتابییەکەی بڵێ دەیهەوێ لەژێر دەستیدا کار بکات. بەڵام "بلوت" پاش سەرسام بوون لە پێشنیاری "زائربروخ" بەبێ ئەوەی کە تەنانەت بیر لەوە بکاتەوە کە چ روو دەدات، لەناخەوە خۆشحاڵ بوو، چونکە ئەو رۆژە، فیلم هەڵگرەکان لە کاری نەشتەرگەری فیلمیان هەڵدەگرت و بۆ دکتۆر "بلوت" چ شانازییەك گەورەتر لەوەی کە پیاوێکی وەکوو "زائربروخ" لە ژووری نەشتەرگەری یاریدەدەری بێت؟

رۆژی دیاریکراو نەخۆشەکەیان بردە ژووری نەشتەرکەریێ و دکتۆر "بلوت" و "زائربروخ" چوونە ژوورەوە و دکتۆری بێهۆشی و پەرستارەکان بەرلەو دوو نەشتەرگەرە لەوێ ئامادە بوون و پاش هاتنی وێنەگرەکان کاری نەشتەرگەری دەستی پێکرد. دکتۆر "بلوت" دەستی کرد بە نەشتەرگەری و "زائربروخ" پاش ئەوەی کە شوێنی برینەکە هەڵدڕا، بە پۆنس هەر دوو لێوارەی برینەکەی لێك جیا کردەوە هەتا ئەوەی کە دکتۆر "بلوت" شوێنی برینەکە بە جوانی ببینێ. وێنەگرەکانیش دەست بەکار بوون و لە ژووری نەشتەرگەرییەکە بێجگەلە دەنگی ئاپاراتی وێنەگرییەکە هیچ دەنگێکی تر نەدەبیسترا و هەندێ جاریش یەکێك لە پەرستارەکان کەرەستەیەکی پزیشکیی هەڵدەگرت و دەیدایە دەستی دکتۆر "بلوت" و دەنگێکی هێواشی ئاسنی دەهاتە بەرگوێ.

کاری نەشتەرگەریی دەرهێنانی گورچیلەیەکی لەکار کەتوو، پێویستی بەوەیە کە هەموو ئەو رێگا و دەمارانەی کە بە گورچیلەوە پەیوەستن، ببەستن و دواتر گورچیلەکە دەربێنن، چونکە ئەگەر ئەو دەمارانە رێگایان نەبەسترێ نەتەنیا خوێن، شوێنی نەشتەرگەرییەکە دادەپۆشێ؛ بەڵکوو ئەوەندە خوێنی لەبەر دەڕوات کە لەوانەیە نەخۆشەکە گیانی لەدەست بدات. بەڵام بینینەوەی بۆرییەکانی خوێن (دەمارەکان) بۆ بەستنیان لە هەموو ئەو نەشتەرگەرییانەی کە پێوەندییان بە گورچیلەوە هەیە، ئاسان نیە و کاتی زۆر دەبات، چونکە هەندێ جار بەهۆی خراپیی گورچیلە، هەندێ لە دەمارەکانی خوێن بەهۆی بافتە هەڵئاوساوەکان یان بافتی دیکە کە قەوارەیان گۆڕاوە، دادەپۆشرێ و دەبێ نەشتەرگەر، ئەو شانانە لە دەمار جیا بکاتەوە و ئەوکاتە دەمارەکان بدۆزێتەوە.

گورچیلەی خراپ بۆی ئەو ژنە نەخۆشەش کە دەبوا لابرێت، تووشی هەمان دۆخ ببوو و دکتۆر "بلوت" شانەکانی لە دەمار جودا دەکردەوە هەتا دواتر بیانبەستێ. لەوپەڕی بێدەنگیی ژووری نەشتەرگەرییەکەدا لەناکاو دەنگی "زائربروخ" بە شێوازی سەرکۆنانە بەرز بۆوە و روو بە دکتۆر

"بلوت"ی گوت بۆ هێندە کێشی دێنی؟... ئەمە (ئاماژە بە گورچیلە) هەلگرە و برینەکە ببەستە!

لەو ژوورە، ئەو قسەکردنە سەرکۆنەیە بەلای هەموو ئەو کەسانەی کە لەوێ ئامادە بوون بۆ وێنە فیلم هەلگر و پەرستار و تەنانەت دکتۆری بێهۆشی ئاسایی بوو، چۆن هەموان و تەنانەت بەرپرسی بێهۆشی پێیان وابوو "زائربروخ" بۆیە بۆتە یاریدەدەر کە ئەگەر هات و دکتۆر "بلوت" هەڵەیەکی کرد، هەڵە و کەموکوورییەکانی پێ بلێ. چونکە پلە و پێگەی "زائربروخ" هێندە بەرز بوو، کەس بیری لەوە نەدەکردەوە ببێتە یاریدەدەری کەسێکی وەك دکتۆر "بلوت" مەگەر بۆ بەرژەوەندییەکی پسپۆڕی و چاوەدێری بەسەر کاری نەشتەرگەریی دکتۆر "بلوت".

دکتۆر "بلوت" بەو شێوە سەرکۆنەیە لەلای فەرمانبەران و فیلم هەلگرەکان زۆر بەخۆیدا شکایەوە و سوور هەلگەڕا، بەلام هیچی نەگوت. "زائربروخ" کە چاوەڕێی وەلامێك لەلایەن دکتۆر "بلوت"ەوە بوو، کاتێك لەگەڵ بێدەنگیی ئەو بەرەوڕوو بوو، بە شێوەیەکی توندتر گوتی مەگەر لەگەڵ تۆم نیە؟ بۆچی بە گوێم ناکەی؟ ئەمە (ئاماژە بە گورچیلە) ببڕە و فڕێی بدە. ئەم رەخنەیە پتر لە جاری یەکەم بەلای ئەو کەسانەی کەلە ژوورەکە بوون لۆژیکی هاتە بەرچاو و هەموان پێیان وابوو دکتۆر "بلوت" تووشی هەڵەیەك بووە و "زائربروخ" هەقیەتی کە رەخنە و لۆمەی بکات. دکتۆر "بلوت" کە ئیتر نەیدەتوانی بێدەنگ بێت گوتی "گهیم رات" مەگەر بەرێزتان نازانن کە سەرەتا دەبێ شانەکان لە دەمارەکان جیا بکرێنەوە و دواتر رێگای دەمارەکان ببەسترێن و پاشان گورچیلەکە ببڕدرێ و ئەگەر بێت و بەبێ بەستنی دەمارەکان، گورچیلەکە ببڕم هێندە خوێن دەڕوات نەخۆشەکە دەمرێت.

"زائربروخ" گوتی کاتێك کاردی نەشتەرگەری دەدرێتە دەستی کەسانێکی وەکوو ئێوە، ئەنجامەکەی ئەوەیە کەلە نەشتەرگەرییەکی سادەی وەکوو گورچیلەدا دەستەوەستان دەمێننەوە.

دکتۆر "بلوت" دیسان بێدەنگ بوو.

ئەو فیلم هەلگرانەی کەلە ژوورەکە بوون، ئاگایان لە نەخۆشیی شێتیی دەورەیی و فەرامۆشیی "زائربروخ" نەبوو، بۆیە پێیان وابوو دکتۆر "بلوت" خەریکی کارێکە کە لەگەڵ رێوشوێن و پێوەری زانستی و تەکنیکیی نەشتەرگەری ناتەبایە، هەربۆیە "زائربروخ"بەپێی ئەرك رەخنەی لێگرتووە، بەلام لەوە سەرسام بوون بۆچی دکتۆر "بلوت" سەرپێچی دەکات و فەرمانەکانی "زائربروخ" بەجێ ناگەیەنێ. لە ژووری نەشتەرگەری، هیچ کەس نەیدەزانی کە "زائربروخ" دیسان تووشی هێرشی فەرامۆشی و شێتیی کاتی بووە و ئەو مامۆستایە کەلە بێدەنگیی دکتۆر "بلوت" تووڕە ببوو، هاواری کرد حەیوان، مەگەر پێت نالێم ئەمە (ئاماژە بە گورچیلە) بپچڕێنە و فڕێی بدە بۆ

جێبەجێی ناکەی؟

دکتۆر "بلوت" گوتی جەنابی "زانربروخ" من بەرپرسی کاری نەشتەرگەریم نەک ئێوە، ئێوە لێرە یاریدەدەری منن و نابێ دەست لە کاری من وەربدەن. ئەوکات لەوپەڕی سەرسامیی ئامادەبوان و بەتایبەت وێنەگراندا، ڕووداوێك کەلە نەخۆشخانەی بەرلینی ڕۆژهەڵات رووی دابوو، دووپات بۆوە و "زانربروخ" هێرشی کردە سەر دکتۆر "بلوت" و پێکەوە دەستەویەخە بوون. وێنەگران لەوە گەیشتن کە ئەوە دیمەنێکی تایبەتە کە بەگومانی ئەوان هەتا ئێستا وێنەی نەبووە و وێنەی نابێت، بە جیدییەوە درێژەیان بە وێنەگرتن دا و لە هەوڵی ئەوەدا بوون کە هیچ دیمەنێکی ئەو شەڕە دەستوێخەیە نەفەوتێ.

هاوسەری دکتۆر "بلوت" کە بەهۆی دەنگ و هەراوە خۆی گەیاندبووە ژووری نەشتەرگەری تێدەکۆشا "زانربروخ" لە کۆڵی مێردەکەی بکاتەوە و وێنەگرەکانیش بمبێ ئەوەی کە چرکەیەکیش لەو دیمەنە دەگمەن و تایبەتە لەدەست بدەن، درێژەیان بە وێنەگرتنی خۆیان دەدا. ئەگەر هاواری دکتۆر بێهۆشی نەبایە کەسانی دیکەی بە ئاگا نەدەهێنایەتەوە، ئەو ژنە داماوە دەمرد، بەڵام هاواری ئەو پزیشکە سەرلەی دکتۆر "بلوت" و پەرستار و وێنەگرەکانی بۆ لای ژنە راکێشا کە لەسەر تەختی نەشتەرگەری کەوتبوو و مەترسیی مەرگی لەسەر بوو، بە هەر لەوێنێك بوو "زانربروخ"یان بە کێشەکێش لە ژووری نەشتەرگەرییەکە بردە دەرەوە و وێنەگرەکانیش بە خێرایی وەدەرکەوتن، چونکە پێشبینی ئەوەیان دەکرد کە دکتۆر "ژونك بلوت" داوایان لێدەکات کە وێنەی دیمەنی شەڕەکەی پێی بدەن یان بیسڕنەوە، هەرچەند ئەو ڕۆژە وەها داخوازییەکی نەکرد، بەڵام دواتر دکتۆر "بلوت" داوای لە بەڕێوەبەری "فۆکس فیلم" کرد لەبەر پاراستنی ئابڕووی نەخۆشخانەکەی و هەروەها ڕێز و حورمەتی "زانربروخ" لە پیشان دانی خۆ ببوێرن.

دوای ئەوەی کە دکتۆر "بلوت" توانی کاری نەشتەرگەرییەکە ئەنجام بدات، گوتی ئێستا تێدەگەم ئەوەی کە پاش هێنانی "زانربروخ" بۆ ئەم نەخۆشخانەیە لەبارەی شێت بوونییەوە چییان بە من گوتووە، ڕاستە. ڕۆژی دواتر کە هێشتا پێوەندیی تەلەفۆنی نێوان بەرلینی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات نەپچڕابوو، لە نەخۆشخانەی دکتۆر "ژونك بلوت"ەوە پێوەندییان بە ماڵی "زانربروخ"ەوە گرت لەبەر ئەوەی ئەمڕۆ، نەخۆشێکیان بۆ نەشتەرگەری نیە، بۆیە با خۆی نەخاتە زەحمەتەوە و پێویست ناکات بێتەوە نەخۆشخانە.

ڕۆژی دواتر "زانربروخ" هاتەوە نەخۆشخانە بەڵام ڕێگایان نەدا بڕواتە ژوورەوە.

لەو کاتەوە بەدواوە ئیدی "زانربروخ" بە تەواوتی خانەنشین بوو، بەڵام ئەو نەخۆشانەی کە لەوە

بێ ئاگا بوون ئەو نەشتەرگەرە تووشی نەخۆشیی فەرامۆشی بووە و باوەڕیان پێ هەبوو، سەردانی ماڵەکەیان دەکرد و داوایان لێدەکرد و تەنانەت لێی دەپاڕانەوە تەنانەت لە ماڵەکەشیدا بێت نەشتەرگەرییان بۆ بکات. ئەم قۆناغەی ژیانی پسپۆڕانەی "زائربروخ" خراپترین و دەورەی ژیانی بوو پاش ئەوەی کە نەخۆشیی فەرامۆشی رووی تێکرد. ئەو لەو قۆناغەی ژیانیدا بەبێ ئەوەی کە بزانێ چی دەکات، کۆمەڵێك لەو کەسانەی کە بۆ نەشتەرگەری سەردانیان کردبوو پارچەپارچە کرد یان بە شێوازی دیکە ببووە هۆی مردنیان و رەوانەی گۆڕستانی کردبوون.

بەڵام پێش ئەوەی کە لەبارەی ئەم قۆناغەی ژیانی "زائربروخ"ەوە شتێك باس بکەین، پێویستە ناوی پیاوێك بێنین کەلە دوایین مانگەکانی تەمەنی "زائربروخ"دا کاریگەریی لەسەر ژیانی هەبوو کە هێشتا ناویان نەهێنا، ئەو پیاوە بە "شوردفکر" ناسرابوو.

## پیاوێکی هەڵاتوو کە هاتە ناو ژیانی "زائیربروخ"ەوە

"شۆرد فکر" لە سەرەتای لاویەتیدا بیروباوەڕی چەپیی هەبوو و دوای ئەوەی کە هیتلەر دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت، لە بەرلین دووکانێکی بچکۆلانەی دانا و تێیدا کتێبی کۆنەی دەفرۆشت و هەندێ جاریش بۆ خۆی کتێبگەلی هەرزانی بە چاپ دەگەیاند و دەیفرۆشت.

دوای دەسپێکی شەڕ لە مانگی سێپتامبری ساڵی ١٩٣٩ یەك لەو کەسانە بوو کە دەبوا بڕواتە خزمەتی سەربازییەوە، بۆیە ڕۆیشتە سەربازی و دووکانە بچکۆلانەکەی سپاردە شاگردەکەی. بەڵام لە کاتی خزمەتی سەربازیدا نەیدەتوانی پێش بە زمانی خۆی بگرێت و جارێکیان هەر بەو بۆنەوە تەمێ کرا، بەڵام چونکە سەربازێکی زیرەك و ئازا بوو، پلەی گرووبانیی پێدرا. ساڵی ١٩٤٥ (ساڵی کۆتایی شەڕ لە ئەورووپا) "شۆردفکر" لە کارگەیەکی سازکردنی چەکوچۆڵ سەرقاڵی نیگابانی بوو، لەو کارگەیەش وەکوو کارگەکانی دیکەی سازکردنی چەکوچۆڵ لە ئەڵمانیا، کرێکارەکان، شەو و ڕۆژ سەرقاڵی کار بوون، شەوێکیان "شۆردفکر" لە یەکێك لەو کارگانە بە کرێکارەکانی گوت لە یەکێك لەم شەوانە فڕۆکە بۆمب هاوێژەکانی ئەمریکا و بریتانیا ئەم کارگەیە بۆمباران دەکەن و هەمووتان دەکوژرێن.

لەبەر ئەوەی لە هەموو کارگەکانی ئەڵمانیا سیخوڕی نهێنی هەبوون، ڕۆژی دواتر "شۆردفکر" دەستبەسەر کرا و دەیزانی ئەگەری زۆرە بەهۆی ئەو تاوانەوە ڕەوانەی بەرەکانی شەڕی بکەن، بەڵام پێش ئەوەی کە کاتی دادگایی کردنی بگات لەناو زیندان، کارێکی دیکەی ئەنجام دا کەلە ڕوانگەی "نازی"ییەکانەوە وەك یەکێك لەو تاوانانە دەهاتە ئەژمار کە لێبووردنی تێدا نەبوو کە ئەویش خوێندنی سروودێك بوو بەدژی "هیتلەر" کە ناوەڕۆکەکەی جەختی لەسەر لە سێدارەدانی دەکردەوە.

خوێندنی ئەو سروودە لەناو زیندان بەپێی پێشینەی سیاسیی ئەو پیاوە بووە هۆی ئەوەی کە دادگای سەربازی ڕۆژی ١٤ی ئاوریلی ساڵی ١٩٤٥ بە تاوانی خەیانەت بە نیشتمان بە سزای ئیعدام مەحکوومی بکات. "شۆردفکر" داوای پێداچوونەوەی بەو حوکمە کرد و دۆسیەکەی ڕەوانەی دادگای پێداچوونەوە کرا و ڕۆژی ٢٩ی ئاوریلی هەمان ساڵ دادگای پێداچوونەوە حوکمی دادگای سەرەتایی تەئید کردەوە و ئەویان ڕەوانەی زیندانی بەرلین کرد هەتا لە بەرەبەیانی ڕۆژی سییەمی ئاوریل ئیعدام بکرێت. بەرەبەیانی ئەو ڕۆژە زیندانی بەرلین درایە بەر تۆپ و خومپارەی

ئەرتەشی یەکیەتیی سۆڤیەت، چونکە ئەرتەشی یەکیەتیی سۆڤیەت گەیشتبووە بەرلین و بەو پێیەی کەلە مێژووی شەڕی دووەمی جیهانیدا نووسراوە، ئەرتەشی سوور بە چل هەزار تۆپەوە بەرلینی تۆپباران کردووە.

لە زیندانی بەرلین بەهۆی تۆپ و خومپارە بارانەوە نەزم و باری ئەمنی تێکچوو و هەرکەس کە زیندوو مایەوە لە زیندانی و نیگابانەوە بگرە هەموو هەڵاتن "شۆردفکر"یش کە هێشتا هەر جلوبەرگی سەربازیی لەبەردا بوو، بەڵام ریشی بەهۆی مانەوەی لە زیندان درێژ ببوو، هەڵات، نەیدەزانی بڕواتە کوێ کوێ و لە کوێ خۆی بشارێتەوە.

ئەگەر ئەڵمانییەکان بیانگرتبا دەیانکوشت و ئەگەریش سەربازانی رووسیا بیاندیتبا لەبەر ئەوەی جلوبەرگی ئەرتەشی ئەڵمانیای لەبەردا بوو، دەکەوتە بەر رەهێڵەی گوللە و دەکوژرا. لە حاڵێکدا وێڵ و وەیلان بەناو شەقامە وێرانەکانی بەرلیندا دەگەڕا، گەیشتە بەردەم نەخۆشخانەی شاریتی هەڵکەوتوو لە بەرلینی رۆژهەڵات و وەبیری هاتەوە کە "زائربروخ" نەشتەرگەری مرۆڤدۆست لەوێ کار دەکات. بە "شۆردفکر"یان راگەیاند کە "زائربروخ" لە پەسێوگەی نەخۆشخانە سەرقاڵی کارە و ئەوەندە لەو پەسێوگە مایەوە هەتا ئەوەی کە "زائربروخ" لە نێوان دوو نەشتەرگەریدا چەند خولەکێك لە ژووری نەشتەرگەری هاتە دەشت.

"شۆردفکر" خۆی پێ گەیاند و لە چەند رستەدا بارودۆخی باس کرد و گوتی پەنای هێناوەتە بەر ئەو. "زائربروخ" رۆیشتە ناو ژووی نەشتەرگەرییەوە و ریش تەراشێکی ژێلێت و لەتە سابوونێکی بۆ هێنا و بە "شۆردفکر"ی دا گوتی بڕۆ ئاودەستەکەوە و ریشت بتاشەوە و دواتر وەرە ژووری نەشتەرگەرییەوە.

"شۆردفکر" ریشی تاشی و رۆیشتە ژووری نەشتەرگەری و "زائربروخ" باڵاپۆشێکی سپی و خوێناویی پێدا و گوتی ئەمە لەبەر بکە و لەم کاتە بەدواوە تۆ یەکێك لە یاریدەدەرکانی منی. "شۆردفکر" گوتی من لە پزیشکی و نەشتەرگەری هیچ نازانم، چۆن دەتوانم ببمە یاریدەدەری بەڕێزتان؟ "زائربروخ" گوتی لەگەڵ من وەرە ژوورەوە، هەتا من لەوێم تۆش لەوێ بە و دوای من لە ژووری نەشتەرگەری وەرە دەرەوە و ئیتر کەس لێت ناپرسێت کە ئاخۆ لەبارەی پزیشکی و نەشتەرگەرییەوە شتێك دەزانی یان نا و دڵێم لێرەش جیرەیەکی غەزاییت پێبدەن هەتا برسیت نەبێت.

لە و رۆژانەی کە شەڕ لە بەرلین بەردەوام بوو "شۆردفکر" هەر لەو نەخۆشخانە بوو و دوای کۆتایی شەڕ لە نەخۆشخانە هاتە دەرەوە و بەوپڕی سەرسامییەوە بینی لەو شارە کە هەموو بینا و

ماڵەکان وێران ببوون، خانووچکەی کتێب فرۆشییەکەی ئەو وێران نەبووە و دەڵێی خۆمپارە و تۆپەکان عاریان هاتووە کە ئەو دووکانە بچووکە هەژارانەیە وێران بکەن. "شۆردفکر" پێش لە شەڕ بەو هۆیەی کە لاو بوو و تازە دەستی دابووە کار، کتێبی هەرزانی چاپ دەکرد و زیاتر ئەفسانەکان و بەتایبەت ئەفسانە جینایەکانی چاپ و بلاو دەکردەوە، بەڵام دوای شەڕ، پیاوێکی خاوەن ئەزموون و لەباری فکرەوە گەشەی کردبوو و دوای ئەوەی کە بارودۆخی بەرلین گۆڕدرا و توانی دووکانەکەی دیسان بکاتەوە، بیری لەوە کردەوە کە کتێبگەلێك چاپ بکات کە لەسەرووی ئەفسانەکانەوە بن و بیرەوەریی چەند کەس لە ئەفسەران و سەربازانی ئەڵمانیی سەبارەت بە ساڵانی شەڕی دووەمی جیهانی چاپ کرد و فرۆشتنی.

"شۆردفکر" رۆژێکیان لە رۆژنامە خوێندییەوە کە "زانربروخ" خانەنشین بووە و دواتر لە هەواڵێکی دیکەی رۆژنامەدا خوێندییەوە کەلە نەخۆشخانەی دکتۆر "ژونك بلوت" دەستی کردووە بەکار و بۆ جاری سێیەم لە رۆژنامە خوێندییەوە کە نیتر لە نەخۆشخانەی دکتۆر "بلوت" کار ناکات و بەو پێشینە و ناشنایەتییەی کە لەگەڵ "زانربروخ" هەیبوو کەوتە بیری پێشنیاری پێ بکات هەتا بیرەوەرییەکانی بلاو بکاتەوە "شۆردفکر" پاش ئەوەی کە "زانربروخ"ی بینی هەستی کرد کە باری ماڵی و دۆخی ژیانی ئەو نەشتەرگەرە خراپە.

"زانربروخ" ئیتر لە نەخۆشخانەی "شاریتی" مووچەی وەرنەدەگرت، چونکە بە شێوەی فەرمی خانەنشین نەکرابوو (لەبەر ئەوەی ئەو بەلگانەی کە دەبوا واژۆیان بکات نەیکرد) مووچەی خانەنشینیی وەرنەدەگرت. "زانربروخ" لە هەمبەر پێشنیاری "شۆردفکر"دا گوتی بیرەوەرییەکانی لە یەك مانگدا ئامادەی چاپ دەبن (ئەم بەڵێنیەشی هۆکاری هەمان فەرامۆشیی زەینی بوو، چونکە بیرەوەریی تەمەنێك ناکرێ لە یەك مانگدا بنووسرێتەوە). "شۆردفکر" دوای ئەوەی بیستی کە بیرەوەرییەکانی هەتا مانگێکی تر ئامادە دەبێت، لەگەڵ یەکێك لە هاوکارەکانی کە دامەزراوەیەکی چاپەمەنیی بەناوی "کیندلر"ی لە شاری "مۆنیخ" هەبوو لەم بارەوەی قسەی کرد هەتا پێکەوە بیرەوەرییەکانی ئەو نەشتەرگەرە بلیمەتە چاپ و بلاو بکەنەوە.

"کیندلر" گوتی ئەگەر "زانربروخ" بیرەوەرییەکانی خۆی هەتا ئێستا نەنووسیبێتەوە و بیهەوێ لە ئەمڕۆوە دەست پێ بکات، لانیکەم هەتا یەك ساڵی تریش ئەو بیرەوەرییانە ئامادەی چاپ نابن. بەڵام دەکرێ بیەرەوەرییەکانی هەرچەندەی کە ئامادە دەبێت ناوبەناو لە یەکێك لە رۆژنامەکانی چاپ بکرێ و پاشان کە کۆتایی پێهات، بە شێوەی کتێب چاپ و بلاو بکرێتەوە و یەکێکی تر ئەوەیە کە بیرەوەرییەکانی "زانربروخ" بۆ چاپ کردن لە گۆڤار دەبێ بە وردی پێداچوونەوەی پێدا

بکرێت.

چونکە "زائربروخ" نەشتەرگەرە و وەکوو هەموو پزیشك و نەشتەگەرەکان بیرەوەرییەکانیان بە شێوازی زانستی دەنووسن و خەڵکی ئاسایی تێناگەن کە ئەو چی گوتووە و کتێبێك کە بەو چەشنە لەلایەن پزیشك یان نەشتەرگەرێکەوە دەنووسرێت، فرۆشێکی ئەوتۆی نابێت، چونکە خەڵکی ئاسایی نایخوێننەوە، بۆیە کاتێك پزیشك و نەشتەرگەرێك کە دەیهەوێ بیرەوەرییەکانی خۆی بۆ خەڵك (نەك هاوکارانی خۆی کە خاوەنی پسپۆڕی و بواری زانستین) بڵاو بکاتەوە، نووسەرێك دەکەنە بەرپرس کە بیرەوەرییەکانی لە قاڵب و داڕشتن و ناوەرۆکی زانستییەوە بە شێوازێك دابڕێژێتەوە هەتا بۆ خەڵکی ئاسایی کە بە زاراوە و دەستەواژە پزیشکییەکان ئاشنا نین، جێگای فام و تێگەیشتن بێت.

بیرەوەرییەکانی "زائربروخ"یش دەبوا لەلایەن نووسێکەوە دابڕێژرێتەوە و لە گۆڤارێك چاپ بکرێت و دوای ئەوەی کە کۆتایی پێهات لە قەوارەی کتێبدا چاپ و بلاو بکرێتەوە و ڕەزامەندیی "زائربروخ" بۆ نووسنەوە و داڕشتنەوەی بیرەوەرییەکانی لەلایەن نووسەرێکی ئاسابیەوە زەروورییە و هەندێك لە بیرمەندان رازی نابن کە کەس دەست بخاتە ناو بیرەوەرییەکانیانەوە.

"شۆردفکر" جارێکی تر ڕۆیشتەوە بۆ ماڵی "زائربروخ"، هەتا ئەو شتانەی کە بەڕێوەبەری دامەزراوەی چاپەمەنیی "کیندلر" باسی کردبوو بۆی باس بکات و ڕەزامەندیی ئەو بۆ ئەوەی کە بیرەوەرییەکانی لەلایەن نووسەرێکەوە بنووسرێتەوە، بەدەست بێنی و بە جۆرێك دابڕێژرێتەوە کە خەڵك لێی تێبگەن و "زائربروخ"یش بەو مەرجە رازی بوو و "شۆردفکر" بەو مامۆستایەی گوت کە بەمزوانە بۆ بەستنی گرێبەستی بڵاوکردنەوەی بیرەوەرییەکانی لەلایەن دامەزراوەی "کیندلر"ەوە سەردانی دەکەن. سەرەنجام دامەزراوەی "کیندلر" گەنجێکی ڕۆژنامەنووس کە هەم هەواڵنێر و هەم نووسەری بەناوی "برن دروف"ی کردە بەرپرس کە برواتە بەرلین و ڕەشنووسی گرێبەستی بڵاوکردنەوەی کتێبی بیرەوەرییەکانی "زائربروخ" لەلایەن ئەو نەشتەرگەرەوە واژۆ بکات. ئەو لاوە ڕۆژنامەنووس کە وەك زۆرێك لە هەواڵنێران و نووسەرانی گەنجی ڕۆژنامەکان، زیرەك و وریا بوو لەلایەن "کیندلر"ەوە پێی ڕاسپێردرا لانیکەم دەبێ ئەو مامۆستایە وا تێبگەیەنێ کە بیرەوەرییەکانی و ڕەفتاری لەگەڵ بیرمەندانی ناسراو و دەسەڵاتدار و سەرکۆمار و ئەو کەسایەتییە ناسراو و بەناوبانگانەی جیهان کە کاری نەشتەرگەریی بۆ کردوون، جیاواز بێت و پشکی زیاتریان بەرکەوێ، چونکە خەڵك پێیان خۆشە ئاگاداری ژیانی تاکەکەسیی کەسانی ناسراو و بەناوبانگی دنیا بن.

"کیندلر" بیستبووی که "زائربروخ" نەشتەرگەریی بۆ ویلهلومی دووم ئیمپراتۆری ئەڵمانیا و جۆرجی پێنجەم پاشای بریتانیا و ستالین دیکتاتۆری یەکیەتیی سۆڤیەت و موسولینی دیکتاتۆری ئیتالیا کردووە و هیتلەریش سەردانی کردووە و بەو گەنجە رۆژنامەنووسەی راسپارد کە بە "زائربروخ" بڵێت کەلە بیرەوەرییەکانیدا لەبارەی ژیانی ئەو کەسایەتی و دەسەڵاتدارانەوە زیاتر بنووسێت و زانیاری بڵاو بکاتەوە. "برن دروف" بە کۆڵەبارێك راسپاردەی "کیندلر"ەوە بەرەو بەرلین کەوتەڕێ و سەردانی ماڵی "زائربروخ"ی کرد، بەڵام پێیان راگەیاند کە ئەو مامۆستایە بۆ بەشداری لە کۆنگرەی پزیشکی و نەشتەرگەران رۆیشتووە بۆ شاری "ویسبادن". "برن دروف" بە ناچاری بەرەو شاری "ویسبادن" کە یەکێك لە شارەکانی ئەڵمانیا بوو و کۆنگرەی پزیشکی و نەشتەرگەری لەوێ بەسترابوو، کەوتەڕێ و لە هۆتێلە گەورە و مۆدێرنەکانی شار سۆراغی "زائربروخ"ی گرت، چونکە پێی وابوو کەسێکی وەك "زائربروخ" لە سەفەردا هەمیشە لە هۆتێلە ناسراوە و گەورەکان دەمێنێتەوە. بەڵام لەو هۆتێلانەدا ناوی "زائربروخ" تۆمار نەکرابوو. "برن دروف" لەگەڵ چەند کەس لە پزیشك و نەشتەرگەری دیکە کە بەشداری کۆنگرەکە بوون پێوەندی گرت و پرسیاری لێکردن کەلە کوێ دەتوانێ "زائربروخ" ببینێت، بەڵام هەستی کرد کە ئەوان نایانەوێ وەڵامی راست و دروستی بدەنەوە و دوو کەسیان وتیان کە زائربروخ نەخۆشە.

"برن دروف" نەیدەزانی کە "زائربروخ" لەو کۆنگرە پزیشکییەشدا وەکوو ئاخاوتنی کۆنفرانسی تەلاری "بتهۆڤن" لە شاری "هانور" تووشی فەرامۆشی و پەرێشان حاڵی بووە. لە کۆنگرەی پزیشکی و نەشتەرگەریی "ویسبادن"دا بەپێی ریزی بەرنامەکان بڕیار بوو کە "زائربروخ" لەبارەی نەشتەرگەریی سینگ (قەفەسەی سینگ) و بە زاراوەی پزیشك و نەشتەرگەرانی پێشوو "قەفەسەی سەدری" قسە بکات، چونکە ئەو پزیشکە بلیمەتە یەکێك لە پێشەنگانی نەشتەرگەری لە سینە و هەروەها لەبارەی سیپەلاك و دڵیشەوە یەکەم داهێنەر بوو و پێش لەو کەسێك نەشتەرگەریی بۆ سیپەلاك و دڵ نەکردبوو، هەربۆیە پێشبینیی ئەوە دەکرا کە ئاخاوتنی ئەو نەشتەرگەرە بلیمەتە زۆر سەرنجراکێش بێت.

بەڵام "زائربروخ" پاش چەند وشەیەکی کورت، دەستی کرد بە قسەی ئاڵۆز و بابەتی بێ سەروبن و نەیجارەیان قسە و ئاخاوتنەکەی بە جۆرێك ئاڵۆز و بێ مانا بوو کە نەشتەرگەر و ئامادەبوان ئیدی باوەڕیان بە تێکچوون و فەرامۆشیی ئەو مامۆستایە کرد و بە ناچاری بۆ پشوودان رەوانەی نەخۆشخانەی شاری "ویسبادن"یان کرد. "برن دروف" هێندە لێکۆڵییەوە و کۆنجکۆڵیی کرد هەتا تێگەیشت کە "زائربروخ" لە نەخۆشخانەی "ویسبادن" دایە، بەڵام کاتێك سەردانی ئەو

نەخۆشخانەیەی کرد ڕێگایان نەدا بڕواتە ژوورەکەی "زائربروخ"ەوە. ئەو هەواڵنێرە لاوە بە بیانووی هێنانی خواردن و میوە و دەستەگوڵ بۆ نەخۆشانی هەژار و بێ سەرپەرست، خۆی گەیاندنە ناو نەخۆشخانەکە.

لە نەخۆشخانە گشتییەکان کەسێك کەلە دەرگای سەرەکییەوە ڕۆیشتایەتە ژوورەوە، ئیدی بۆ گەڕان بەناو نەخۆشخانەدا پێشی پێنەدەگیرا "برن دروف"یش بۆ دۆزینەوەی ئەو ژوورەی کە "زائربروخ"ی تێدابوو کەوتە پرس و جۆ و گەڕان و کاتێك لەبەردەم ژوورێکەوە ڕەت دەبوو کە دەرگاکەی نیوە کراوە بوو، پیاوێکی بەساڵاچووی چاویلکە لە چاوی بینی کەلە ژوورەکە لەسەر قەرەوێڵەیەك دانیشتووە و سەرقاڵی خوێندنەوەی شتێکە، لەبەر ئەوەی چەندین جار وێنەی "زائربروخ"ی لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکان بینیبوو ناسییەوە و ڕۆیشتە ژوورەوە بۆ لای.

"زائربروخ" دەستی لە خوێندنەوە هەڵگرت و پرسیاری کرد ئایا کارێکت بە من هایە؟ "برون دروف" خۆی ناساند و گوتی لەلایەن دامەزراوەی "کیندلر" هەلکەوتوو لە "مۆنیخ" هاتووە هەتا لەبارەی بڵاوکردنەوەی کتێبی بیرەوەرییەکانی لەگەڵی قسە بکات. "زائربروخ" گوتی تکایە کورسییەك بێنە و وەرە نزیکمەوە. ئەو لاوە کورسییەکی هێنا و لە قەرەوێڵەکەی "زائربروخ" نزیك بۆوە و لەسەری دانیشت و "زائربروخ" چاوی بڕییە دەستی چەپی "برن دروف" کە لەسەر قامکی ناوەڕاستی هەڵتۆقیوییەك دەبینرێ و بەبێ ئەوەی کە دەستی لێبدات، گوتی ئیزن بدەن ئەم لکە لەسەر قامکی چەپتان لاببەم.

"برن دروف" گوتی دامەزراوەی چاپەمەنیی "کیندلر" بەپەلەیە کە کتێبی بیرەوەرییەکانی ئێوە چاپ و بڵاو بکاتەوە و دوای ئەوەی کە بیرەوەرییەکانتان ئامادەی چاپ بوون، ئەگەر لوتف بکەن دێمە خزمەتتان کە نەشتەرگەری بۆ دەستم بکەن و ئێستا وەرگرتنی بیرەوەرییکانی ئێوە لەسەرووی هەموو شتێکەوەیە. بیرەوەرییەکانی ئێوە سەرەتا لە گۆڤاری "ئەدەبیاتی ئەڵمانیا" چاپ دەبێت و دواتر دامەزراوەی "کیندلر" وەکوو کتێب چاپ و بڵاوی دەکاتەوە، پاشان "برن دروف" بە "زائربروخ"ی گوت پاش ئەوەی کە بیرەوەرییەکان وەك کتێب بڵاو کرایەوە، لەوانەیە فیلم و وێنەشی لێ هەڵبگرنەوە و ئەگەر بێت و ئێوە هەموو مافێك لەبارەی بیرەوەرییەکانتان بدەنە دامەزراوەی "کیندلر" باشترە، چونکە لە داهاتوودا گرفت و ناستەنگ بۆ خەڵکی دیکە ساز ناکەن.

زائربروخ پرسی مەبەست لە هەموو حقووق چییە؟

"برن دروف" وەڵامی دایەوە یانی ماف و حقووقتان لەمەڕ چاپی بیرەوەرییەکانتان لە گۆڤاری

"ئـەدەبیاتی ئـەڵمانیا" و مـافی پێوەندیـدار بـە چـاپەکانی دواتـری کتێبەکـەتان و حقـووقی وێنەهەڵگرتن. "زائربروخ" ڕەزامەندیی نیشان دا کە هـەموو حقـووق و مـافێکی خـۆی لـەبارەی بیرەوەرییەکانی بسپێرێتە دامەزراوەی "موسیۆ کینلر" و "برن دروف"یش وتی:

بۆ ئەوەی کە بتوانم ڕەشنووسی گرێبەستەکە بنووسم و ئێوەش واژۆی بکەن و بفـەرموون چـەندە پارە و پاداشتتان بۆ چاپی گۆڤار و کتێب و وێنەگرتنی بیرەوەرییەکانتان دەوێت؟

"زائربروخ" وەك کەسێك کە سەرقاڵی لێکدانـەوەی حیـساب بێـت، خـەیاڵ بردییـەوە و "بـرن دروف" دیتی کە قامکەکانی خۆی رادەوەشێنێ و لەوە دەچوو کە خەریکە بە قامکەکانی حیـساب دەکات و پاشان وتی "بۆ چاپی کتێبی بیرەوەرییەکانم پێنج هەزار مـارك و هـەزار دانـە هێلکـە و سەد کیلۆ سێوم دەوێت"!! "برن دروف" بە بیستنی ئەو داخوازییە چـاوەڕوان نـەکراوە زۆر سـەری سوڕ ما، چونکە چاوەڕوانیی ئەوەی هەبوو کەسێکی وەك "زائربروخ" کە ناوبانگەکـەی گـەرەنتیی فرۆشتنی بیرەوەرییەکانیەتی، بۆ حقووقی سێ جۆر چـاپ کردنـی بیرەوەرییـەکانی، لانیکـەم داوای یەك میلیۆن فرانـك بکـات و بـە گومـانی ئـەوەی کـە بـە هەڵـە لێـی تێگەیـشتبێ، داوای لـە "زائربروخ" کرد کە دیسان بیڵێتەوە و ئوستادیش هەمیسان گوتی "بۆ حەقی چاپی بیرەوەرییـەکانم پێنج هەزار مارك پارە و هەزار دانە هێلکە و سەد کیلۆ گرەم سێوم دەوێت"!!.

"برن دروف" ئاگای لەوە نـەبوو کـە "زائربـروخ" بـیر و هۆشـی لـەجێی خـۆی نیـە و بـەهۆی فەرامۆشیی، هێشتا پێی وایە سەردەمی شەڕە کە هێلکە و سێو وەچـنگ ناکـەون. "بـرن دروف" ڕەشنووسی گرێبـەستەکەی نووسی و "زائربروخ"یش واژۆی کرد.

## دەسپێکی نەشتەرگەری لە ماڵەوە

دوای ئەوەی کە "زائربروخ" لـە نەخۆشـخانەی "ویـسبادن" هاتـە دەرەوە، گەڕایـەوە بـەرلین و دیسان نەخۆشەکان بۆ کاری پزیشکی سـەردانی ماڵـەوەیان دەکـرد. بـەڵام "زائربـروخ" لـە هـیچ نەخۆشخانەیەك کاری نەدەکرد هەتا بتوانێ کاری نەشتەرگەرییان بـۆ بکـات، بـەڵام رازی بـوو لـە ماڵەکەی خۆی ئەو کارە ئـەنجام بـدات. هەرکەسـێك تەنانـەت زانیارییـەکی ئەوتۆشـی لـە کـاری نەشـتەرگەری نـەبێت، دەزانێـت کـە لـەم دەورەیـەدا پێویـستییەکان بـۆ ئـەنجام دانـی کـارێکی نەشتەرگەری ئەوەیە کە نەخۆش تاقیکاری و وێنە و رادیۆلۆژیی بۆ بکرێـت و نەشـتەرگەر شـوێنی نەشتەرگەرییەکە لە وێنەدا ببینێ. "زائربروخ"یـش لـە مـاڵی خـۆی ئـەو کەلوپەلانـەی نـەبوو و ئەگەریش نەخۆشی بۆ وێنەگرتن رەوانەی دامەزراوەیەکی رایۆگرافی کردبا، بەدوور دەزانرا قبـوڵی بکات، چونکە پاش کـۆنگرەی پزیـشکیی "ویـسبادن" شـێتیی کـاتی و نەخۆشـیی فەرامۆشـیی "زائربروخ" لەلای پزیشك و نەشتەرگەرانی ئەڵمانیا ئاشکرا ببوو.

"زائربروخ" کە دەیهەویست لە ماڵی خۆی نەشتەرگەری بۆ نەخۆشەکان بکات، دەبوا کەلوپـەلی پزیشکی و نەشتەرگەری دابین بکات و بیهێنێتە ماڵەوە، بەڵام هیچ دەسمایەیکی نەبوو و ئەو رۆژەی کەلە نەخۆشخانەی "ویسبادن"ەوە گەڕایەوە ماڵ تەنیا سـێ مـارك پـارەی بـە مـاڵ هـەبوو. ئـەو پزیشکە کە دەیهەویست لـە ماڵەکـەی خـۆی کـاری نەشـتەرگەری بکـات، بێجگەلـە کەلوپـەلی نەشتەرگەری، پێویستی بە کەلوپەلی رادیۆلۆژی و هەروەها کەلوپەلی خوێن دان بە نەخۆش و بتڵی ئۆکسیژن هەبوو.

ئەو نە دەیتوانی خۆی ئەو کەلوپەلە نەشتەرگەرییانە بکڕێت و نەلە خەڵکانی دیکەش بـۆ دابـین کردنیان داوای یارمەتیی دەکرد، چونکە زات و خۆخدەی ئیزنی ئەوەیان پێنـەدەدا داوای یارمـەتی لە خەڵکانی دیکە بکات.

"زائربروخ" سەرەڕای ئەوەی کەلە رێگای نەشتەرگەرییەوە پارەیەکی زۆری بەدەسـتهێنا، بـەڵام هیچکات لەو بیری ئەوەدا نەبوو کە لەباری ماڵییەوە داهـاتووی ژیـانی خـۆی مـسۆگەر بکـات و زۆربەی بیرمەندان بۆ وێنە "ئەنشتەین" بیرمەندی گەورەی بـواری بیرکـاریش وەکـوو "زائربـروخ" وابوو. ئەنشتەین لە هەموو تەمەنیدا مامۆستای زانستگا بوو و هەروەها لە بواری فیزیادا خەڵانی

زانستیی نۆبلی جیهانیی بەدەستهێنا و کتێبەکانی بە هەموو زمانە زیندووەکانی دنیا وەرگێڕدران، بەڵام کاتێك لە تەمەنی ٧٦ساڵیدا لە ساڵی ١٩٥٥ی زایینی کۆچی دوایی کرد، بێجگەلە جلوبەرگەکانی و چەند کتێبێك هیچی دیکەی نەبوو. دوایین وتەشی کە چەند ساتێك بەرلە مردنی بەزاریدا هات کەس لێی تێنەگەیشت، چونکە بێجگەلە پەرستارێك کەس لەلای نەبوو و ئەو ژنە ئەمریکاییەش زمانی ئەڵمانیی نەدەزانی و ئەنشتەیش چەند ساتێك بەرلە مردنی بە زمانی ئەڵمانی کە زمانی دایکیی خۆی بوو قسەی دەکرد.

"زائربروخ" لە دەورانی کار کردنیدا بەبێ ئەوەی کە حەزی لە کۆکردنەوەی پارە و سامان بێت، زۆر پارەی بەدەستهێنا، بەڵام وەریدەگرت لەدەستی دەدا و ئەو رۆژەی کەلە ئەخۆشخانە گشتییەکان وەدەریان نا، ئەوەندەی داهات و پاشەکەوت نەبوو کە کەلوپەلە پێویستییە سەرەتاییەکانی نەشتەرگەریی پێ بکڕێت هەتا بتوانێ لە ماڵەوە نەشتەرگەری بکات.

هەربۆیە "زائربروخ" بڕیاری دا بەبێ کەلوپەل لە ماڵەکەی خۆی دەست بکات بە نەشتەرگەری، چونکە لە زانستی جەستەناسیدا لەسەرووی هەموو نەشتەرگەرانی دنیاوە بوو و کەسێك نەبوو کە جەستە هەناوی مرۆڤ وەکوو ئەو بناسێت. لەشی مرۆڤ لەبارەی زانستی پزیشکی و نەشتەرگەرییەوە بە پانایی کاکێشانێکە و دەیان هەزار ئێسك و ماسولکە و دەماری تێدایە کە نەشتەرگەر پێویستە هەموویان بە باشی بناسێ و لەبارەی ئەرکی هەرکامیانەوە بە باشی زانیاریی هەبێت.

تەمەنێك بەس نیە بۆ ئەوەی کە مرۆڤ لە زانستی لەش و ناسینی تەواوی جەستەدا ببێتە مامۆستا و شارەزا، مەگەر ئەوەی کە وەکوو "زائربروخ" بۆ فێربوون، توانایی و لێهاتوویی تایبەتیی هەبێت. ئەوەی کەلە کتێبە زانستییەکانی جەستەدا نووسرابوون، بە کردەوە ئەنجامی دابوو و لە کتێبی ئەنسکلۆپیدیای جەستەی ئەڵمانیدا کە دوایین چاپی بەرلە شەڕی دووەمی جیهانی بڵاو کرایەوە کە کتێبێکە نزیك بە سەد بەرگ و وشەیەکی تێدا نەبوو کە "زائربروخ" نەیزانێ و واتای کردەیی ئەو وشەیەی لە کاری نەشتەرگەریدا فام نەکردبێ. ئەو نەشتەرگەرە بلیمەتە متمانەی بە زانایی و شارەزایی خۆی هەبوو، بۆیە بڕیاری دا وەکوو نەشتەرگەرانی پێشوو، بەبێ کەلوپەلی نەشتەرگەریی نوێی ئەمڕۆ، لە ماڵەکەی خۆی کاری نەشتەرگەری بۆ نەخۆشەکان بکات.

یاریدەدەرانی "زائربروخ" بۆ کاری نەشتەرگەری لە ماڵەوە دوو کەس بوون یەکیان ژنەکەی بەناوی "مارگۆ" کە تازە لە سەفەری سەردانی خزم و کەسەکانی گەڕابۆوە و ئەوی دیکەشیان خزمەتکارەکەیان هەروەك گوتمان ناوی "ئان یس" بوو. قەرەوێڵەی نەشتەرگەرییەکەش

قەردوێڵەیەك بوو کە هەندێ جار لە مەتبەخیش ژنەکان بەکاریان دەهێنا و هەندێ جاریش دەیانبردە ئەنبارەکە. "زائربروخ" چونکە پێشتر لە نەخۆشخانە گشتییەکان کە بە بوودجەی دەوڵەت یان شارەوانی بەڕێوە دەچوون، کاری دەکرد لەو نەخۆشانەی کە کاری نەشتەرگەریی بۆ دەکردن، پارەی وەرنەدەگرت.

بەڵام لە سێ تاقم لە نەخۆشەکان پارەی وەردەگرت: یەکەم لە پاشا و سەرکۆمار و کەسایەتییە سیاسییە پلە یەکەکان. دووەم لە سامانداره‌کان کە دەیانەویست لەلایەن "زائربروخ"ەوە لە نەخۆشخانە تایبەتییەکان نەشتەرگەرییان بۆ بکرێت.

سێیەم لەو نەخۆشخانەی کەلە وڵاتانی دیکەوە سەردانی ئەڵمانیا و "زائربروخ"یان دەکرد. بەڵام ئەوکاتەی کە دەیەویست لە ماڵی خۆی نەشتەرگەری بۆ نەخۆشەکان بکات، ناچار بوو کەلە هەموان پارە وەربگرێت، چونکە شوێنێکی دیکەی بۆ دابین کردنی بژێوی ژیانی نەبوو. بەڵام زۆر بیانووی لە نەخۆشەکان نەدەرگت و هەرچەندەیان بدایەت قەناعەتی پێدەهێنا. پاش چەند رۆژ کە "زائربروخ" لە ماڵەکەی دەستی بە کاری نەشتەرگەری کرد، ژنە پەرستارێك کە پێشتر لەبەردەستیدا کاری کردبوو، زیاتر لەڕووی ئەمەگناسییەوە سەردانی ماڵەکەی دەکرد و بۆ بێهۆش کردنی نەخۆشەکان و هەندێ کاری دیکەی پزیشکی یارمەتیی دەدا و شەوانە دەگەڕایەوە ماڵەکەی خۆی.

## بەڕێوەبردنی دوو دەورە نەشتەرگەری لە ماڵ

قۆناغی کاری نەشتەرگەریی "زانربروخ" لـە ماڵـەوە بەسـەر دەورەدا دابـەش دەبێـت. دەورەی یەکەم تەنیا نەشتەرگەریی بۆ ئەو نەخۆشانە دەکرد کە بە شێوەی ئاسایی و سەرپێی مەعلیجـەیان بکات، چونکە لە ماڵەوە کەلوپەلی خەواندن و هێشتنەوەی نەخۆشی نەبوو. لـەو دەورەیـەدا هـیچ ڕووداوێکی ناخۆش لە ماڵی ئوستاد ڕووی نەدا و هەموو ئـەو کەسـانەی کـە نەشـتەرگەرییان بـۆ دەکرا، چاك دەبوونەوە و ئەگەر "زانربـروخ" بـەو شـێوەیە درێـژەی بـە کـارکردن بدایـە، تووشـی بەرەنجامی خراپی شێتیی کاتی و فەرامۆشی نەدەبوو.

بەڵام لە دەورەی دووەمدا "زانربروخ" بڕیاری دا نەشـتەرگەری بـۆ کەسـانێك بکـات کـە پـاش نەشتەرگەری پێویستییان بە خەواندن و بەستەری کردن هەبوو. ئێستا دەزانین هۆکاری ئـەوەی کـە "زانربروخ" بڕیاری دا لە ماڵەوە نەشتەرگەریی گەورە ئەنجام بدات، پێویستیی مادی نەبوو، چونکە پاش ئەوەی کە کاری پزیشکیی سەرپێی لە ماڵەوە دەست پێکرد، داهاتی باش بوو کە وەڵامـدەری ژیانی ئاسایی ئەو بوو و دامەزراوەی چاپەمەنیی "کیندلر"یش پێنج هەزار مارکی بابـەتی مـافی چاپی کتێبی بیرەوەرییەکانی بە حەواڵەیەکی بانکی پێیدا بەبێ ئەوەی کە "زانربروخ" تەنانەت یەك دێڕ لە بیرەوەرییەکانیشی نووسیبێت.

ئەگەر بپرسن کە "زانربروخ" بە چ لەونێ دەیهەویست بەبێ هـیچ کەلوپـەلێکی پزیـشکی لـەو دەورەیەدا، لە ماڵەکەی خۆی کاری نەشتەرگەریی گەورە بکات، دەبێ بڵێین کە شێوازی کاری ئـەو لەگەڵ شێوازی کاری نەشتەرگەریی پزیشکانی سێسەد یان چوارسەد ساڵ بەرلە ئێستا جیاوازییەکی نەبوو، ئەو بەرلە دەسـپێکی کـار دەسـتەوانەی لەدەسـت نـەدەکرد و کەلوپەلـە پزیـشکیەکان لـە ماڵەکەی بە باشی "دژە میکروب" نەدەکران.

چونکە ئەو ژنە پەرستارەی کە ڕۆژانە دەهاتە ماڵ "زانربروخ" و لە کارکەیدا یارمەتیی دەکـرد، دەرفەتی ئەوەی نەبوو کە دوای کاری نەشتەرگەری کەلوپەلەکان بە جوانی دژە میکـرۆب بکـات و بیانشوات، بۆیە ئەو کارە لەلایەن "مـارگۆ" هاوسـەری "زانربـروخ" یـان خزمەتکارەکـەی "ئـان پس"ەوە ئەنجام دەدرا و ئـەوانیش لەبـەر ئـەوەی هـیچ سـەریان لـە کاروبـاری تەندروسـتی و دژە میکروب کردنی کەلوپەلەکانی نەشتەرگەری دەرنەدەهێنا، نەیاندەزانی چۆن چـۆنی کەلوپەلـەکانی کارکردن "گەنبـەری" (میکروبکـوژی) بکـەن هـەتا ئـەوەی کـە لەسـەر کەلوپەلـەکان میکـرۆب

نەمێنێتەوە و "زائربروخ"یش بەهۆی بیرکورتی و فەرامۆشییەوە پێی نەدەگوتن کە هەندێ میکرۆب و وایرۆسەکان، بە گەرما و هەڵمی ناوەکوڵ کە پلەی گەرماکەی لە سەد دایە لەناو ناچن و بۆ نابوودکردنیان دەبێ پلەی گەرمای زیاتر بەکار بهێنرێ و ئەو پلە گەرمایە لە رێگای ئاوەکوڵەوە کە لەناو قازان یان دەفرێکی گەورەدا دەکوڵێ بەدەست نایەت. لە نەخۆشخانەکان شوێنگەلێکی سەرداپۆشراو هەن بەناوی (اتو کلاو) کە لەناویدا گەرما و هەڵمی ئاوەکوڵ وەکوو گەرمای "لوکوموتیۆ"، بەهۆی گوشار و پەستانی هەڵمەوە زیاد دەبێت و گەرماکە دەڕواتە سەرووی لەسەدا پلەی گەرمی و دەگاتە سەد و پەنجا هەتا دووسەد پلە و هیچ جۆرە میکرۆب و وایرۆسێك لەناو ئەو پلە گەرمایەدا نامێنێ و هەموان دەفەوتێن و کەلوپەلە نەشتەرگەرییەکان پاش شۆردن و لابردنی هەرچەشنە ئاسەوارێکی خوێن و خڵت و پیسایی دەیخەنە ناو "اتو کلاو"ەوە.

ئەمڕۆ جۆرێك لە "اوتو کلاو"گەلی کارەبایی بەبێ هەڵمی ئاوەکوڵ، بەکار دەهێنرێن کە لەناو ئەو سەرداپۆشراوەدا "اوتو کلاو" وەکوو کوورەیەکی کارەبایی بە گەرمای کارەباوە گەرم دادێت و پلەکەی لە چوارسەد پلەی سەدیش تێدەپەڕێ و کاتێك کەلوپەلەکانی نەشتەرگەری پاش شۆردن دەیخەنە ناو پارێزەکەوە و دواتر کارەباکەی لێ وەسڵ دەکەن و پاش چەند خولەك بەڵکوو کەمتریش، هەموو کەلوپەلەکانی نەشتەرگەری بەتەواوەتی دژە میکرۆب دەکرێن. وایرۆسی نەخۆشیی یەرەقان (زەردوویی) لە پلە گەرمای ئاوەکوڵدا لەناو دەچێت و ئەگەر بێت و "ئەنژکسیۆن"ێك لە نەخۆشێکی زەردوویی بدەن و پاشان بیخەنە ناو ئاوەکوڵەوە و بۆ ماوەی کاتژمێرێك بێنێتەوە، هێشتا وایرۆسی نەخۆشیی زەردوویی لەبەین ناچێت و ئەگەر هەر هەمان دەرزی لە کەسێکی دیکە بدەن، لەوانەیە تووشی نەخۆشیی زەردوویی بێت و دەرزیی ئەنژکسیۆن لە کەسێك کە تووشی نەخۆشیی زەردوویی بووە، دراوە، دەبێ بێ ئەملا و ئەولا بخرێتە ناو پارێزەکێکی "اوتو کلاو"ەوە هەتا وایرۆسی ئەو نەخۆشییە بە گەرمای زۆر لەناو بچێت. یان لە رێگای ئەو سورەنگە هەرزانانەی کەلە هەموو دەرمانخانەکان دەفرۆشرێن و پتر لە یەك جار بەکار ناهێنرێن، کەڵکی لێ وەربگیردرێ.

یەکەم نەخۆش کەلە ماڵی "زائربروخ" نەشتەرگەریی قورسی بۆ کرا، ژنێکی کەڵەگەت بوو کەلە پووزی هەردوو لاقیدا نەخۆشیی واریس (شینەدەمار) دەرهاتبوو. هەموان دەزانن کە شینەدەمار نەخۆشییەکە کە بەهۆی کێشهاتنی رەشەدەمار (ئەو رەگەی خوێن دەگەڕێنێتەوە بۆ دڵ) لە لەش و بەتایبەت لە پووزی پا سەرهەڵدەدات. ئەگەر کێش هاتنی رەشەدەمار کاتێك سەرهەڵبدات کە ژانەکەی پتر لە چەند خولەك نەکێشێ، لە پووزی پا دەردێت و هەندێ کەس ژانی ئەو نەخۆشییە

لەگەڵ ئازاری ماسولکەکانی پووزی پایان لێ تێکدەچێ، لە هەر حاڵەتێکدا ژانەکە پاش چەند خولەك نامێنێ.

بەڵام ئەگەر خاوبوونەوە یان هەراوبوونی رەشەدەمار لە پووزی لاقدا هەمیشەیی بێ، ژانەکە دەمێنێتەوە و بە دەرمانیش ناکرێ ئەو ژانەی کە لەناو رەشەدەماردا بڵاو بۆتەوە، سارێژ ببێت و هەتا سەردەمی "زائربروخ" دەوایەك بۆ سارێژی واریس نەبوو و نەخۆشیی شینەدەماریان بە زاراوەی پزیشك و نەشتەرگەرەکان (کوتە ریزە) یانی دەیانسووتاند. لە نەخۆشخانەکان ئامێرێك هەیە بەناوی "کوتەریزاتۆر" (سووتێنەر) و ئەم ناوە پزیکشیە لە ریشەی وشەی یۆنانی (کوتەریۆن) کە مانای سووتان دەدات، وەرگیراوە. لە رێگای ئامێری سووتێنەرەوە واریس لە پووز و لاقدا دەسووتێنن و بەو شێوەیە نەخۆشییەکە نامێنێ و ئامێری سووتێنەریش بەگشتی دوو جۆرن، یەکیان دەزگایەك کەلە رێگای مادەی کیمیایی شانەکانی جەستە دەسووتێنن و ئەوی دیکە ئامێرێکە کەلە رێگای گەرماوە، ئەو شانانەی کە دەبێ بسووتێنرێن لەناو دەچن. ئەگەر بیانەوێ شانەکانی سەرووی لەش بە سووتاندن لەناو بەرن، سووتێنەرێك بەکار دێنن کە مادەی کیمیایی تێدایە.

بەڵام ئەگەر بیانەوێ ئەو شانانەی کەلە قووڵایی جەستەدان بسووتێنن و دەبێ زیاتر و قووڵتر جەستە بسووتێنرێ، سووتێنەرێك بەکار دەهێنن کە بە گەرما دەیسووتێنێ، لە هەر حاڵەتێکدا بۆ ئەو کارە پزیشکیە مادەی بێهۆشی و بێ هەست کردن بەکار دەهێنن. "زائربروخ" لە ماڵەکەی خۆی ئامێری کوتەریزاتۆر (سووتێنەر)ی نەبوو هەتا واریسی ئەو ژنە ئەڵمانیە بسووتێنێ، بۆیە بڕیاری دا بە پارچە ئاسنێك کە لەناو ئاگردا داخ کراوە ئەو نەشتەرگەرییە ئەنجام بدات.

ئەو رۆژە، شێواز و ئامێری کاری "زائربروخ" لەگەڵ هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ شێوە و کەلوپەلی کاریی نەشتەرگەرێکدا نەبوو کە هەزار ساڵ لەمەوپێش دەیەویست لك و دومەڵێك بەبێ بێهۆشی و بێهەست کردن بسووتێنێ. "زائربروخ"یش بەبێ بەکارهێنانی مادەی بێهەست کردن لە شوێنی برینەکە دەستی کرد بە سووتانی واریسی لاقی ئەو ژنە. دیارە ئەگەر کەسێك بەبێ بێهەست کردن و بە ئاسنی سوورەوە کراوە بسووتێنن، تووشی چ ژانێکی قووڵ دەبێت و ئەو رۆژە ئەو ژنە بە جۆرێك هاواری دەکرد و دەیقیژاند دەڵێی پارچە پارچەیان کردووە.

سەردەمانی پێشوو، ئازار و ژانی کاری نەشتەرگەری ئەوەندە ئەستەم بوو کە نەشتەرگەر بەرلە دەستبەکار بوون بە یارمەتیی یاریدەدەرەکانی دەست و لاقی نەخۆشی دەبەست هەتا هەڵنەیەت و بە دەستەکانی پێش بە ئەنجامدانی کارەکە نەگرێت. بەهەرحاڵ دوای ئەوەی کە "زائربروخ" کاری

بەناو نەشتەرگەریی تەواو کرد و برینەکانی بەست بە هاوسەرەکەی گوت ئەم ژنە ناتوانێ لێرەوە بڕواتەوە ماڵی خۆی، بۆیە دەبێ لێرە بمێنێتەوە هەتا برینی لاقەکانی چاك ببنەوە و ئەگەر ئێستا بەم ئازارەوە بڕواتەوە ماڵەکەی خۆی هەردوو لاقی تووشی نەخۆشیی کوتران و ڕەشبوونەوە (قانقاریا) دەبێت.

"مارگۆ" هاوسەری "زائربروخ" پرسیاری کرد دەبێ چ بکەین؟

ئوستاد گوتی بیبە لەسەر قەرەویلەکەی خۆت بیخەوێنە. پاشان ژنەکەی "زائربروخ" بە یارمەتیی خزمەتکارەکەیان "ئان یس" ئەو ژنە نەخۆشەیان لەسەر قەرەویلەکە خەواند. بەڵام دانانی نەخۆشێك لەسەر قەرەویلە بۆ پەرەستاری کردنی بەس نیە، بەلکوو دەبێ خۆراك و خواردنی پێ بدرێت و کەلوپەلی پاك و خاوێنیی بۆ دابین بکرێت و شەوان ئاگات لە حاڵ و وەزعی بێت.

هەروەك گوتمان ئەو ژنە پەرستارە شەوانە دەڕۆیشتەوە ماڵی خۆی و "ئان یس"یش ڕۆژان بەهۆی کاری قورسی ماڵەوە ئەوەندە ماندوو دەبوو کە نەیدەتوانی بۆ پەرستاری لە نەخۆش، تەواوی شەو بەخەبەر بێت، بۆیە پەرستاری کردن لە نەخۆش کەوتە ئەستۆی هاوسەری "زائربروخ" و ئەو ژنە نەخۆشە ئەوەندە سکاڵا و ئیزهاری ناڕەحەتیی کرد کە "زائربروخ" ناچار بوو ڕۆژی سێیەم ڕەوانەی ماڵی خۆی بکاتەوە. هەمان ڕۆژ کە نەخۆشەکەیان ناردەوە ماڵی خۆی "برن دروف" لەلایەن دامەزراوەی چاپەمەنییەوە هات هەتا بیرەوەرییەکانی ئەو پزیشکە بلیمەتە بنووسێتەوە. ئوستاد بە میهرەبانی و خۆشڕوییەوە پێشوازیی لێکرد و "برن دروف" گوتی هەرچەند بەڕێزتان نەشتەرگەرێکی بلیمەتن، بەڵام بیرەوەرییەکانتان بۆ کەسانێك دەنووسنەوە کە خەڵکی ئاسایین و هیچ لە پزیشکی و نەشتەرگەری نازانن و چاوەڕوانیی ئەوەیان هەیە لە دووتوێی بیرەوەرییەکانتاندا بابەتگەلێك بخوێننەوە کە بەلایانەوە سەرنجڕاکێش بێت.

"زائربروخ" پرسیاری کرد ئایا ئێوە باوەڕتان بەوەیە کە من نابێ بیرەوەرییەکانی خۆم سەبارەت بە کاری نەشتەرگەری بگێڕمەوە؟

"برن دروف" ڕایگەیاند ناوەڕۆکی سەرەکیی بیرەوەرییەکانتان لەبارەی کاری نەشتەرگەرییەوەیە، بەڵام لە هەمان حاڵدا ئەو برەوەرییانە هەڵگری بابەتی پێوەندیدار بە نەشتەرگەرین، دەبێ بۆ خوێنەرانی ئاساییش سەرنجڕاکێش بێت. "زائربروخ" پرسیاری کرد ئایا ئێوە ڕازین کە من بیرەوەرییەکانی خۆم لە سەردەمی منالییەوە بگێڕمەوە؟

"برن دروف" گوتی ئەگەر بێت و بیرەوەرییەکانتان لە سەردەمی منالییەوە بگێڕنەوە بەرای من لەلای خوێنەران زۆر سەرنجڕاکێش دەبێت. "زائربروخ" کە پیاوێکی ڕاستگۆ بوو بەبێ کەموکووڕی

و زێدەڕۆیی دەستی کرد بە گێڕانەوەی بیرەوەریی سەردەمی منداڵیی خۆی و گوتی باوکی پیاوێکی هەژار بووە و بە پینەچی کردن بژیوی ژیانی بنەماڵەکەی دابین دەکرد و دوای ئەوەی کۆچی دوایی کرد، دایکیشی بە درێژەدان بەو کارە، دابین کردنی بژیوی ژیانی بنەماڵەکەی گرتە ئەستۆ و لەوانەیە لە مێژووی ئەو وڵاتەدا تاقە ژنێك بوویێت کە پینەچییەتی کردبێت و بە چاکردنی کەوشی خەڵك منداڵەکانی بەخێو کردووە.

"برن دروف" ئەو جۆرە گێڕانەوەیەی بیرەوەرییەکانی "زائربروخ"ی زۆر پەسەند کرد و گوتی زۆرینەی خەڵك، پێیان خۆشە لەکاتی خوێندنەوەی بیرەوەریی پیاوان و ژنانی گەورەدا بزانن ئەوان لە سەردەمی منداڵی و دەسپێکی مێرمنداڵیدا چۆن چۆنی بە هەژاری و دەستەنگییەوە ژیاون، ئەو بیرەوەرییە وەکوو ئەوە وایە کە بیرەوەریی دەورانی منداڵی و مێرمنداڵیی خۆیان وەبیر بێتەوە. لایەنێکی دیکەش ئەوەیە کاتێك خەڵك سەربوردەی ژیانی ژنان و پیاوانی گەورە دەخوێننەوە کەلە بنەماڵەیەکی دەستەنگ و هەژار بە دنیا هاتوون و سەرەڕای ئەوەی کەلە ئەوە و تۆرەمەیەکی ناسراو نەبوون، بەڵام بەو بێ ڕیشەییە شەرمەزار نابن و لەوانەیە لە ناخیشەوە شانازی بە خۆیانەوە بکەن کە وەکوو کۆمەڵێك لە کەسایەتییە گەورەکانی جیهان بێ ئەسڵ و نەسەب و نەناسراو بوون و لە بنەماڵەیەکی هەژار لەدایك بوون.

ئەو ڕۆژە "زائربروخ" هێندە لەبارەی سەردەمیی منداڵیی خۆیەوە قسەی کرد کە دوو بەشی کتێبی بیرەوەرییەکانی پڕ کردەوە و "برن دروف" گوتی ئەگەر ئێوە هەر بەم شێوەیە و بە ڕێکوپێکی بیرەوەرییەکانتان بگێڕنەوە، کتێبی بیرەوەرییەکانتان پێش ئەو ڕێکەوتەی کە پێشبینیمان کردووە بۆ چاپ ئامادە دەبێت. چونکە کاری ئەو گەنجە نوسەر و ڕۆژنامەنووسە تەواو ببوو، ویستی بڕوات، بەڵام "زائربروخ" ئاماژەی بە چەند بەرگ کتێبی بەقەبارە کرد کە لەسەر مێزەکە بوو و گوتی ئەم کتێبانە بووە و بیانخوێنەوە. "برن دروف" گوتی من دەرفەتی خوێندنەوەی کتێبم نیە و ئەوەی کە نووسیومە دەبێ شەو هەمیسان بینووسمەوە و بەیانی هەمیسان دێمەوە و کۆمەڵێکی دیکە توندنووسی دەکەم و دەبێ دیسان شەوان لە نوێوە بینانووسمەوە.

"زائربروخ" یەکێك لە کتێبەکانی هەڵبژارد و لەبەردەم گەنجەکەی دانا و گوتی دەبێ بێ ئەملا و ئەولا ئەم کتێبە کە لەبارەی نەشتەرگەرییەوەیە بیخوێنیتەوە، چونکە ئێوە سەربوردەی ژیانی من دەنووسیتەوە کە نەشتەرگەرم، دەبێ لانیکەم ئاگاداری زانستی نەشتەرگەری بن. "برن دروف" بەهۆی پێداگریی "زائربروخ" ناچار بوو کتێبەکە لەگەڵ خۆی ببات و بەرلەوەی لە دەرکەکە وەدەرکەوێت "زائربروخ" وتی بۆ ئەوەی خاترجەم بم کە ئێوە کتێبەکەتان خوێندۆتەوە دواتر لەبارەی

هەندێ بەش لە کتێبەکەوە پرسیارتان لێدەکەم. ئەو ڕۆژنامەنووسە گەنجە ڕۆیشت کە ڕۆژی دیکە هەمیسان بێتەوە، ڕۆژی دواتر کە گەڕایەوە ماڵەکەی پێیان گوت کە ئوستاد لە ژووری نەشتەرگەرییە.

"برن دروف" ڕۆیشتە ژووری چاوەڕوانییەوە و دیتی چەند نەخۆشێك لەوێ چاوەڕێن هەتا لەلایەن "زائربروخ"ەوە نەشتەرگەرییان بۆ بکرێت. هەمان ڕۆژ "زائربروخ" نەشتەرگەریی بۆ دەستی پیاوێك کرد کە لەگەڵ هاوسەرەکەی هاتبوو و دواتر ڕەوانەی ماڵی خۆیانی کرد. هەمان ڕۆژ نەشتەرگەریی ئاپاندیسی بۆ نەخۆشێك ئەنجام دا، لەبەر ئەوەی نەدەکرا نەخۆشەکە بنێرێتەوە ماڵێ، بە "مارگۆ"ی هاوسەری گوت کە بیبات و لەسەر قەرەوێڵەکە بیخەوێنێ. "برن دروف" بۆ ماوەی یەك کاتژمێر لەو ژوورە چاوەڕێ مایەوە هەتا "زائربروخ" دەستی بەتاڵ بێت و درێژەی بیرەوەرییەکانی بۆ بگێڕێتەوە.

بەڵام زۆریی ئەو نەخۆشانەی کە لەو ژوورە چاوەڕێی دەرمان بوون، ئەو گەنجە ڕۆژنامەنووسەیان تێگەیاند کە ئەو ڕۆژە "زائربروخ" پێی ناکرێ بیرەوەرییەکانی بۆی بگێڕێتەوە و بە "ئان یس" ی خزمەتکاری گوت لەلایەن منەوە بە ئوستاد بڵێ من بۆ درێژەی کارەکەمان بەیانی دێمەوە. "زائربروخ" ئەو ڕۆژە هەتا کاتژمێر ٤ی پاش نیوەڕۆ درێژەی بەکار دا و پاشان پشووی دا.

شەو تەلەفۆنێك بۆ ماڵی "زائربروخ" کرا و ژنەکەی وەڵامی دایەوە و دەنگی ژنێکی گوێ لێبوو و وتی من ئەو کەسەم کە ئەمڕۆ لەگەڵ مێردەکەم هاتینە ماڵتان و پرۆفیسۆ "زائربروخ" نەشتەرگەریی بۆ دەستی مێردەکەم کردووە، بەڵام ئێستا مێردەکەم تووشی تایەکی زۆر بووە، تکایە بە پرۆفیسۆر بڵێن سەردانێکی بکات و چاوی پێ بکەوێ.

"مارگۆ" وەڵامی دایەوە کە پرۆفیسۆ خەوتووە، بەڵام خەبەری دەکەمەوە و پەیامەکەتانی پێڕادەگەیەنم. "مارگۆ" مێردەکەی لەخەو هەستاند و مەسەلەکەی بۆ باس کرد و "زائربروخ" گوتی بەم کاتی نیوەشەوەدا، هیچ نەشتەرگەرێك ناڕواتە سەردانی نەخۆش. ژنەکەی وتی بەڵام ئەم نەخۆشە کەسێکە کە ئەمڕۆ تۆ نەشتەرگەریت بۆ دەستی کردووە. "زائربروخ" بە توورەییەوە وتی هەرچیت پێدەڵێم وابکە و بەو ژنە بڵێ پێوەندی بە پزیشکی تایبەتیی بنەماڵەی خۆیانەوە بکات. "مارگۆ" بە ناچاری وەڵامی مێردەکەی بەو ژنە گەیاند. سەرلەبەیانیی ڕۆژی دواتر دوای ئەوەی کە "مارگۆ" لە خەو هەستا و سەردانی نەخۆشی ئاپاندیسی کرد (ئەو نەخۆشەی کە زائربروخ نەشتەرگەریی ئاپاندیسی بۆ کردبوو) دیتی کە تایەکی زۆر هەیە.

"زائربروخ" لە خەو هەستا و سەرقاڵی ریش تاشین بوو. "مارگۆ" پێی گوت "فێردیناند" ئەو

نەخۆشەی کە دوێنێ نەشتەرگەریی ئاپاندیست بۆی کردووە، تایەکی زۆری هەیە و برۆ و سەردانێکی بکە. "زائربروخ" گوتی هەموو نەخۆشەکان یاو دەکەن و دواتر چاك دەبنەوە. "زائربروخ" پاش تاشینی ریشی وەك هەمیشە رۆیشتە حەمام و دواتر نانی و چای چاشتی خوارد و دوای خواردنی ناشتا دیسان "مارگۆ" بە مێردەکەی گوت یاوی ئەو نەخۆشە زۆرە، تکایە برۆ سەردانێکی بکە، هەرچەند من پزیشك نیم، بەڵام دەزانم نەخۆش پاش نەشتەرگەریی ئاپاندیست نابێ بەو جۆرە تووشی تای زۆر ببێت.

بەڵام دیسان "زائربروخ" گوێی بە قسەکانی "مارگۆ" نەدا و چەند خولەکێکی دیکە "برن دروف" هات و پاش سڵاو بە ئوستادی گوت هیوادارم ئەمڕۆش وەکوو پێرێ بتوانین بە باشی کار بکەین.

"زائربروخ" پرسیاری کرد چ کارێك بکەین؟

"برن دروف" کە لەو وەڵامە چاوەڕوان نەکراوە سەری سوڕمابوو، وتی مەگەر بڕیار نەبوو ئێوە بیرەوەرییەکانی خۆتان بگێڕنەوە و منیش بیاننووسمەوە؟

"زائربروخ" وتی ئێمە چ کاتێ بڕیارێکی وامان داوە؟

"برن دروف" بە سەرسوڕمانەوە لە چاوەکانی ئوستادی روانی و چاوەڕوانیی ئەوەی هەبوو کەلە چاوەکانیا نیشانەیەك لە تێکچوونی باری زەین و هۆش ببینێت.

بەڵام چاوەکانی "زائربروخ" لە پشتی چاویلکەوە، ساف و درەوشاوە دەهاتنە بەرچاو.

"مارگۆ" کە پێشبینی دەکرد هەتا چەند ساتی دیکە لە نێوان مێردەکەی و ئەو گەنجەدا دەمەقاڵە و مشتومڕێکی توند ساز دەبێت بەسەر ئاماژەی بە "برن دروف" کرد کەلە ژوورەکە بڕواتە دەرێ و پێی گوت ئەمڕۆ پرۆفیسۆر باری تەندروستی و رەوشی لەبار نیە و ئێوە بۆ کارکردن پێداگری مەکەن، تکایە بڕۆن و بەیانی وەرنەوە.

"برن دروف" رۆیشت و "مارگۆ" لای نیوەڕۆ جارێکی تر پلەی تای نەخۆشەکەی گرت و بە سارساممییەوە تێگەی کە ئەندازەی تاکەی گەیشتۆتە چل پلە. گوتمان "مارگۆ" پزیشك نەبوو، بەڵام بەو هۆیەی کە هاوسەری نەشتەرگەرێك بوو و زۆر شتی لەوەوە دەبیست و هەندێ جاریش چاوی لە گۆڤارە پزیشکییان دەکرد، دەیزانی پاش نەشتەرگەری ئاپاندیس نەخۆش نابێ تووشی تا ببێت و ئەگەر هات و یاوی کرد، ئەگەری هەیە تووشی نەخۆشیی "پری تونیت" بووبێت.

ناوی ئەم نەخۆشییە لە وشەی "پری توان"ەوە وەرگیراوە کەلە بنەڕەتدا وشەیەکی یۆنانیە و بۆتە زاراوەیەکی پزیشکی و لە بنەڕەتدا ریشە یۆنانییەکەی "پری تونایۆن"ە یانی شتێك کە هەموو

دادەپۆشێ. "پری توان" لە فەرشێك دەچێت کە بە کاملی دیواری زگی داپۆشیوە و هەمیشە خاوێن و بەدەرلە هەر جۆرە میکرۆبێك، هەربۆیە فەزایەی ناوەوەی زگ بەگشتی بەدەرە لە میکرۆب. "فەزای ناوەوەی زگ نابێ لەگەڵ فەزای ناوەوەی گەدە و ریخۆڵەکان و ئەو ئەندامانەی کە لەناو زگدان تیکەڵ بن و پێوەندییان هەبێت".

لەناو ریخۆڵەکاندا، بە بەردەوامی هەر جۆرە میکرۆبێك هەیە، بەڵام لە فەزای زگدا کە گەدە و ریخۆڵە و ئەندامانی دیکەی تێدایە، میکرۆبێك نابینرێ. کاتێك نەشتەرگەری بۆ نەخۆشیی ئاپاندیست دەکرێت، ئەگەر بێت و "ریخۆڵە رەشە" بەبۆنەی گەنین و بۆگەنی خۆیەوە بتەقێت و مادەکانی ناوەوەی برژێتە سەر "پری توان" یان ئەوەی کەلە کاتی نەشتەرگەریی ئاپاندیست یان هەر نەشتەرگەرییەکی دیکە لە زگ، بەهۆی کەمتەرخەمی "پری توان" بە میکرۆب ئالوودە ببێت، لەوانەیە نەخۆشیی "پری تونیت" سەرهەڵبدات کە جێگای مەترسییە و لە رابردوودا کە دەرمانەکانی "ئانتی بیوتیك" نەبوون، زۆرتر دەبووە هۆی مردنی نەخۆش.

تەنانەت ئەمرۆش کە دەرمانەکانی "ئانتی بیوتیك" پەیدا بوون و نەخۆشە میکرۆبییەکان چارەسەر دەکەن، پزیشکەکان دیسان لە نەخۆشیی میکرۆبیی "پری تونیت" دەترسن. "مارگۆ" نەیدەزانی لەبەرچی مێردەکەی نایهەوێ ئەو نەخۆشە بپشکنێ و ئاگای لەوە نەبوو کە هاوسەرەکەی بەهۆی سفت بوونەوەی خانەکانی مێشکی لە شوێنی بیر و زەینی، تووشی شێتیی کاتی و فەرامۆشی بووە.

ئەو رۆژە، ئەو کچە پەرستارەی کە رۆژانە دەهاتە ماڵی "زائربروخ" و یارمەتیی دەدا، دێر هات و "مارگۆ" پێی گوت باری تەندروستیی ئەو نەخۆشەی کە دوێنێ نەشتەرگەریی ئاپاندیسی بۆ کراوە، باش نیە و یاوەکشی گەیشتۆتە چل پلە. کچە پەرستارەکە دوای ئەوەی کە نەخۆشەکەی بینی و پلەی گەرمای لەشی هەڵسەنگاند تێگەیشت کە رەوشی نالەبارە.

"مارگۆ" وتی من هەرچی بە پرۆفیسۆر دەڵێم کە پشکنین بۆ ئەم پیاوە نەخۆشە بکات، نایکات تکایە برۆ پێی بڵێ لەوانەیە بە قسەی ئێوە بکات. کاتێك کچە پەرستارەکە رۆیشتە لای "زائربروخ" و پێی راگەیاند کە باری تەندروستیی نەخۆشەکە خراپە، سەرەرای ئەوەی کە "زائربروخ" لەو رۆژەدا دیسان تووشی شێتیی کاتی و فەرامۆشی ببوو، بەڵام بە بینینی بالاپۆشی سپیی کچە پەرستارەکە هەستایە سەرپێ و لەگەڵی رۆیشت و نەخۆشەکەی پشکنی.

خوو و رەوشتی تەمەنێك کاری پزیشکی لە ناخی "زائربروخ"دا هێندە بەهێز بوو کە کاتێك لەسەر سەری نەخۆشەکە بوو، لەبارەی رەوشی تەندروستییەوە هیچی بەو کچە نەگوت. بەڵام پاش

هاتنه دەرەوە لە ژوورەكە و داخستنی دەرگاكە بە كچە پەرستارەكەی گوت ئەم نەخۆشە بەبێ هیچ دوودڵییەك تووشی نەخۆشیی "پری تونیت" بووە. كچە پەرستارەكە وتی كەوایە دەبێ هەرچی زووتر بۆ دەرمانكردنی دەست بەكار بن.

"زائربروخ" وتی بە خێرایی هەوڵ دەدەم و نەشتەرگەری بۆ تومۆری "هی پو تالاموس"ی ئەنجام دەدەم. كچە پەرستارەكە سەرەڕای ئەوەی كە فێر ببوو هیچكات، رەخنە لە ئوستاد و پزیشكی نەشتەرگەری نەگرێت، بە سەرسوڕمانەوە پرسیاری كرد دەتانەوێ نەشتەرگەری بۆ تومۆری "هی پوتالاموس"ی ئەنجام بدەن؟

"زائربروخ" وتی بەڵێ.

"هی پوتالاموس" بەشێك لە مێشكی مرۆڤ كەلە شوێنی تەختایی مێشك هەڵكەوتووە و لەسەر كرداری دەماری سەنپاتیك "دەمارە هەستیار"ەكانی لەش زۆر كاریگەرە. هەموان دەزانن لە جەستەی ئێمەدا دوو جۆر دەمار هەیە، یەكیان دەماری وروژێنەر و جوولەدار و ئەوی دیكەشیان دەماری هەستیار. دەمارە جوولەدارە جۆراوجۆرەكانی جەستەمان لە جوولەی مۆڵەی چاوەوە بگرە هەتا حەرەكەتی دەست و لاق دەخاتە حەرەكەت و دەمارە هەستیارەكانیش، جیاوازیی ساردی و گەرمی و نەرمی و توندوتیژییان پێ دەڵێ و هەر ژان و ئازارێك لە هەر شوێنێكی جەستە سەرهەڵدەدات ئێمە لە رێگای دەمارە هەستیارەكانەوە دەركی دەكەین و هەر دەمانێكی ئازاربەر كە بە نەخۆش دەدرێت، كاریگەریی تەسكین و سڕبوونی لە لەشدا بەهۆی ئەوەیە كە تومۆری "هی پوتالاموس" كە كاری دەمارە هەستیارەكانی بەدەستەوەیە، فەرمان دەكات كە ژانە و ئازارەكە سڕ ببێت.

## نەشتەرگەری بۆ تومۆری "هی پوتلاموس" لە ماڵەوە

کچە پەرستارەکە هەتا ئەوکاتە نە بیستبووی و نە لـە هـیچ کتێـب و گۆڤـارێکی پزیـشکیدا خوێندبوویەوە کە نەشتەرگەریی تومۆری "هی پوتالاموس" ببێتە هۆی چاك بوونـەوەی نەخۆشـیی "پری تونیت". لەلایەکی دیکەشەوە کاتێك "زانربـروخ" وتـی نەشـتەرگەری بـۆ تومـۆری "هـی پوتالاموس"ی نەخۆش ئەنجام دەدات، کچە پەرستارەکە لای بوو بە یـەقین کـە بێگومـان ئوسـتاد نەخۆشەکە رەوانەی نەخۆشخانە دەکات. چونکە نەشـتەرگەریی تومـۆری "هـی پوتـالاموس" لـە مێشك پێویـستی بە هەڵدڕینی کەللەسەرە و ناکرێ ئەو کارە بەبێ هیچ کەلوپـەلی نەشـتەرگەری و لە ماڵەوە ئەنجام بدرێت. چونکە کردنەوەی کەللەسەر، پێویستی بـە ئامێرگەلێکـە کـە تـەنیا لـە نەخۆشخانەکان هەن، بەڵام ئەو پەرستارە ئەوەیان فێر کردبوو کەلـە هەمبـەر کـار و بۆچـوونەکانی نەشتەرگەر و بەتایبەت نەشتەرگەرێکی گەورەی وەك "زانربروخ"دا بێدەنگ بێت و و هیچ نـەڵێ. "زانربروخ" بە کچە پەرسـتارەکەی گوت کە لەگەڵ ژنەکەی و "ئان یـس" نەخۆشـەکە بەرنـە سـەر تەختی نەشتەرگەری.

کچە پەرستارەکە سەرەڕای ئەو هەموو رێز و حورمەتەی کە بۆ "زانربروخ" هەیبوو، بێـدەنگیی شکاند و وتی "گهیم رات" دە ئاخر لێرە کەلوپەلی نەشتەرگەریی مێشکمان لەبـەر دەسـتدا نیـە. "زانربـروخ" وتـی لـە هـەر جێگایـەك نەشـتەرگەرێکی شـارەزا و شایـستە هـەبێت، کەلوپـەلی نەشتەرگەریی مێشك یان هـەر جـۆرە نەشـتەرگەرییەکی دیکـە هەیـە و کـاری سـەرەکی بـوونی نەشتەرگەرە و شتەکانی دیکە لاوەکین.

کچە پەرستارەکە بە ناچاری بە یارمەتیی هاوسەری "زانربروخ" و "ئان یس" پیاوە نەخۆشـەکە کە تووشی یاوێکی زۆر ببوو، هێنایانە سەر قەرەوێڵەکە و ئەو پیاوە هەرچەند یاو و لەرز گرتبـوو، بەڵام هۆش و فکری بە تەواوەتی لەسەر خۆی بوو و دەیهەویست بزانێ بۆچی شوێنەکەیان گۆڕیـوە. "زانربروخ" بە کچە پەرستارەکەی گوت دەمامکی بێهۆشی لەسەر روخساری نەخۆشەکە دابنێت و بێهۆشی بکات. پیاوە نەخۆشەکە گوێی لە وشەی بێهۆشی بـوو و پرسـیاری کـرد بۆچـی بێهۆشـی دەکەن؟ "زانربروخ" گوتی بۆ ئەوەی دەمانەوێ دەرمانت بکەین. کـچە پەرسـتارەکە بـەبێ ئـەوەی نەخۆشـەکە ببینێ، ئاماژەی بە مووی سـەری نەخۆش کرد و ئوستادی تێگەیانـد کـە بـەو هـەموو قژەوە ناکرێ نەشتەرگەریی بۆ بکرێت.

ئوستاد گوتی تیخێك بێنن و سەری بتاشن. پیاوە نەخۆشەکە بە ترسەوە گوتی بۆ دەتانەوێ مووی سەرم بتاشن؟ "مارگۆ" هاوسەری "زائربروخ" وەڵامی دایەوە بۆ ئەوەی هەوا لەسەرتان بدات و فێنکتان بێتەوە و یاوەکەتان نەمێنێ. ئەو پیاوە داماوە بە ئاە و ناڵەوە گوتی تکا دەکەم واز لە مووی سەرم بێنن من زۆرم حەز لە مووی سەرمە. بەڵام پاڕانەوەی ئەو پیاوە هیچ کاریگەرییەکی لەسەر "زائربروخ" دانەنا و مووی سەری لەو شوێنەی کە دەیهەویست کەللەسەری بکاتەوە تاشی و بە کچە پەرستارەکەی گوت کە ماسکی بێهۆشییەکە لەسەر روخساری نەخۆش دابنێت و بێهۆشی بکات.

کاتێك "زائربروخ" دەیهەویست سەری نەخۆش بتاشێت و ئەو پیاوەش نەیدەویست مووی سەری لەدەست بدات، جێگای "مولر" شانۆنامەنووسی ناسراوی فەرەنسی بەتاڵ بوو کە ئەو دیمەن و دیالۆگە کە "ئەگەر سەرەنجامەکەی نەبوایەتە کارەسات" بە شێوازی تایبەتیی خۆی بکاتە شانۆنامە و بیهێنێتە سەر کاغەز.

لە سەردەمی "زائربروخ"دا پزیشکەکان، بە بیریان نەدەگەیشت کەلە نێوان تومۆری "هی پوتالاموس" و نیشانەی نەخۆشییەکانی دیکە و بەتایبەت یاوکردن پێوەندییەك هەبێت، بەڵام ئەمڕۆ زانستی پزیشکی ئەوەی سەلماندووە کەلە نێوان ئەو تومۆرە و هەندێ لە نەخۆشییەکان و بەتایبەت یاوکردن پێوەندی هەیە، چونکە تومۆری "هی پوتالاموس" لەناو پێکهاتەی مێشك کە یەکێکە لە ناوەندە هەستیارەکانی دەماری سەنپاتیك، واتە دەماری هەستیار و لە هەست کردن بە ئازار و ژانەکان لە لەشدا کاریگەریی زۆری هەیە.

مەسەلەیەك تر ئەوەیە کە تومۆری "هی پوتالاموس" ناوەندی ترمیك (ڕێکخستنی پلەی گەرمای لەش)ە و بێ ئەملا و ئەولا لە ئەزم بەخشین بە پلەی گەرمای لەشدا کاریگەرە و لەم ڕووەوە دەرمانی ناسراو و کاریگەری "ئاسپرین" تای نەخۆش دەبڕێت یان دەبێتە هۆی دابەزینی پلەی گەرما و یاو کە کاریگەریی لەسەر تومۆری "هی پوتالاموس" دادەنێت و دوای ئەوەی کە نەخۆشێك یاوی کردووە حەبێکی ئاسپرین بخوات بەهۆی ڕۆڵی "هی پوتالاموس" یاوی لەشی نامێنێ یان لانیکەم دادەبەزێ.

ئەگەر بێت و لە کاتی پێست گرتنەوەی سێودا قامکی خۆتان بە چەقۆ ببڕن و هەست بە ژان و ئازار بکەن، پاش خواردنی حەبێکی ئاسپرین ژانی قامکتان نامێنێ و ئەوەش بەهۆی فەرمانی تومۆری "هی پوتالاموس"ە، چونکە کاری ئەم بەخشین بە کاری دەمارە هەستیارەکانی لەشە.

ئایا "زائربروخ" کە گوتی بۆ بڕینی تای ئەو نەخۆشە دەبێ نەشتەرگەری بۆ "تومۆری هی

پوتالاموس"ی بکرێت ئاخۆ ئەوکاتە زانیویە کەلە نێوان ئازاری یاو و کرداری "هی پوتالاموس"دا پێوەندییەك هەیە یـان نـا؟ چـونکە هـەتا ئـەم دواییانـە پزیـشك و نەشـتەرگەرەکان بـەم ئەرکـە راستەقینەیە زانستییەی ئەندامانی لەشیان نەزانیوە. ئەگـەر ئـەم راسـتییەی زانیبـێ دەبـێ ئـەم مەعریفەیەش بە یەکێك لە داهێنانە زانستی و هونەرییەکانی "هونەری نەشتەرگەری"ی ئەو پیاوە بلیمەتە لە قەڵەم بدرێت. دوای ئەوەی کە نەخۆشەکەیان بێهۆش کرد، "زائربروخ" بـە نـووکی کـار دەکەی لەسەر پێستی سەری نەخۆش بازنەیەکی کێشا و دواتر کارێك کەلـە زاراوەیـەکی پزیـشکی بەناوی "ترەپاناسیون"ە، یانی کردنەوەی کەللەسەر بۆ نەشتەرگەری لە مێشکی دەست پێکرد.

"زائربـروخ" لەسـەر ئـەو بازنەیـەی کـە لەسـەر سـەری نـەخۆش کێـشابووی ئێـسکی سـەری نەخۆشەکەی بە مشاری پزیشکی بڕییەوە و ئێسکە مشار کراوەکە کە سەرێکی بە کاسەی سـەرەوە بەسترابوو، بەو چەشنەی کەلە سەرەتای ئەم باسەدا کوتمان هەڵدایەوە و لەسەر کاسەسـەری داینـا. "مارگۆ" هاوسەری "زائربروخ" و کچە پەرستارەکە بەبێ ئەوەی کە هیچ بڵـێن، چـاویان بڕیبـووە دەستی ئوستاد کە خەریکی کار بوو و "مارگۆ" ئەختێ دەلەرزی، چونکە هەتا ئەوکاتە نەیدیتبوو هاوسەرەکەی ئێسکی کەللەسەر ببڕێتەوە و نەشتەرگەری بۆ مێشك بکات.

"زائربروخ" بە جۆرێك لە کاری خۆیدا وەستا و شـارەزا بـوو کـە پـاش کردنـەوەی کاسەسـەری نەخۆش، بە یەك حەرەکەتی کاردی نەشتەرگەرییەکە تومۆری "هی پوتالاموس"ی بینییـەوە و بـە حەرەکەتی دووەم ئەو تومۆرەی دەرهێنا و خستیە ناو زبڵدانەکەوە. دوای ئەوەی کە تومۆری "هـی پوتالاموس"ی دەرهێنا، "زائربروخ" ئیدی کارێکی بە مێشك نـەمابوو بێجگەلـەوەی کـە برینـی سەری نەخۆش ببەستێت، دیتی کچە پەرستارەکە بەسەر نەخۆشەکەدا زۆر نووشتاوەتەوە.

"زائربروخ" کە دەیزانی نەخۆش بێهۆشە و دەنگی نابیستێ، بەبێ ئەوەی کە دەنگی خـۆی نـزم بکاتەوە، وتی چ بووە بۆ ئاوا نوشتاویتەتەوە؟ کچە پەرسـتارەکە راسـت بـۆوە و بـە هێواشـی بـە "زائربروخ"ی وت نەخۆشەکە هەناسە ناکێشێ. "زائربروخ"یش وەکـوو کـچە پەرسـتارەکە بەسـەر نەخۆشەکەدا نووشتایەوە و بۆ ماوەی دوو خولەك سەرقەی دایە لێدانی دڵـی و دوای ئـەوەی سـەری بـەرز کـردەوە، هاوسـەرەکەی و کـچە پەرسـتارەکە دیتیـان رەنـگ بەڕوویـەوە نـەماوە، چـونکە "زائربروخ" بۆی دەرکەوت کە نەخۆشەکە مردووە.

لەو کاتەدا بەهۆی مـەرگی نەخۆشەکەوە، فەرامۆشیی "زائربروخ" چاك بـۆوە و هۆشـی هاتـەوە سەرخۆی. لەو کاتەدا ئەو ئوستادە بلیمەتە بۆ یەکەم جار بەبێ ئەوەی کە وەکوو چـەند کارەسـاتی پێشوو تووشی گومان و دوودونگی بێت تێگەیشت کە هەڵەی کردووە و بەهۆی هەڵەوە، کەسـێکی

کوشتووە و ئەو کارەشی لەو هەڵانەیە کە ئیدی قەرەبوو ناکرێتەوە. بۆیە ئەو شێتییە بۆ یەکەم جار تەکانێکی گورچکبڕی لەو مامۆستایە دا و ویژدانی خۆی مەحکووم کرد و لەو کاتەدا "زائربروخ" لەباری هۆش و عەقڵەوە هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ کاتی ئاساییدا نەبوو.

"زائربروخ" کە ڕەنگ لە ڕووی بڕابوو بەهۆی ترسەوە قسەی بۆ نەدەهات و تەنانەت جووڵەشی نەدەکرد و هاوسەرەکەی و کچە پەرستارەکە کە ئەویان لەو حاڵەتەدا بینی نەیاندەوێرا زار بکەنەوە و قسان بکەن، چونکە بێدەنگیی ئەو سێ کەسە لە ژوورەکە زۆری خایاند، سەرنجی "ئا یس"ی خزمەتکار کەلە مەتبەخەکە بوو ڕاکێشا و هاتە ژووری نەشتەرگەرییەکەوە و ئەویش پاش تێگەیشتن لەو فەزا ترسناکەی کە ژوورەکەی داگرتبوو، نەیتوانی قسەیەك بکات و بێدەنگ بوو.

کێیە کە بتوانێ ئەو هەژان و تۆفانەی کە لەو کاتەدا ڕۆح و ویژدانی "زائربروخ"ی داگرتبوو، پەسن و وێنا بکات؟ ئاخۆ کێیە کە بتوانێ پەشیمانی و هەست کردن بە مەحکوومی ویژدانیی ئەو پیاوە لێك بداتەوە. "زائربروخ" یەکەم نەشتەرگەر نەبووە کە تووشی هەڵە بووە و بەهۆی کەمتەرخەمییەوە کەسێك بمرێت، بەرلەویش نەشتەرگەر و پزیشکی دیکەش تووشی هەڵەی لەوچەشنە بوون و ئەمڕۆش هەندێ جار ئەو هەڵە و کەموکورتییانە کە دەبێتە هۆی گیان لەدەستدانی نەخۆشێك ڕوو دەدات.

بەڵام نەشتەرگەرانی پێش و پاش "زائربروخ" ئەو توانایی و بلیمەتە زانستی و پزیشکییەی ئەویان نەبوو هەتا ئەوەی ویژدانیان بە شێوەیەکی نەبەخشراوی مەحکوومیان بکات. ئەو کەسەی کەلە بوارێکی زانستیدا خۆی بە کامڵ و پوختە دادەنێت، ئەگەر بێت و بەهۆی هەڵەوە تووشی هەڵەیەکی قەرەبوو نەکراو بێت، خۆی نابەخشێ، چونکە هۆکارە نهێنییەکانی تاوان لە ناخی خۆیدا هەست پێناکات هەتا لە ئاستی سزاکەی (ئەو سزایەی کە بە شیاوی خۆی دەزانێ) کەم بکاتەوە. پاش ماوەیەك بێدەنگی کە "زائربروخ" بەبێ جووڵە وەستابوو، چاوی ئوستاد بە پەیکەری مردوو، کاسەسەری کراوە و مێشکی سپیی کەوت و دەستی خوێناویی خۆی هێنایە نێوچاوانی و بەشێك لە سەر و تووێڵی خوێناوی بوو. لەو کاتەدا نەشتەرگەری گەورە بە تەواوەتی هەستی کرد کە بۆ خۆی بەڕاستی نەخۆش بووە و ئەوانەی کە دەیانگوت دەبێ دەست لەکار هەڵبگرێت و باقی تەمەنی بحەسێتەوە، ڕاستیان دەکرد وەرسووڕا کەلە ژوورەکە بڕواتە دەرەوە.

بەڵام کچە پەرستارەکە بەهۆی شارەزا بوون، بیری لە بەرەنجام و ڕاستییەکانی ئەو کارەساتە کردەوە، داوێنی باڵاپۆشە پزیشکییەکەی "زائربروخ"ی گرت و پێشی بە چوونە دەرەوەی ئوستاد گرت و جەنابی پرۆفیسۆر چی لەم تەرمە (ئاماژە بە مردووەکە) بکەین. ڕووداوی مەرگی نەخۆش،

لە کاتی نەشتەرگەری یان داوتر بۆ هیچ نەشتەرگەرێك مەسەلەیەکی ئاسان نیە و نەشتەرگەر پاش مەرگی نەخۆش، مردنەکەی پڕاست دەکاتەوە و جەوازی کفن و دفنی دەنووسێت و "زائربروخ"یش دەیتوانی جەوازی دفنی پەسند بکات و تێیدا بنووسێت بەهۆی بەرەنجامەکانی نەشتەرگەرییەوە کۆچی دوایی کردووە. بەڵام ویژدانی "زائربروخ" کە بەتەواوەتی مەحکوومی کردبوو، ئەو ئیزنەیان پێنەدەدا کە جەوازی مەرگی نەخۆشەکە بنووسێت هەتا بە کەسوکارەکەی بدات کە دێن بۆ وەرگرتنەوەی تەرمەکەی.

پیاوێك کە هەتا ئەوکاتە سەدان و ئەگەری زۆرە نزیك بە هەزاران کەسی لە مەرگ رزگار کردبوو، بۆ ئەوەی کە خۆی لەدەست ویژدانی رزگار بکات کەوتە بیری خۆکوژی.

بە جۆرێك حاڵ و باری دەروونیی "زائربروخ" پەرێشان بوو کە کچە پەرستارەکە دڵی بۆی سووتا و لە ژووری بەناو نەشتەرگەرییەکە هێنایە دەر و بردییە ژوورەکەی دیکەوە و گوتی لێرە بمێننەوە ناوتان بۆ دێنم هەتا سەروچاوتان بشۆن "زائربروخ" گوتی کەپسولێکی "ئەسید سیانیدریك" لەم کاتەدا بۆ من زەرووری ترە لە ئاو.

"ئەسید سیانیدریك" ژارێکە زۆر بەهێز کەلە چرکەکانی یەکەمدا دەماره ورووژێنەر و هەستیارەکان لەکار دەخات و لە ئەنجامدا کار و حەرەکەتی تەواوی ئەندامە سەرەکییەکانی جەستە رادەوەستێ و یەك لەو کارانە هەناسەکێشانە و هەرکە کاری هەناسە راوەستا، مێشك لە ماوەی چەند خولەکدا دەمرێت و لە جەستەی مرۆڤدا، خانەکانی مێشك پتر لە تەواوی خانەکانی دیکە، لە هەمبەر نەگەیشتنی ئوکسیجن هەستیارن و هەرکە هەناسەکێشان بوەستێت و ئیتر خوێنی تازە (ئەو خوێنەی کە لەناو سیپەلاکەکان پالێوراوە" نەدەگەیشتە مێشك، خانەکانی مێشك کە ئیتر لە رێگای خوێنەوە ئوکسیجنیان پێناگات، دەمرن و پێنج خولەك دوای ئەوەی کە کاری گەیشتنی ئوکسیجن بە مێشك راوەستا، خانەکانی مێشك دەمرن و دواتر مەرگی خانەکانی دیکەی جەستەش دەست پێدەکات.

ئەگەر "زائربروخ" لەو رۆژەدا نەیتوانی خۆکوژی بکات هۆیەکەی ئەوە بوو کە ژاری "ئەسید سیانیدریك"ی لە ماڵەوە نەبوو و هەروەها هەر ئەوکاتە تەقولبابیان کرد و دەرکەوت کە "برن دروف" هاتووە هەتا باقی بیرەوەرییەکانی ژیانی ئەو پزیشکە بنووسێتەوە. هاوسەری "زائربروخ" گەنجە رۆژنامەنووسەکەی بردە ژوورێکی دیکەوە و کچە پەرستارەکە یارمەتیی "زائربروخ"ی دا هەتا سەروچاوی بشوات و دواتر لێی پرسی چی لە تەرمەکە بکەن.

"زائربروخ" گوتی کەسوکاری مردووەکە ئاگادار بکەنەوە بێن و تەرمەکەی بەرنەوە. لە ماڵی

"زانربروخ" دەفتەرێك هەبوو كە ناو و نادرێس و ژمارە تەلەفۆنی نەخۆشەكانیان تێدا دەنووسی و كچە پەرستارەكە لەناو ئەو دەفتەرە ژمارەی كەسوكاری مردووەكەی دۆزییەوە و پێی راگەیاندن كە بێن و تەرمەكەی بەرنەوە.

كەسوكاری پیاوە مردووەكە كاتێ زانییان نەخۆشەكەیان مردووە، زۆر سەریان لەو كارەساتە سوڕ ما، چونكە دەیانزانی كەسێك كە نەشتەرگەریی ئاپاندیسی بۆ بكرێت، نامرێت و بەتایبەت ئەگەر نەشتەرگەرەكەی "زانربروخ" بێت. كەسوكاری نەخۆشەكە كاتێ ویستیان تەرمەكە بەرنەوە بینییان كە سەری مردووەكە باندپێچ كراوە و ئەمەش زیاتر بووە هۆی سەرسوڕمانیان، چونكە دەیانزانی نەخۆشەكەیان تووشی ئاپاندیس بووە و لەسەریدا هیچ نەخۆشییەكی نەبووە هەتا نەشتەرگەریی بۆ بكەن.

ئەوان داوایان لە "زانربروخ" كرد كە روونكردنەوە بدات و پەیدایان نەكرد و كچە پەرستارەكە جەوازی دەفنی تەرمەكە كە بە دەسخەتی "زانربروخ" نووسرابوو پێی دان كە تێیدا بەبێ ئەوەی ئاماژە بە نەشتەرگەریی مێشك بكرێت، نووسرابوو نەخۆش بەهۆی نەشتەرگەریی ئاپاندیس مردووە.

كەسوكاری مردووەكە لەلای پۆلیس سكالاّیان بەدژی "زانربروخ" تۆمار كرد و پۆلیس رەوانەی وەزارەتی تەندروستیی كردن و وەزیری تەندروستی و دكتۆر "مادلنر" هەوڵیان دا كەسوكاری كەسە مردووەكە قەناعەت پێ بێنن كە "زانربروخ" لەگەڵ نەخۆشەكەی ئەوان هیچ دوژمنایەتی و قینێكی نەبووە و بەهۆی شێتیی كاتی و فەرامۆشییەوە ئەو پیاوەی كوشتووە و پاش مشتومڕێكی زۆر كەسوكاری مردووەكەیان بەو جۆرە رازی كرد كە "زانربروخ" لە رێگای مووچەی خانەنشینییەكەیەوە (پاش ئەوەی كە پەسەند كرا) هەتا چەند ساڵ پارەیەكیان پێ بدات، بەلاّم مووچەی خانەنشینیەكەی ئوستاد بەدەستی نەگەیشت هەتا بەشی كەسوكاری ئەو پیاوە مردووەش بدات.

وەزیری تەندروستی و دكتر "مادلنر" بۆ دەرمانی شێتیی كاتیی "زانربروخ" و دوور خستنەوەی لەو نەخۆشانەی كە سەردانیان دەكرد، رەوانەی نەخۆشخانەی "شاریتی"یان كرد و هێشتنەوەی ئەو نەشتەرگەرە لەو نەخۆشخانەیە گەرەنتییەك بوو بۆ ئەوەی كە ئیتر كاردی نەشتەرگەری بەدەستەوە نەگرێت و دیسان تووشی كوستن نەبێتەوە و "برن دروف"یش پاش گواستنەوەی "زانربروخ" بۆ نەخۆشخانە بە رەزامەندیی دكتۆر "مادلنر" دەرۆیشتە نەخۆشخانە و ئەو رۆژانەی كە باری تەندروستیی ئوستاد باش بوو، بیرەوەرییەكانی دەنووسییەوە.

## رێورەسمی سەدەمین ساڵی لەدایك بوونی نەشتەرگەرێکی گەورە

لە حاڵێکدا "زاتربروخ" نەخۆش بوو و لە نەخۆشخانە خەوێنرابوو، نەشتەرگەر و پزیشکانی ئەڵمانیای رۆژهەلات، بە بۆنەی سەدەمین ساڵرۆژی لەدایك بوونی "فن میکولیك رادکی" نەشتەرگەری گەورەی ئەڵمانیا، بڕیاریان دا لە شاری "فرانکفۆرت" رێورەسمێك رێك بخەن. شاری "فرانکفۆرت" هەلکەوتوو لە ئەڵمانیای رژهەلات نابێ لەگەڵ شاری فرانکفۆرتی ئەڵمانیای رۆژئاوا بە هەڵە تێبگەین، شاری فرانکفۆرتی ئەڵمانیای رۆژئاوا لە فرانکفۆرتی ئەڵمانیای رۆژهەلات بایەخی زیاترە و زانکۆیەکی گەورەی هەیە و زێدی لەدایك بوونی "گوتە" شاعیری بەناوبانگی ئەڵمانییە و لە کەنار رووباری "ماین" هەلکەوتووە، بەلاّم شاری "فرانکفۆرت"ی ئەڵمانیای رۆژهەلات لە پەنای رووباری "ئودر" هەلکەوتووە و لەباری پێکهاتەی شارسازییەوە ئەو گرنگییەی فرانکفۆرتی رۆژهەلاتی نیە.

ژیان و بەسەرهاتی "فن میکولیك رادکی" کە دەیانەویست بە بۆنەی سەدەمین ساڵی لەدایك بوونییەوە لە شاری "فرانکفۆرت" رێورەسمێك بەڕێوە بەرن، دوور و درێژە و لە بابەتی سەرەکیمان کە ژیان و سەربوردەی "زاتربروخ"ە دوورمان دەخاتەوە و هەر بەوە قەناعەت دێنین کە "فن میکولیك رادکی" ئوستادی "زاتربروخ" بووە و ئەو لە بواری نەشتەرگەرییەوە ئیلهامی لەو وەرگرتووە و دواتر خۆی گەیشتۆتە ئاستی بلیمەتی. لەناو نەشتەرگەر و پزیشکانی ئەڵمانیا لە "زاتربروخ" زیاتر کەس نەیدەتوانی لەبارەی کەسایەتی و پلەی زانستیی "فن میکلوك رادکی"یەوە بۆ ئامادەبوانی رێورەسمی ساڵیادی لەدایك بوونی بخاتە روو، هەربۆیە لیژنەی بەڕێوەبەری کۆڕیادی سەدەمین ساڵی لەدایك بوونی ئەو نەشتەرگەرە "زاتربروخ"یان بانگهێشت کرد کە لەو کۆڕیادەدا ئامادە بێت و ئاخاوتنی سەرەکیش بگرێتە ئەستۆ.

چونکە ناونیشانی نوێی "زاتربروخ" نەخۆشخانەی شاریتی بوو (ئەم نەخۆشخانەیە بە مانای نەخۆشخانەی هاوکاری و بەزەیی بوو و لە زمانی ئەڵمانیدا بە واتای (کران کن هاوس)ە و هێشتا لە بەرلینی رۆژهەلاتە و وەرگێرانە ئینگلیزییەکەی "شاریتی"یە و بە "شاریتی" دەینووسن و وەك زۆر وشەی دیکەی ئینگلیزی لە زمانی فەرەنسییەوە وەرگیراوە و لە فەرەنسیدا بە "شاریتە"

دەنووسری، هەر بۆیە نامەی بانگهێشتی "زائربروخ"یان ڕەوانەی لای بەڕێوەبەرانی ئەو نەخۆشخانەیە کرد.

"دکتۆر مادلنر" و سەرۆکی نەخۆشخانە و هاوکارانیان ڕاوێژیان کرد کە ئایا ئەو نامەی بانگهێشتە بگەیەننە دەستی "زائربروخ" یان نا و ئاخۆ دەبێ لە ڕێوڕەسمی سەدەمین ساڵیادی لەدایك بوونی مامۆستاکەیدا بەشداری بکات یان نا؟ ئەنجامی ڕاوێژەکەیان بووە ئەوەی چونکە لە ڕێوڕەسمی سەدەمین ساڵی لەدایك بوونی "فن میکویك رادکی" لە شاری "فرانکفۆرت" لە ژووری نەشتەرگەریدا بەڕێوە ناچێت و "زائربروخ"یش کێبڕکێی نەشتەرگەری بەدەستەوە ناگرێت هەتا نەشتەرگەری بۆ نەخۆشێك بکات و بیکوژێت، بۆیە ئامادەبوونی لەوێ بۆ خەڵکانی دی جێگای مەترسی نیە.

پاش ئەو ڕاوێژە سەرەتاییە لەبارەی ئەوەوە قسەیان کرد کە ئایا "زائربروخ" دەتوانێ لە فرانکفۆرت لەبارەی مامۆستاکەیەوە قسە بکات؟

ئەنجامی ڕاوێژی دووەم بووە ئەوەی کە دوو فەرمانبەری گەنجی نەخۆشخانە وەك هاوڕێ لەگەڵ "زائربروخ" بڕۆنە ئەو تەلارەی کە ڕێوڕەسمەکەی تێدا بەڕێوە دەچێت و لەملاو و ئەولای بوەستن و ئەگەر زانیان "زائربروخ" لە کاتی قسەکردندا، قسەی بێ واتا و هەڵیت و پەڵیت دەکات، یەکیان "زائربروخ" لە تەلارەکە بباتە دەرەوە و ئەوی دیکەشیان نووسراوەیەکی کورت کە لەلایەن نەخۆشخانەوە "لەڕاستیدا خودی دکتۆر مادلنر" ئامادەی کردبوو، بخوێنێتەوە هەتا ئەرکی "زائربروخ" بەجێ هێنرابێت.

بۆیە مەسەلەی بانگهێشت کردنەکەیان بە "زائربروخ" ڕاگەیاند و دکتۆر "مادلنر" پێی گوت کە بابەتی لێدوانەکەی خۆی ئامادە بکات، چونکە لە نەخۆشخانەش کتێبخانەیەك نیە بۆ ئەوەی لەو کتێبانە بۆ ئامادەکردنی بابەتەکەی کەڵك وەربگرێت. "زائربروخ" کە مامۆستاکەی خۆی بە باشی دەناسی و حاڵ و باری تەندروستیشی بۆ قسە و لێدوان لەبار و ئاسایی بوو، بابەتی لێدوانەکەی بۆ یەکێك لە تیۆرییەکانی "فن میکولیك رادکی" تەرخان کرد کە ئەو لەو تیۆرییەدا ڕاڕایی و دوودڵ بوو لە مەترسیی چوونی میکرۆب بۆ ناو برینەکانی نەشتەرگەری.

"فن میکولیك رادکی" بە جۆرێك لەبارەی میکرۆب "لە کاری نەشتەرگەری"دا بەگومان و ڕاڕا بوو کە قەدەغەی کردبوو نابێ هاوکارەکانی لە ژووری نەشتەرگەریدا قسان بکەن و دەیگوت ئیمکانی نیە کەسێك قسە بکات و میکرۆب لەزارییەوە نەیەتەدەر، بۆیە دەمپێچی پزیشکی ناتوانێ پێش بە هاتنی میکرۆب بگرێت و میکرۆب پاش هاتنە دەرەوە لە زار خۆی دەگەیەنێتە

برین و هەروەك مێش و هەنگ عاشقی شیرینینن میکرۆبیش عاشقی برینە و تەنیا بەسە میکرۆب لە زاری کەسێك بێتەدەر و لەسەر برینی شوێنی نەشتەرگەری بنیشێتەوە، هەتا چل و هەشت کاتژمێری دیکە ژمارە و رێژەی ئەو میکرۆبە لە ژمارەی ئەستێرەکانی ئاسمان زیاتر دەبێت.

چونکە میکرۆب بۆ زاوزێ پێویستی بە رەگەزی نێر و مێ نیە و هەرکە لەسەر برینێك نیشتەوە و خۆراکی خۆی دابین کرد، بۆ بەرهەمهێنانی رەگەزی خۆی دەبێتە هێندەی دیکە و دواتر هەرکام لەو دوو نیوەیە، بە نۆرەی خۆیان دیسان زیاد دەبن و دەبنە چەندین میکرۆبی دیکە و بەم چەشنە زاوزێی میکرۆبە بەم چەشنە زنجیرناسا درێژەی دەبێت.

بۆیە "فن میکولیك رادکی" لەو باوەڕەدا بوو تەنیا بەسە میکرۆبێك لەسەر برینی نەشتەرگەری بنیشێت هەتا برینەکە چڵك و کیم بکات ئەگەر بێت و ئەو نەشتەرگەرییە لە شوێنێکی هەستیاری جەستە بێت، ئەو چڵك و کیم کردنە دەبێتە هۆی مەرگی نەخۆش.

خاڵێك کە باس کردنی نابەجێ نیە ئەمەیە کەلە دەورانی "فن میکولیك رادکی"دا دەرمانە "ئانتی بیۆتیك"کان کە بەرچاوترینیان "پنی سیلین"ە لە ئارادا نەبوو هەتا ئەوەی کە پاش نەشتەرگەری پێش بە چڵك و ئاوسانی برین بگرێت، بەڵام ئەو رۆژەی کە "زانربروخ" دەیەویست لەبارەی سەدەمینساڵیادی لەدایك بوونی مامۆستاکەی خۆیەوە بدوێت، دەرمانە ئانتی بیۆتیکەکان هەبوون و نەشتەرگەرەکان، ئیتر وەکوو دکتۆر "فن میکولیك رادکی" لە میکرۆب نەدەترسان و ئەگەر "زانربروخ" لەبارەی میکرۆبەوە زۆر قسەی کردبا ئامادەبوان بە جیددییان وەرنەدەگرت.

سەرەڕای ئەوەی کەلە میکرۆب نەدەترسان، بەڵام لە "وایرۆس" دەترسان چونکە دەرمانەکانی ئانتی بیۆتیك کە میکرۆبەکانی لەناو دەبرد، کاریگەریی لەسەر میکرۆبەکان دانەدەنا. هەربۆیە "زانربروخ" ئاخاوتنەکەی لەبارەی مامۆستاکەی بە چەشنێك ئامادە کرد کە بتوانێ پاش سەرەتایەك باس کردن لە ترسی مامۆستاکەی لە میکرۆبەکان بەگشتی لەبارەی "وایرۆس"ەوە قسە بکات. لە رۆژی دیاریکراودا "زانربروخ" لە حاڵێکدا دوو دکتۆری گەنجی نەخۆشخانەی "شاریتی" لە هەردوولایەوە راوەستابوون، رۆیشتە ناو تەلاری بەرێوەچوونی رێورەسمەکەوە.

"زانربروخ" کە بە درێژایی تەمەنی قیت و قنج هەنگاوی هەڵدەگرت، بە قامەتێکی چەماوە هاتە ناو تەلارەکەوە و لە نزیکەوە دیار بوو کە روخساری زۆر چرچ و لۆچی تێکەوتووە و چاوەکانی ئیتر شەوق و درەوشاوەیی جارانیان نەماوە. "زانربروخ" کاتێك دەستی بە قسەکانی کرد دکتۆر "مادلنر" و خەڵکانی دی کە دەترسان دیسان شێتی و فەرامۆشییەکەی سەرهەڵبداتەوە و قسەی

هەڵیت و پەڵیت بکات، بەلام پاش ماوەیەك خاترجەم بوون چونکە هۆشی بەتەواوەتی لەسەرخۆ بوو و ئاقلانە قسەی دەکرد و ئاخاوتنی ئەو رۆژەی "زانربروخ" کە وەك دوایین ئاخاوتنی پێش لە مەرگی دێتە ئەژمار، کاریگەریی لەسەر ئامادەبوان دانا و وەك سەرکەوتنێکی زانستی مەعنەوی بۆ "زانربروخ" دەهاتە ئەژمار.

ئەو پاش ئەوەی کە بەوپەڕی رێز و سەمیمیەتەوە یادی لە مامۆستاکەی خۆی کرد و ئاماژەی بە شەند کارێکی نەشتەرگەریی ناوبراو کرد و دواتر باسی لە "وایرۆس" کرد و هەرچەند وایرۆس زیاتر پێوەندیی بە پزیشکییەوە هەبوو، بەلام بابەتی پێوەندیدار بە نەشتەرگەری و پزیشکی هێندە زۆرن کە لەباری ئەرکی ئەندامانی لەشی مرۆڤەوە هەردووکیان یەکن.

"زانربروخ" گوتی ئێمەی نەشتەرگەر هەروەك ئەمڕۆ دەتوانین مەترسیی میکرۆبەکان لەناو بەرین، توانایی ئەوەشمان هەیە مەترسیی هەندێ لە ویرۆسەکانیش دوور خەینەوە، بەلام لە حالی حازردا، زۆربەی وایرۆسەکان هیچ ترسێکیان لە دەرمانەکانی ئانتی بیۆتیك نیە و ئێمە ناتوانین مەترسییەکانیان کەم بکەینەوە.

پاشان بەم چەشنە درێژەی بە ئاخاوتنەکەی دا: هەمرو ئەوانەی بە ژن و پیاوەوە لێرە ئامادەن دەزانن وشەی "وایرۆس" لە زمانی یۆنانیدا بە واتای ژارە و گیانلەبەرێکە زۆر بچووك کەلە پێنج لە یەکی "میکرۆن" بچووکترە و لەم کۆڕەشدا پێم وایە کەس نیە نەزانێ یەك میکرۆن یەك هەزارەمی میلی مەترە. "وایرۆس" هێندە بچووکە کە ئێمە بە زەرەبینی ئاساییش ناتوانین ببینین و ئەم گیانلەبەرە زۆر بچووکە، کەلە هەمبەر دەرمانەکانی ئانتی بیۆتیکیشدا پارێزراوە، هێرش دەکاتە سەر خانەکانی لەشمان و لەکاریان دەخات و پاش مردنی خانەکانیش مرۆڤ دەمرێت.

ئەگەر خانەکانی جەستەمان بزانن چ کاتێك، لەلایەن "وایرۆس"ەوە دەکەونە بەر هێرشی "وایرۆس"، لە رێگای ئەنزیەوە خۆیان بۆ بەرەنگاریی "وایرۆس" ئامادە دەکەن، ئەنزیم مادەیەکە کەلە خانەکانەوە تراوشت دەکەن. بەلام خانەکان، نازانن چ کاتێك دەکەونە بەر هێرشی "وایرۆس" هەتا خۆیان تەیار بکەن، چونکە وایرۆس هەمیشە لەناکاو بە غافلاندنەوە هێرش دەکاتە سەر خانەکان. هەروەك ئامادەبوانی بەرێز دەزانن "ئەنزیم" وشەیەکی یۆنانیە و پێکهاتووە لە دوو وشەی هەمان زمان بە واتای "بوونە هەویر" (خومرە) و یۆنانییەکان پێیان وایە لەناو خومرەدا کە هەویر دەکاتە نان و وەك دەڵێن هەویرەکە هەڵدێنێ ئەو تایبەتمەندییەی هەیە کە دەبێتە هۆی هەلاتنی هەویر و دیسان هەمووتان دەزانن کە زاراوەی "ئانزیم" ئێستا لە زانسی پزیشکیدا بەو شتانە دەوترێت کەلە جەستەماندا بەرهەم دێن و بەشێکی زۆر کەمی کاریگەریی زۆریان لەسەر

ئەرکی ئەندامانی لەش هەیە. بەهەرحاڵ خانە دەتوانێ لەگەڵ ئەو "ئـانزیم"ەی کـە بەرهـەم دێـت مەترسیی وایرۆس لەناو ببات، بەڵام پێویستە بزانێ چ کاتێك وایرۆس هێرش دەکاتـە سـەری. بـۆ ئەوەی کە بتوانیم مەترسـیی هێرشـی "وایـرۆس" پووچـەڵ بکەینـەوە، دەبـێ لەبـەردەم دەرگـای خانەکاندا هێمایەکی مەترسیی دابنێین هەتا ئەوکاتەی کە وایـرۆس نزیکـی دەبێتـەوە و دەیهـەوێ خۆی بخزێنێتە ژوورەوە، ئەو هێمایە زەنگ لێبدات و خانە ئاگادار بکاتـەوە هـەتا خـۆی ئامـادەی بەرەنگاربوونەوە بکات. ئەگەر خانە دیواری بڵیند و قاپی هەبایە، پێویـستی بـە دانـانی زەنـگ و هێمای مەترسی نەبوو، بەڵام خانە بێبەرییە لەو دیوارانە و پەرژینێکی ناسکی هەیـە کـە وایـرۆس زۆر بە ئاسانی دەتوانێ لە مـەودای نێـوان شـووڵەکانەوە بڕواتـە نـاو خانەکانـەوە و بیخـافڵێنێ و دەورەی بدات.

بەڵام ئەگەر بتوانین هێما و زەنگێکی مەترسی لەبەردەم خانەکاندا دابنێین هەتا وایرۆس، لە هەر شوێنێکەوە کە بیهەوێ بێتە ناو ئەو ژوورەوە ئـەو زەنگـە لێبـدرێت و خانـە بـەخێرایی خـۆی بـۆ بەرەنگاری ئامادە بکات و هەرچەشنە نەخۆشییەك کە بەهۆی هێرشی وایرۆسەوە تووشمان دەبێـت، لەناو دەچێت و نەخۆشیی پیریـش نـامێنێ و مـرۆڤ هەمیـشە گـەنج دەمێنێتـەوە، چـونکە پـیری نەخۆشییەکە کە بەرەنجامی هێرشی وایرۆسەکانن بـۆ سـەر جەسـتەمان و ئاسـەواری هێرشـی ئـەو وایرۆسە بە شێنەییە و بە شێوەی نێونجی سی هـەتا چـل سـاڵ یـان نـەختێ زیـاتر دەخایـەنێ کـە وایرۆسی پیری خانەکانی جەستەمان لەپێ بخات و کۆتایی بە ژیانمان بێنێ.

لەو رۆژەدا، بۆ یەکەم جار لە زمانی "زائربروخ"ەوە راگەیەنرا کە پیری نەخۆشییەکە کە وەکـوو هەموو نەخۆشییە وایرۆسییەکان بەهۆی هێرشی وایرۆسەوە پەیدا دەبێـت. هـەتا ئـەو رۆژە چـەندە وترابوو کە پیری نەخۆشـییە، بـەڵام روونیـان نـەکردبۆوە کـە هۆکـاری پەیـدابوونی وایرۆسـە. ئـەم مەسەلەیە کە ئەمرۆ هەموو بیرمەند و ژینگـەناس، مرۆڤنـاس و شـارەزایانی بـواری جەسـتە بـە راستییەکی دادەنێن، لەو کات و ساتەدا، وەك تیۆرییـەکی پزیشکیی نـوێ و بـێ وێنـە بـوو و زۆر کاریگەریی لەسەر ئامادەبوان دانا. "زائربروخ" درێـژەی بـە ئاخاوتنەکـەی دا و گـوتی پێـشبینی دەکەم هەتا بیست یان بیست و پێنج ساڵی دیکە ئەم زەنگە مەترسییە کە دەبـێ لەبـەردەم ژووری خانەکاندا دابنرێ هەتا لە هێرشی وایرۆس بە ئاگای بێنێتـەوە، دەدۆزرێتـەوە و باشـترین شـێوازی ئاگادار کردنەوەش کە بۆ پێشگیری لە جۆرەکانی وایرۆس، تـەنیا زەنگـی مەترسـی دابنـێن، نـەك ئەوەی کە بۆ هەر جۆرە وایرۆسێك زەنگی مەترسییەکی تایبەت دابنێین.

لە هەموو ئەو ماوەیەی کە "زائربـروخ" سـەرقاڵی ئاخـاوتن بـوو، تەنانـەت تووشـی تـوری و

زمانگیران نەبوو، چ بکات بەوەی کە قسەی هەڵیت و پەڵیت بکات و ئەو ناخاوتنەی لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا دەنگدانەوەی زۆری هەبوو و گۆڤاری زانستی و پزیشکییەکان دوو تیۆریی "زاتربروخ" لەبارەی وایرۆسی پیری و دانانی زەنگی مەترسی لە ژووری خانەکانیان شرۆڤە و تاوتوێ کرد و بەگشتی ئەو ناخاوتنەی لە فرانکفۆرت وەك دەسکەوتێك لە قەڵەم درا.

دوای ئەوەی لە "فرانکفۆرت گەڕایەوە، دیسان هەر لە نەخۆشخانە دەمایەوە و بەداخەوە بۆ "زاتربروخ" وەزیری تەندروستی سەرەڕای کەللەڕەقیی "زاتربروخ" بۆ واژۆ نەکردنی بەرگەی خانەنشینی و وەرگرتنی مووچەکەی، دیسان پێداگریی دەکرد کە مووچەی خانەنشینییەکەی تۆمار بکات، بەڵام وەزیر گۆڕدرابوو و وەزیری نوێی تەندروستیش هیچ هەوڵێکی بۆ پەسەند کردنی مووچەی خانەنشینیی ئەو پیاوە نەدا، چونکە پێی وابوو لەباری مادییەوە هیچ پێویستییەکی نیە، لە حاڵێکدا "زاتربروخ" لەو تەمەنە پیرییەدا بەڕاستی بۆ دابین کردنی بژیوی ژیانی بنەماڵە بچووکەکەی پێویستی بە پارە هەبوو، بەتایبەت پاش گەڕانەوەی لە فرانکفۆرت حاڵی تێکچوو، بە جۆرێك هەندێ ڕۆژ تەنانەت کەسانی دەورووبەریشی نەدەناسی.

پاش مانەوەی هەتاهەتایی پرۆفیسۆر "زاتربروخ" لە نەخۆشخانە، هاوسەرەکەی بۆ دابین کردنی بژیوی ژیانی بە جۆرێك تووشی ناستەنگ هات کە ناچار بوو نامەیەك بۆ "تیۆدۆر - هۆس" سەرکۆماری ئەڵمانیای ڕۆژئاوا نووسی بۆ بارودۆخی "زاتربروخ" داوای یارمەتیی لێکرد. "مارگۆ" لەو نامەیەدا نووسی کە هاوسەرەکەی نەخۆشیی ڕۆحیی گرتووە و ماوەیەکە لە نەخۆشخانە کەوتووە و بەهۆی ئەو نەخۆشییە دەروونییەوە توانایی کارکردنی نیە، بەڵام تەنانەت ئەگەر لەباری جەستەیی و ڕۆحیشەوە لەشساغ ببوایە، ئێستا لە قۆناغێك لە تەمەن دایە کە زۆرینەی پیاوان، ناتوانن کار بکەن، بەڵام ئەم پیاوە بەساڵاچووە کە ئێستا نەخۆشە و پەکی کەوتووە و خزمەتێکی بەرچاوی بە بواری پزیشکی و نەشتەرگەریی ئەڵمانیا کردووە و پێویستە ئەمڕۆ نەتەوەی ئەڵمانیا، ڕێزی ئەو کار و خزمەتە بەنرخانەی بگرن و لەبەر ئەوەی بەڕێزتان دەسەڵاتدار و نوێنەری نەتەوەی ئەڵمانیان، من لەو باوەڕە دام کە ئەرکی ویژدانی و مرۆیی ئێوەیە کە بۆ دابین کردنی بژیوی ژیانی بنەماڵەکەی هەوڵی خۆتان بدەنە گەڕ.

سەرکۆماری ئەڵمانای ڕۆژئاوا لە وەڵامی نامەکەی "مارگۆ"دا نامەیەکی نووسی و سەبارەت بە نەخۆشیی "زاتربروخ" داخ و کەسەری خۆی دەربڕی، بەڵام لەبارەی هەوڵێك بۆ دابین کردنی بژیوی ژیانی "زاتربروخ" و بنەماڵەکەی داوای لێبووردنی کرد و گوتی بەداخەوە سەرکۆماری ئەڵمانیای ڕۆژئاوا بوودجە و دەستمایەیەکی نیە کە لەو ڕێگایەوە بتوانێ بۆ "زاتربروخ" پارە و مووچەیەك

تەرخان بکات، یان ئەوەی کە بە شێوەی کاتی یارمەتییەك بە خۆی و بنەماڵەکەی بکات و باشتر وایە بۆ خۆی (مارگۆ) سەردانی شارەوانیی ئەڵمانیای رۆژئاوا بکات.

"مارگۆ" نامەیەکی بۆ شارەداری بەرلینی رۆژئاوا کە ئەوکات "ئێرنێست ـ رۆتێر" بوو نووسی و ئەو مەسەلەیەی کەلە نامەکەیدا بۆ سەرکۆماری نووسیبوو دیسان دووپاتی کردەوە. من وەڵامی شارەداری بەرلینی رۆژئاوام نەبینیوە (نووسەری ئەم توێژینەوە و سەربوردەیە یانی یۆرگن توروالت وتوویە ـ وەرگێڕی فارسی) بەڵام لە رۆژنامەکانی ئەوکاتدا ناوەرۆکی وەڵامی شارەداری بەرلینی رۆژئاوام بۆ هاوسەرەکەی "زائربروخ" بەم چەشنە خوێندەوە، چونکە "زائربروخ" لە نەخۆشخانەی "شاریتی" لە بەرلینی رۆژهەڵات کاری کردووە، کەوایە پێڕاگەیشتن بە بارودۆخی، لە ئەستۆی نەخۆشخانەی "شاریتی" یان شارەوانی بەرلینی رۆژهەڵاتە و هیچ پێوەندییەکی بە شارەوانیی بەرلینی رۆژئاواوە نیە.

ئەو وەڵامەی کە لەلایەن سەرکۆماری ئەڵمانیا و شارەداری بەرلینی رۆژئاواوە بە هاوسەرەکەی "زائربروخ" درایەوە، لە دوو شوێنەوە سەرچاوەی دەگرت. یەکەم ئەوەی سەرکۆماری ئەڵمانیای رۆژئاوا نە شارەداری بەرلینی رۆژئاوا لەباری سیاسییەوە روانگەیەکی باشیان لە هەمبەر "زائربروخ"دا نەبوو. ئەو کەسانەی پێیان وابوو "زائربروخ" سەر بە کۆمۆنیستەکانی ئەڵمانیای رۆژهەڵاتە، بۆ ئەوەی بینییان پاش کۆتایی هاتنی شەڕ "زائربروخ" لە بەرلینی رۆژهەڵات مایەوە و لە نەخۆشخانەی ئەو شارە کە لەژێر دەستی کۆمۆنیستەکاندا بوو درێژەی بەکاری پزیشکی و نەشتەرگەری دا.

بەڵام راستییەکەی ئەوەیە کە "زائربروخ" نە ئەندامی حیزبی کۆمۆنیستی ئەڵمانیای رۆژهەڵات و نە وەك کەسێك لە "سنباتیزان" (لایەنگرانی ئەو حیزبە) دەهاتە ئەژمار، بەگشتی "زائربروخ" بەجۆرێك سەرقاڵی کاری پزیشکی بوو کەلە تەواوی تەمەنیدا نەچووە ناو هیچ حیزب و رێکخراوێکی سیاسییەوە. هەروەك لە لاپەڕەکانی پێشوودا باسمان لێوە کرد، پاش ئەوەی کە هیتلەر و حیزبەکەی (حیزبی سوسیالیستی میللی) دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت "زائربروخ" نەتەنیا نەبوو بوو بە ئەندامی حیزبی نازی، بەڵکوو ئامادە نەبوو لەو حیزبەدا، ناو و ناوبانگی ئەو بۆ پروپاگەندە بەکار بێنن.

سەرکۆمار و شارەداری ئەڵمانیای رۆژهەڵات سەرنجی ئەو خاڵەیان نەدابوو کە "زائربروخ" ساڵانێك بەرلە دەسپێکی شەڕی دووەمی جیهانی و بەرلەوەی کە ئەڵمانیا بەسەر دوو وڵاتی رۆژهەڵات و رۆژئاوادا دابەش بکرێت، لە نەخۆشخانەی "شاریتی" کاری کردووە و ئەگەریش پاش

کۆتایی شەڕ و دابەشبوونی ئەڵمانیا بۆ دوو وڵات نەیویست لەو نەخۆشخانە و هەروەها بەرلینی ڕۆژهەڵات بڕواتە دەر و پەنابەرێتە بەر ئەڵمانیای ڕۆژئاوا یان یەکیەتیی سۆڤیەت، بەهۆی هۆگرییەك بوو کە بۆ شوێنی کارەکەی هەیبوو، ئەویش ئەو هۆگرییەیە کە لەلای پیاوان و ژنانی بەساڵاچوو پتر لە لاوان و لەلای ئەوان بەسترانەوە و مەیل و حەزی بە شوێنی کار لەگەڵ خوو و سرشتدا گرێ دەدرێت و پیاوان و ژنانی بەساڵاچوو وەها دەکەونە ژێر کاریگەریی ئەو سرشتەوە کە گۆڕینی ئەو خوو و خدە و هەروەها شوێنی کار لەلایان گەلێك ئەستەمە.

سەکۆمار و سەرۆکی شارەوانیی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا ئاگایان لەم دیاردە سروشتییە دەروونناسیە نەبوو و هیچ سەرنجێکیان پێنەدەدا و پێیان وابوو پاش کۆتایی شەڕ "زائربروخ" بۆیە لە نەخۆشخانەی بەرلینی ڕۆژهەڵات مایەوە، چونکە لەلایەن حکومەتی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتەوە پارەی وەرگرتووە.

سەرچاوەی دووەمی وەڵامی نەرێنیی سەرکۆمار و سەرۆکی شارەوانیی بەرلینی ڕۆژئاوا ئەوە بوو ئەوان پێیان وابوو "زائربروخ" کەسێکی خاوەن موڵك و سامانە و ئەویان بە شایستەی وەرگرتنی یارمەتی لە قەڵەم نەدەدا. ئەوان پێیان وابوو "مارگۆ" هاوسەری "زائربروخ" ئەو نامانەی بەبێ ئاگاداریی مێردەکەی نووسیوە و یان لایان وابوو نامەکان بە بڕیاری "زائربروخ" نووسراون و ئەو پیاوە سەرەڕای ئەوەی کە ساماندارە، بەهۆی چاوچنۆکی لە کۆکردنەوەی سەروەت و ساماندا دەیهەوێ داهاتێکی هەمیشەیی دیکەشی هەبێت.

لە ژیانی بەشێك لە کەسایەتییە بەناوبانگەکان و بەتایبەت لە ژیانی بلیمەتەکان، ئەفسانە لە زەینی خەڵکی ئاساییدا، پتر لە ڕاستی و واقیعیەتە مێژووییەکان بەهێزە و یەك لەو ئەفسانانەی کە لەبارەی "زائربروخ"ەوە ساز کرابوو، ئەوە بوو کە پاش ئەوەی نەشتەرگەریی بۆ "جۆرجی پێنجەم" پاشای بریتانیا کردووە، یەك میلیۆن مارکی ئەڵمانی پارەی وەرگرتووە. گوایە ئەو بڕە پارەیەی کە ئەوکات زائربروخ بۆ نەشتەرگەری لە پاشای بریتانیای وەرگرتووە، پەنها هێندەی ساڵانی کۆتایی تەمەنی ئەو پزیشکە بووە. دەنگدانەوەی هەواڵی بانگهێشتی دەرباری بریتانیا لە "زائربروخ" بۆ ئەوەی نەشتەرگەری بۆ جۆرجی پێنجەم ئەنجام بدات، زۆر زیاتر لەوە بوو کە ئەمڕۆ لەلایەن سەرکۆماری ئەمریکاوە داوا لە دەوڵەتی یەکیەتیی سۆڤیەت بکرێت کە نەشتەرگەرێکی ئەو وڵاتە بڕواتە ئەمریکا و نەشتەرگەری بۆ سەرکۆماری ئەو وڵاتە بکات. چونکە لە نێوان ئەمریکا و یەکیەتیی سۆڤیەتدا شەڕ ڕووی نەداوە و یەکیەتیی سۆڤیەت لەلایەن ئەمریکاوە شکستی نەخواردبوو، هەتا سەرکۆماری ئەمریکا داوا لە نەشتەرگەری وڵاتێکی شکست خواردوو

بکات بڕواته ئەو وڵاته و نەشتەرگەریی بۆ بکات.

بەڵام بریتانیا و ئەڵمانیا له شەڕی یەکەمی جیهانیدا پێکەوه شەڕیان کردبوو و ئەڵمانیا لەلایەن بریتانیاوه شکستی خواردبوو، بەڵام پاشای بریتانیا که ئەوکات ئیمپراتۆری ٥٢٥ وڵاتی کۆلۆنیال و داگیرکراو بوو و وەك دەیانگوت خۆر له هەرێمی ئیمپراتۆریی ئەودا ئاوا نەدەبوو، داوای له نەشتەرگەری نەتەوەیەکی شکست خواردوو (ئەویش بە دەستی خۆی) کردبوو که کاری نەشتەرگەریی بۆ بکات، سەرەڕای ئەوەی که بریتانیا به یەکێك له ناوەندە گەورە پزیکشییەکانی جیهان دەهاته ئەژمار و چەندین نەشتەرگەری بەناوبانگ و پسپۆڕی هەبوو، بەڵام دیسان هەر ئەو نەشتەرگەره بەناوبانگه بریتانییانه دانیان بەوەدا دەنا که "زائربروخ" لەوان شارەزا و لێزانتره و بۆ نەشتەرگەریی پاشای بریتانیا "زائربروخ" لەوان شایستەتره.

نەشتەرگەریی "زائربروخ" بۆ جۆرجی پێنجەم به سەرکەوتنەوه ئەنجام درا و بووه هۆی ناوبانگ و شانازییەك بۆی، بەڵام پێچەوانەی را و بۆچوونی خەڵك پارەیەکی باشی چنگ نەکەوت.

## سەفەری "زائربروخ" بۆ مۆنیخ

مانگی نوامبری ساڵی ١٩٥٠ی زایینی "کیندلر" بەڕێوەبەری دامەزراوەی چاپەمەنیی هەڵکەوتوو لە مۆنیخ کە کتێبی بیرەوەرییەکانی "زائربروخ"ی چاپ دەکرد بانگهێشتی کرد کە بۆ بینینی نموونەی فۆرمی سەرەتایی کتێبەکەی و هەروەها دیاری کردنی ناونیشانی کتێبەکە دەبێ سەردانی مۆنیخ بکات. "زائربروخ" هاوڕێ لەگەڵ هاوسەرەکەی (مارگۆ) ڕۆیشتن بۆ مۆنیخ و سەردانی نووسینگەی "کیندلر"ی کرد. ئەو ڕۆژە "زائربروخ" بە تەواوەتی هۆش و بیری لەسەرخۆ بوو و دەستی کرد بە خوێندنەوەی سەرەتای کتێبەکەی خۆی، بەڵام بەرەبەرە ئەوەی کە دەیخوێندەوە بووە هۆی سەرسوورمانی ئەو مامۆستایە و سەرەنجام تووڕە بوو و بەوپەڕی ناڕەحەتییەوە بە "کیندلر"ی گوت ئەمانەی کە ئێوە نووسیوتانە وتەی من نین و بەناوی منەوە شتی دیکەیان نووسیوە.

"کیندلر" دەیزانی "برن دروف" کە بۆ نووسینەوەی ڕەشنووسی بیرەوەرییەکانی "زائربروخ" ڕۆیشتبووە بەرلینی ڕۆژهەڵات، لە هەندێ لە بەشەکانی بیرەوەرییەکانی زێدەڕۆیی تێدا کردووە و ئەگەری زۆرە هەندێ بابەتی دەسکردی تێدا گونجاندبێ هەتا کتێبەکە سەرنجڕاکێشتر بێت و بەڕێوبەری دامەزراوەی چاپەمەنیی "کیندلر"یش پێی وابوو ئەو بابەتانە بە ئاگاداریی "زائربروخ" نووسراون، هەر بۆیە ئەو ڕۆژنامەنووسە پێشنیاری بە "زائربروخ" کردووە کە ئەو بەشانەشی تێدا بگونجێنێ، بۆیە چاپی کردبوون، دەنا بەڕێوەبەری دامەزراوەی چاپەمەنیی "کیندلر" بە ئەزموونتر لەوە بوو کە ئەگەر بڵاوکەرەوە بابەتێك لە کتێبێکدا بەبێ ئاگاداریی نووسەر بڵاو بکاتەوە، لەباری یاساییەوە تاوانبارە و نووسەر دەتوانێ سکاڵای یاسایی لەسەر تۆمار بکات. هەربۆیە کاتێ تێگەیشت "زائربروخ" ئەو بابەتانەی باس نەکردووە یان بە گونجاندنیان لە کتێبەکەدا ڕازی نەبووە، بڕیاری دا تووڕەیی ئەو مامۆستایە هێوری بکاتەوە، بەڵکوو نیزنی چاپی کتێبەکە بسدات، چونکە کتێبەکە لە چاپخانە پیتچنی کرابوو و ئەگەر بیانویستبا ناوەڕۆکی کتێبەکە بگۆڕن، جیالەوەی کە پێویستیان بە کاتێکی زۆر هەبوو، دەبوا بۆ جاری دووەم کتێبەکە پیتچنی بکەنەوە.

هەربۆیە بە "زائربروخ"ی گوت: من لێتان تێدەگەم، بەڵام کتێبی بیرەوەریی نەشتەرگەرێکی گەورەی وەك ئێوە بە شێوەی ئاسایی، بۆ خەڵکی سەرنجڕاکێش نیە، مەگەر ئەوەی بە جۆرێك چاپ

بکرێت کە بکەوێتە بەر سەرنج، دەنا کتێبەکە نافرۆشرێت. "زائربروخ" گوتی ئێـوە تـەنیا بـیر لـە کڕیارانی کتێبەکە دەکەنەوە کە خەڵکی ئاسایین، ئیدی بیر لەوە ناکەنەوە دوای ئەوەی کە کتێبەکـە چاپ و بڵاو کرایەوە، تەنیا لە ئەڵمانیای رۆژئاوا و رۆژهەڵاتـدا شەسـت و چـوار هـەزار پزیـشك و نەشتەرگەر و لە وڵاتانی دیکەی ئەورووپا نزیك بە سێـسەد هەزار پزیشك و نەشتەرگەر ئـەم کتێبـە دەخوێننەوە، هەتا کەڵك لـە تیـۆری و ئەزموونـەکانی مـن وەربگـرن. ئـاخۆ ئێـوە بیرتـان لـەوە نەکردۆتـەوە بـەم بابـەت و ناوەرۆکـە لاوەکـی و دوور لـە راسـتییانە کـە تـەنیا بـۆ گۆڤـارە سەرگەرمییەکان دەشێن، ناوی من لەلای پزیشك و نەشتەرگەرانی ئـەڵمانیا خـراپ دەکـەن، ئێـوە دەڵێن ئەگەر بێت و لەم کتێبەدا بابەتی لاوەکی کە هیچ پێوەندییەکی بە بیروەرییە زانستییەکانی منەوە نیە، چاپ نەکرێت خەڵك نایکڕن، بەڵام سەرنجی ئەوە نادەن کە ئەگـەر بێـت و ئـەم کتێبـە تەنیا لەخۆگری بیرەوەرییە زانسـتی و نەشـتەرگەرییەکانی من بێت، سەدان نوسخەی لێ دەفرۆشرێت و لە وڵاتانی ئەورووپایی تەنانەت دەقی وەرگێڕانـی فەرەنـسی، ئینگلیـزی، ئیتـالی و ئیـسپانی و تەنانەت روسییەکەشی دەفرۆشـرێت، چـونکە هـەموو پزیـشك و نەشـتەرگەرانی دنیـا تامـەزرۆی خوێندنەوەی بیرەوەرییە زانستییەکانی منن.

سەرەنجام بەڕێوەبەری دامەزراوەی چاپەمەنی تەسلیم بـوو و بڕیـاری دا کتێبەکـەی "زائربـروخ" پێداچوونەوەی پێدا بکرێت و ئەو بەشە زیادییانەی هەتا ئەو جێگایەی دەگونجێ لابرێت.

"زائربروخ" و هاوسەرەکەی لـە "مـۆنیخ" گەڕانـەوە و ئوسـتاد رۆیـشتەوە بـۆ نەخۆشـخانەی "شاریتی" و هاوسەرەکەی (مارگۆ) بە هاوکـاری و ناسـاندنی دکتـۆر "مـادلنر" لـە یـەکێك لـە کلینیکەکان کارێکی دۆزییەوە و رۆژانە دەڕۆیشتە کار، بەڵام "ئان یس" ژنە خزمەتکارەکەیان هەر لە ماڵ دەمایەوە و بـە کاروبـاری ماڵەکەیانـدا رادەگەیـشت. پـاش گەڕانـەوەی "زائربـروخ" لـە "مۆنیخ" و رۆیشتنەوەی بۆ نەخۆشخانەی "شاریتی" باری تەندروستیی بەرەو باشتربوون رۆیشت و دکتۆر "مادلنر" پاش راوێژی تەلەفۆنی لەگەڵ "مارگۆ" بڕیاری دا کە بیباتەوە ماڵی خۆیان، بەو مەرجەی کە "مارگۆ" ئاگای لێبێت و نـەهێڵێت مێردەکـەی کـاری نەشـتەرگەری بکـات. بـەڵام هاوسەری "زائربروخ" کە رۆژان دەڕۆیشتە کلینیکەکە و کاری دەکرد و لە ماڵەوە نەبوو هەتا پێش بە کاری نەشتەرگەریی مێردەکەی بگرێت. دکتۆر "مادلنر" بە "مارگۆ"ی گوتبوو با بۆ کـارکردن نەڕواتە کلینیك و لە ماڵەوە بمێنێتەوە و ئاگای لە "زائربـروخ" بێـت کـە ئـیتر دەسـت بـۆ کـاری نەشتەرگەری نەبات و ئەویش بۆ دابین کردنی بژیوی ژیانیان هەوڵێك دەدات.

چونکە دکتۆر "مادلنر" بە باشـی ئاگـاداری بـاری مـاڵیی "زائربـروخ" بـوو و دەیزانـی لـەو

هەلومەرجەدا بەڕاستی پێویستی بە هاوکاری هەبوو، بۆیە بڕە پارەیەکی لە پزیشك و نەشتەرگەرانی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتی بۆ "زائربروخ" وەرگرت و بەبێ ئەوەی ئەو مامۆستایە لێی ئاگادار بێت و "مارگۆ"ش بەو بڕە پارەیە هەندێ کەلوپەلی ژیان و قاتێکی جلوبەرگی بۆ مێردەکەی کڕی.

دکتۆر "مادلنر" بە مارگۆی گوت ئێوە بۆ ماوەی سێ مانگ ئاگاتان لە "زائربروخ" بێت کە دەست بۆ کاری نەشتەرگەری نەبات و باری دروونیشی لەبەرچاو بگرن و ئەگەر هات و پاش سێ مانگی دیکە ئەو حاڵەتە شێتی و فەرامۆشیە زەینییە لەلای سەری هەڵنەدایەوە، دەکرێ خاترجەم بن کە چاك بۆتەوە و ئیدی لەوەوە بەدوا ئێوە دەتوانن مێردەکەتان لە ماڵەوە بەتەنیا بەجێ بهێڵن و بڕۆنە سەرکار. سەرۆکی نەخۆشخانەی "شاریتی" دەیزانی لەدەستی نایەت بەردەوام لە ڕێگای مووچەی مانگانەوە بژێوی ژیانی بنەماڵەی "زائربروخ" دابین بکات و بەناچاری دەبێ "مارگۆ" بڕواتە سەر کار، چونکە خودی "زائربروخ" ئیدی نابێت کاری نەشتەرگەری بکات، بەڵام هەرکە خەڵك لەوە ئاگادار بوون کە "زائربروخ" لە نەخۆشخانە گەڕاوەتەوە ماڵ، دیسان بۆ دەرمان و چارسەریی پزیشکی سەردانی ماڵییان دەکرد، بەڵام "مارگۆ" هەموو نەخۆشەکانی بە وەڵامێکی قسەلەڕوو و نەرمێنی ڕەت دەکردەوە و دەیگوت پرۆفیسۆر "زائربروخ" تووشی نەخۆشییەکی پڕمەترسی بووە و دەبێ لە ماڵەوە پشوو بدات هەتا چاك ببێتەوە و هەتا دوو ساڵی دیکەش بە هیچ شێوەیەك نابێ کاری نەشتەرگەری و پزیشکی بکات.

## دوایین نەخۆشی "زائربروخ"

لەناو نەخۆشەکانی "زائربروخ"دا ژنێك هەبوو کە ئەوکاتە تەمەنی ٤٧ ساڵان بوو و چەندین جار سەردانی ماڵی ئەو پزیشکەی کرد و لەلایەن "مارگۆ"وە وەڵامی نەدەدرایەوە، بەڵام دیسان دەستهەڵگر نەبوو، چونکە لەو باوەڕەدا بوو بێجگەلە "زائربروخ" کەسی دیکە ناتوانێ لە ڕێگای نەشتەرگەرییەوە چارەسەری بکات.

ئەو ژنە هێندە لە بەرماڵی "زائربروخ" چاوەڕێ ما هەتا ئەوەی ڕۆژێکیان "ئان پس" بۆ پێداویستییەکانی ماڵەوە لە ماڵ ڕۆیشتە دەرەوە و "مارگۆ"ش بۆ ماوەیەکی کاتی لە ماڵ ڕۆیشتە دەر و ئەو ژنەش هەرکە زانی "زائربروخ" لە ماڵەوە بەتەنیایە، ڕۆیشتە ماڵەوە و بە "زائربروخ"ی گوت هاوسەرەکەت و خزمەتکارەکەتان ناهێڵن بۆ چارەسەریی نەخۆشییەکەم سەردانتان بکەم.

"زائربروخ" لە ژنەکەی پرسی ناوتان چیە؟

ژنە وەڵامی دایەوە "ئیرم کاد ـ فری برك".

"زائربروخ" لێی پرسی نەخۆشییەکەتان چیە؟

من لە قوڕگمدا تووشی تومۆرێکی شێرپەنجە بووم و لەو باوەڕە دام بێجگەلە ئێوە کەسێکی تر ناتوانێ ئەو تومۆرە شێرپەنجەیە جۆرێك لە پشتی قوڕگمەوە بێنێتە دەر و چارەسەر بکرێم. "زائربروخ" پرسیاری کرد ئایا ئێوە لەوە خاترجەمن ئەو تومۆرەی کەلە پشتەوەی قوڕگتان دەرهاتووە، تومۆرێکی شێرپەنجەیە؟

ژنە وەڵامی دایەوە بەڵێ هیچ گومانم نیە.

"زائربروخ" لێی پرسی ئایا هەتا ئێستا تووشی "متاتاز" بوویت؟

"ئیرم کاد ـ فری برك" گوتی نا هەتا ئێستا تووشی "متاتاز" نەبووم.

"متاتاز" (کرداری گواستنەوەی شوێنی ئازار و نەخۆشییە لە ئەندامێکی لەشەوە بۆ شوێنێکی دیکەی لەش، بەبێ ئەوەی کە ئەو سەنتەر و شوێنە سەرەکییە لەناو بچێت و خانە شێرپەنجەییەکە کە بە "تومۆر" ناسراوە لە شوێنێکەوە ئەگوازرێتەوە بۆ شوێنێکی دیکە، بەبێ ئەوەی تومۆری یەکەم و دووەم یان تومۆری زیاتر کە لەناو جەستە دان، لەناو بچن).

"زائربروخ" پرسیاری لێکرد هەتا ئێستا وێنەتان لەو تومۆرە گرتووە؟ ژنەکە گوتی بەڵێ بەیانی

**ئەو وێنانەی کە گرتوومە بۆتانی دەهێنم.**

**"زانربروخ گوتی چ کاتێ ئەو وێنانەیان لە مل و قوڕگتان گرتووە؟**

ژنە وەڵامی دایەوە یەك مانگ لەمەوبەر. ئوستاد گوتی وێنەی یەك مانگ لەمەوپێش بەکەڵك نایەن، بەڵکوو دەبێ هەر ئەمڕۆ یان بەیانی وێنەی ئەو تومۆرە بگرن و بۆمی بهێنن.

ژنەکە پرسی چەند وێنە بگرم.

"زانربروخ" وتی چوار وێنە یەکێك لە پێشەوەی مل و ئەوی دیکەیان لە پشت و سێیەم لەلای ڕاست و چوارەمیش لەلای چەپی قوڕگتان و دوای ئەوەی کە وێنەکان ببینم پێتان دەڵێم کە چ ڕۆژێك نەشتەرگەریتان بۆ دەکەم و ئەو تومۆرە لە قوڕگتان دەردێنم.

"ئیرم کاد - فری برك" پرسیاری کرد ئاخۆ پاش ئەوەی ئەو تومۆرە شێرپەنجەیە لە قوڕگم دەربێنن، تووشی نەخۆشیی "متاتاز" نابم؟ "زانربروخ" وەڵامی دایەوە ئەگەر بە جوانی گوێ لە ڕێنوێنییەکانم بگرن و ئەو دەرمانانەی کە بۆتانی دەنووسم بە ڕێکوپێکی بیانخۆن، هیوای ئەوە زۆرە تووشی "متاتاز" نەبن. ئەو شتەی کە "زانربروخ" بەو ژنەی گوت لە زاراوەی پزیشکیدا بە "شیمێ توراپی" ناسراوە، یانی دەرمان لە ڕێگای مادەی کیمیاییەوە بە نەخۆش دەدرێت و پزیشك بە نووسینی دەرمانە کیمیاییەکان پێش بەوە دەگرێت خانە شێرپەنجەییەکان کە لەناو خوێن یان "لنف" دان و بەناو دەمارەکانی دیکەی لەشدا دەگەڕێن، تەنیا لە شوێنێك بمێننەوە و خانەی شێرپەنجەی دیکە ساز نەکەن.

تاقیکارییە پزیشکییەکان دەریانخستووە کە پێشگیری لە "متاتاز" لە ڕێگای دەرمانە کیمیاییەکانەوە کاریگەرە و ناهێڵێ خانەی دیکەی شێرپەنجە لە ئەندامانی دیکەی لەش سەرهەڵبدات، هەربۆیە بەکارهێنانی دەرمانە کیمیاییەکان بە بەردەوامی سیستەمە بەرگرییەکانی لەش، کە هۆکاری کاریگەری بەربەستی میکرۆب و وایرۆسەکانن، لاوازی دەکات. هەرچەند ئیتر خانەی شێرپەنجەیی سەرهەڵنادات، بەڵام ئەو ئەگەرە لە گۆڕێ دایە کە جەستە بکەوێتە بەر هێرشی چەندین میکرۆب و وایرۆسی جۆراوجۆرەوە.

چەند ڕۆژ دواتر ئەو ژنە نەخۆشە لە دەرفەتێکی لەباردا کە هاوسەر و خزمەتکارەکەیماڵی "زانرروخ" لە ماڵەوە نەبوون، ئەو وێنانەی کەلە قورگی گرتبوون هێنانی و بە "زانربروخ"ی نیشان دا. "زانربروخ" پاش بینینی وێنەکان بەو ژنە نەخۆشەکەی گوت ئەو تومۆرە شێرپەنجەییەتان بۆ دەردێنم.

ژنەکە لە وەڵامدا گوتی منیش بۆیە کاتی پشوو و حەسانەوەی ئێوەم تێکدا و داوام لێکردن

نەشتەرگەریم بۆ بکەن، چونکە دەزانم بەڕێزتان کاتێك نەشتەرگەری بۆ تومۆرێکی شێرپەنجە دەکەن لە جەستەدا هیچ ئاسەوارێکی لێ ناهێڵنەوە. "زانربروخ" گوتی وا دیارە ئێوە هەندێ زانیاریتان لەبارەی زانستی پزیشکییەوە هەیە.

ژنە نەخۆشەکە وەڵامی دایەوە پێشتر خوێندکاری کۆلیژی پزیشکی بووە و بەهۆی گرفتی بنەماڵە و باری ئابوورییەوە وازی لە خوێندن هێناوە. خەڵکی ئاسایی کە زانیارییەکی ئەوتۆیان لەبارەی خانەی شێرپەنجەوە نیە، کاتێك دەبیستن کە نەشتەرگەرێك تومۆرێکی شێرپەنجەی لە لەشی نەخۆشێك دەرهێناوە، پێیان وایە لەوە دەچێت سێوێك لەناو دەفرێکی میوە و هێلکەیەکی کوڵاو لەناو چەند هێلکەیەکی دیکە دەردەهێنن و هیچ ئاسەوارێك لەو سێو و هێلکەیە نامێنێتەوە. نەشتەرگەریش بە جوانی تومۆرێکی شێرپەنجە لە جەستە جیا دەکاتەوە، لە حاڵێکدا لە نێوان سێو و تومۆری شێرپەنجەدا جیاوازیی زۆر هەیە و خانە و ریشاڵە شێرپەنجەییەکان بە چەشنێك بە خانە و بەشەکانی دەورووبەرییەوە چەسپاوە و ڕۆچووەتە ناو تان و پۆیەوە و نەشتەرگەر کاتێك خانە و ریشاڵێکی شێرپەنجە لە جەستە جیا دەکاتەوە، دەبێ زۆر وریا بێت و بە وردی سەرنج بدات کە ریشاڵێك لەو شێرپەنجەیە لە ماسوولکەکانی دیکەی جەستەدا نەمێنێتەوە، دەنا دواتر لە هەمان شوێن تومۆرێکی دیکەی شێرپەنجە سەرهەڵدەداتەوە.

● بەهۆی ڕۆچوون و لێکتەنرانی ریشاڵەکانە لەناو تان و پۆی ماسوولکە ساغەکانی جەستە، لە رابردووەوە پزیشکەکان ناوی ئەم نەخۆشییەیان ناوەتە شێرپەنجە (قرژاڵ) چونکە ریشاڵە شێرپەنجەییەکان وەکوو چنگاڵی قرژاڵ رۆدەچنە ناخی ماسوولکە ساغەکاندا.

کاتێك هاوسەری "زانربروخ" و ژنە خزمەتکارەکەیان ئاگادار بوون کە ئوستاد بەڵێنیی بەو ژنە داوە نەشتەرگەریی بۆ بکات و تومۆری شێرپەنجە لە قوڕگی دەربێنێت، بە توندی دژایەتییان کرد چونکە دەیانزانی بێ ئەملاو ئەولا پاش نەشتەرگەری بۆ ئەو ژنە پێویستە هەر لە هەمان شوێن بخەوێنرێ هەتا چاك ببێتەوە. سەرەڕای ئەوەی "زانربروخ" بەرەبەرە بەهۆی کاریگەریی نەخۆشیی "پرۆستات"ەوە لاواز دەبوو، بەڵام باری دەروونیی باشتر بوو، دەڵێی نەخۆشییە جەستەیەکەی ببووە هۆی ئەوەی نەخۆشییە دەروونییەکەی نەمێنێ.

باشتربوونی باری رۆحی و دەروونیی "زانربروخ" لەلایەك و تەمەنا و پاڕانەوەی ژنە نەخۆشەکە لەلایەکی تر بووە هۆی ئەوەی کە سەرەنجام "مارگۆ" و "ئان یس" بەوە رازی بوون کە ئەو ژنە لە ماڵی ئەوان و لەلایەن "زانربروخ"ەوە نەشتەرگەریی بۆ بکرێت. لە رۆژی دیاریکراودا "مارگۆ" ژنە نەخۆشەکەی بیهۆش کرد و "زانربروخ" لەوپەڕی لەشساغی و بە سەرکەوتنەوە نەشتەرگەریی بۆ

کرد و تومۆری شێرپەنجەی لە قورگی دەرهێنا و ئەو ژنە پاش چەند رۆژ مانەوە لە ماڵی "زانربروخ" و چاکبوونەوە، رۆیشتەوە ماڵی خۆی. ئەو ژنە (ئێم کاد ـ فری برك) دوایین نەخۆش بووە کە بەدەستی "زانربروخ" نەشتەرگەریی بۆ کراوە و دەرهێنانی ئەو تومۆرە شێرپەنجەیەش بووە هۆی ئەوەی کە ئەو ژنە چەندین ساڵی دیکە بژی.

## مەرگی زائربروخ

سێ مانگ بەسەر ئەو وادەیەی کە لێپرسراوی نەخۆشخانەی "شاریتی" بۆ "مارگۆ"ی دانا گوزەرابوو، بەبێ ئەوەی کە نەخۆشیی فەرامۆشیی "زائربروخ" سەرهەڵبداتەوە. هەر لەو ماوەیەدا بوو کە ئەو پزیشکە بە سەرکەوتووییەوە تومۆری شێرپەنجەی لە قورگی "ئیوم کاد ـ فری بێرک" دەرهێنا. چونکە باری ڕۆحیی "زائربروخ" ئاسایی ببوو و ئەو بنەماڵە سێ کەسەش بۆ بژێو و پێداویستییەکانی ژیان پێویستیان بە داهاتێك بوو، بۆیە "مارگۆ" گەڕایەوە کلینکەکە و سەرقاڵی کارکردن بوو، بەڵام بە "ئان یس"ی ڕاسپاردبوو کە ئەگەر مێردەکەی ویستی دیسان لە ماڵەوە دەست بداتەوە بە نەشتەرگەری، دەستبەجێ لە ڕێگای تەلەفۆنەوە ئاگاداری بکاتەوە هەتا خۆی بگەیەنێتەوە ماڵ و پێشی بگرێت. هەر بەپێی ئەو ڕاسپاردەیەی "مارگۆ" هەر نەخۆشێك کە دەهاتە بەردەرگای ماڵی "زائربروخ" لەلایەن "ئان یس"ەوە بە وەڵامێکی نا ڕەت دەرکرانەوە و بۆ خۆشی سەرنجی ئەوەی دەدا کە دەبێ ئیتر ئوستاد لە ماڵەوە نەشتەرگەری نەکات هەتا ڕووداوێکی دیکە ڕوو نەدات.

نیوەڕۆی ڕۆژی دووەمی مانگی ژوئەنی ساڵی ١٩٥١ی زایینی لە حاڵێکدا "ئان یس" ژنە خزمەتکارەکە لە چێشتخانەکە سەرقاڵی کار بوو، لەناکاو گوێی لە دەنگی "زائربروخ" بوو. "ئان یس" خۆی گەیاندە ژوورەکەی "زائربروخ" و بینی لە ناوەڕاستی دیوەکە هەردوو دەستی بردۆتە ناو ڕانەکانی و دوو ئەژنۆی ناوەتە عەرز و سەروسیمای ئارەقی لێ نیشتووە و لە تاو ئازار پێچ لە خۆی دەدات.

"ئان یس" پرسیاری لێکرد ئەوە چیتانە؟

"زائربروخ" بە هەناسەبڕکێیەوە گوتی خوارەوەی زگم ئازارێکی زۆری هەیە و ناتوانم خۆم ڕابگرم. "ئان یس" پێوەندیی بەو کلینیکەوە کرد کە هاوسەری "زائربروخ" تێیدا کاری دەکرد و "مارگۆ"ی لە ئازار و نەخۆشیی مێردەکەی ئاگادار کردەوە و "مارگۆ"ش هەر لەوێوە دکتۆر "مادلنر"ی لە دۆخی هاوسەرەکەی ئاگادار کردەوە و ئەویش دەستبەجێ ئامبولانسێکی بۆ گواستنەوەی "زائربروخ" ڕەوانەی ماڵەکەی کرد. کاتێك گەیشتنە ماڵی "زائربروخ" هەتا بیبەنە نەخۆشخانە، دیتیان بووراوەتەوە. دکتۆر "مادلنر" دەیزانی "زائربروخ" بەهۆی نەخۆشیی "پرۆستات" تووشی عسرالبول بووە و بە دژواری دەتوانێ میز بکات، بەڵام چاوەڕوانی ئەوەی

نەدەکرد کە بیووریێتەوە.

پاش ئەوەی ئەو مامۆستایەیان گەیاندە نەخۆشخانە تێگەیشتن کە تووشی میزگیران بووە و لە ڕێگای بۆرییەوە میزەکەیان دەرهێنا و نەختێ ئاسوودە بوو. ڕۆژانی دواتر، دکتۆر "مادلنر" و هاوکارەکانی لە نەخۆشخانەی "شاریتی" پەییان بە ڕاستییەکی پزیشکی برد و تێگەیشتن کە نازاری میزگیرانی "زائربروخ" تەنیا بەهۆی نەخۆشیی "پرۆستات"ەوە نییە، بەڵکوو هۆکاری دەماریش هەیە و لەبەر ئەوەی دەمار پێڕەوی لە فەرمانەکانی مێشك دەکات بۆ دکتۆر "مادلنر" و هاوکارەکانی دەرکەوت کە میزگیرانی "زائربروخ" بەشێکی هۆکاری مێشکییە و رەق و سفتبوونەوەی بەشێك لە شانەی مێشك پێش بەوە دەگرێت ئەو پیاوە بتوانێ میز بکات و لەو ڕۆژەوە هەتا مانگی ژوویە (یەك مانگ دواتر) کە "زائربروخ" لە نەخۆشخانەی "شاریتی" مایەوە، لە ڕێگای بۆرییەوە میزیان پێدەکرد و هەندێ ڕۆژ دوو جار لە ڕێگای ئامێری "ئێلکترۆ ئان سفالۆگرام" کە بان و خوار کردن و هەلۆرەی خانەکانی مێشك لەسەر شریتێك تۆمار دەکات، مێشکیان دپشکنی هەتا بزانن کام بەش لە خانەی مێشکی لەسەر میزگیرانی کاریگەریی هەیە، بەڵام بەهۆی ئەو لۆژە لۆژە کردنانەی کە بە شێوەی هێڵی داشکاو و لاتەریب لەسەر شریتەکە دەردەکەوت، نەیاندەتوانی پەی بە مەسەلە سەرەکییەکە ببەن.

"زائربروخ" نزیك بە یەك مانگ لە نەخۆشخانە مایەوە و ڕۆژی ۲۲ی مانگی ژووئەن، بە جۆرێك باری تەندروستیی بەرەو باشتربوون ڕۆیشت جلوبەرگی لەبەر کرد و لە ژوورەکە وەدەرکەوت و لەناو حەوشەی نەخۆشخانە دەستی کرد بە پیاسەکردن و دواتر سواری یەکێك لە ترۆمبێلەکان بوو کە لەناو حەوشەکە ڕاگیرابوو و ویستی لێی بخوڕێ، غافڵ لەوەی کە سویچی ئەو ترۆمبێلەی پێ نییە و ئەو مەسەلەیە دەریدەخست کە ئەو ڕۆژە "زائربروخ" بیر و هۆشی لەسەرخۆ نییە، چونکە کەسێکی وەك ئەو کە بە درێژایی تەمەنی سواری ترۆمبێل بووە، یان خۆی ترۆمبێلەکەی لێخوڕیوە، دوور بوو نەزانێ بەبێ سویچی تایبەت هەڵکردنی ترۆمبێل مەحاڵە و ناکرێ لێی بخوڕێ.

دوای ئەو ڕۆژە ئیتر "زائربروخ" لە ژوورەکەی خۆی لە نەخۆشخانە دەرنەکەوت و هەمان مانگ (ژووئەن) سەرۆکی نەخۆشخانە دوو کۆبوونەوەی ڕاوێژی پزیشکیی بۆ "زائربروخ" ڕێکخست و سێ پزیشکی دیکەش کە لە دکتۆرانی ئەو نەخۆشخانەیە بوون بانگهێشت کرد، هەتا لەو کۆبوونەوانە بەشدار بن و لە هەردوو کۆبوونەوەکەدا باسیان لەوە کرد کە دەبێ نەشتەرگەری بۆ پرۆستاتی "زائربروخ" بکرێت.

دکتۆر "مادلنر" لەو باوەڕەدا بوو کە "زائربروخ" بە ئەنجامدانی ئەو نەشتەرگەرییە رازی نابێت.

سەرەنجام "زائربروخ" کاتژمێر چواری بەرەبەیانی رۆژی دووەمی مانگی ژوویەی ساڵی ۱۹۵۱ی زایینی پاش ۷۵ ساڵ و دوو مانگ تەمەن، لە نەخۆشخانەی "شاریتی" هەمان ئەو نەخۆشخانەی کە ماوەیەك لە تەمەنی خۆی تێدا بەسەر برد و تێیدا کاری کرد و هەزاران کەسی دەرمان و چارەسەر کرد، ماڵاوایی لە ژیان کرد. دکتۆر "مادلنر" بۆ پەی بردن بە هۆکاری مێشکیی میزگیرانی "زائربروخ" دەیهەویست پشکنین بۆ مێشکی بکات و هەڵی بکۆڵێ، بەڵام "مارگۆ" هاوسەری "زائربروخ" بە توێکاری و پشکنینی مێشکی هاوسەرەکەی رازی نەبوو.

سێ رۆژ دواتر، واتە پێنجەمی مانگی ژوونیە، تەرمی "زائربروخ"یان هەر بەو جلوبەرگەی کەلە هەموو دەورانی کاری پزیشکی و نەشتەرگەریدا لەبەری کردبوو، یانی بە باڵاپۆشی نەشتەرگەرییەوە خستیانە ناو تابووت و لە گۆڕستانی "وان زن" هەڵکەوتوو لە بەرلینی رۆژهەڵات بە خاکیان ئەسپارد.

ئەوکاتەی کە تەرمی "زائربروخ"یان ئەخستە ناو گۆڕەوە خانمی "ئیرم کاد - فری برك" دوایین نەخۆش کە بەدەستی "زائربروخ" نەشتەرگەریی بۆ کرابوو، هاوڕێ لەگەڵ چوار منداڵەکەی لەسەر گلکۆکەی ئامادە بوون و مشتێك خاکی پژاندە سەر تابووتەکەی و دوای ئەوەی کە گۆڕەکەیان بە خاك داپۆشی چۆکی دادا و خاکی قەبرەکەی ماچ کرد. حەفتەیەك دوای مەرگی "زائربروخ" بە پێشنیاری دکتۆر "مادلنر" لە تەلاری "رێنێسانس" لە بەرلینی رۆژهەڵات کۆڕیادێك بۆ ئەو نەشتەرگەرە مەزنە رێك خرا.

لەو کۆڕیادەدا پەیکەرەی نیوە قەدی "زائربروخ"یان لەلای سەرووی تەلارەکەوە لەنێو بەرگ و گوڵدا دانابوو و رەزامەندی درا کە یەکێك لە سەرۆك زانکۆکانی ئەڵمانیای رۆژهەڵات لەو کۆبوونەوەیەدا لەبارەی کەسایەتی و کارەکانی ئەو مامۆستا کۆچکردووەوە بۆ ئامادەبوان قسە بکات. ئەو مامۆستایە پاش ئەوەی کە دەستی بە قسەکانی کرد سەرەتا باسی لە کەسایەتیی بەرز و کارە بەنرخەکانی "زائربروخ" کرد و بە یەکێك لە بلیمەتەکانی بواری پزیشکی و نەشتەرگەری لە قەڵەمی دا و هەڤاڵ و دۆستانی بەو ئاخاوتن و ئەو راستییانە رەزامەندییان نیشان دا، بەڵام دواتر رووی قسەکانی بەرەو لای باری رۆحی و دەروونیی "زائربروخ"دا کێشا و گوتی پیاوێکی ڤیرسیچم، لاسار و سەرسەخت بوو و بەبێ ئەوەی کە لاساریی و بلەوەزیی ناوبراو، دەربڕی هۆکارێکی عەقڵانی و جێگای پەسەند بێت، بۆ وێنە بۆ چەندین جار دەوڵەتی ئەڵمانیای رۆژهەڵات پێشنیاری

پێکرد کە مووچەی خانەنشینیی بۆ ببڕنەوە، بەڵام ئەو قبووڵی نەکرد لە حاڵێکدا هیچ هۆیەکی عەقڵانی بۆ وەرنەگرتنی مووچەی خانەنشینی لە گۆڕێدا نەبوو.

ئەم بەشەی ئاخاوتنی ئەو مامۆستای زانکۆیە، دۆستان و لایەنگرانی "زانربروخ"ی تووڕە کرد و چەند کەسێك بە نیشانەی ناڕەزایەتی دەربڕین بەو جۆرە قسانە هەستان و کۆبوونەوەکەیان بەجێهێشت. دۆستانی "زانربروخ" بۆیە ناڕەزایەتییان نیشان دا، چونکە ئەو مامۆستای زانکۆیە قبووڵ نەکردنی پێشنیاری دەوڵەتی ئەڵمانیا لەلایەن "زانربروخ"ی بە هەڵوێستێکی نالۆژیك و ناعەقڵانی لە قەڵەم دابوو. لە حاڵێکدا "زانربروخ" سەرەتا بەو هۆیەوە مووچەی خانەنشینیی وەرنەگرت، چونکە دەیزانی بەو چەشنە خانەنشین دەکرێت و دوای ئەوەی کە مووچەی خانەنشینی وەربگرێت، ئیتر لەوە و بەدوا ناتوانێ لە نەخۆشخانە دەوڵەتییەکان کار بکات.

بۆ خۆشی چونکە بە درێژایی تەمەنی هیچ مەیل و هۆگرییەکی بە مەسەلەی ماڵی و سامان نەبوو، هەوڵێکی بۆ بنیاتنانی نەخۆشخانەیەکی تایبەت بە خۆی نەدا هەتا لە کۆتایی تەمەنیدا ئەگەر هات و بە هەر هۆیەك پێش بە کارکردنی لە نەخۆشخانە دەوڵەتییەکان بگرن، لەو نەخۆشخانەیەی خۆی کار بکات. هەروەك بینیمان پاش ئەوەی کە دەرگای نەخۆشخانە دەوڵەتییەکان بەڕوویدا داخرا، ناچار بوو لە نەخۆشخانەیەکی کەرتی تایبەت دەست بەکار بێت و دواتر بە شێوەیەکی نزیك بە سەرشۆڕی پێشیان بە کارکردنی گرت.

بەگشتی "زانربروخ" سەرەتا بەو هۆیە مووچەی خانەنشینیی وەرنەگرت کەلە کاری نەشتەرگەری وەلا نەنرێت سەرەنجام رازی بوو ئەو مووچەیە وەربگرێت، بەڵام پێیان نەدەدا. یەك رۆژ دوای ئەو کۆڕیادە رۆژنامەی "درنابەند"ی چاپی ئەڵمانیای رۆژئاوا، بە توندی هێرشی کردە سەر ئەو مامۆستایەی کە یەك رۆژ پێشتر قسەی ناشیرینی بە "زانربروخ" کردبوو و نووسی ئەو کەسە وەکوو زۆر کەسی بێتەسك و بێ توانا پێیان وایە ئەگەر هێرش بکەنە سەر کەسانی و مەزن و بە سووك و بچووکیان لە قەڵەم بدەن، خۆیان گەورە دەکەن، غافڵ لەوەی کە مێژووی زانست زۆر بە راشکاوانە ناوی "زانربروخ" وەك نەشتەرگەرێکی داهێنەر و بلیمەت لە لاپەڕەکانی خۆیدا تۆمار کردووە و لەوانەیە هەتاهەتایە هاوشێوەی "زانربروخ" لە دنیای نەشتەرگەریدا سەرهەڵنەدات.

رۆژنامەی "تێلێگراف" چاپی ئەڵمانیای رۆژئاوا نووسی ئەو سەرۆك زانکۆیەی کەلە کۆڕیادی "زانربروخ"دا قسەی کردووە، بیرمەندێکی مێشك بەتاڵ و رواڵەتییە کە پۆستی سەرۆکی زانکۆی بە ململانێی سیاسی بەدەستهێناوە و دەبێ هەر بەو سات و سەودا و پیلانگێڕییەش بیپارێزێ و بۆ ئەوەی زمانلووسی بۆ حکوومەت و ئەڵمانیای رۆژهەڵات بکات، وای نیشان داوە کە ئەوان

ویستوویانە مووچەی خانەنشینی بۆ "زائربروخ" ببڕنەوە و خۆی قبوولی نەکردووە، لە حالێکدا هەموان دەزانن کاتێك "زائربروخ" لە نەخۆشخانە خەوێنرابوو، هاوسەرەکەی هەتا ئەو جێگایەی دەگونجا پەنای بردە بەر زۆر لایەنی دەسەلاتدار هەتا مووچەی خانەنشینی بە مێردەکەی بدرێت، بەلام پێیان نەدا. "زائربروخ" بەو هەموو خزمەتە بەرچاوەی کە بە زانستی پزیشکی و مرۆڤایەتی کردی، لەوپەڕی هەژاری و دەستەنگیدا مرد و ئەمەش یەکێك لە شانازییەکانی ئەو پیاوە بلیمەتەیە کە بە درێژایی تەمەنی بە زانست و هونەری خۆی، هەزاران مرۆڤی لە مەرگ رزگار کرد، بەبێ ئەوەی کە هەولی کۆکردنەوەی پارە و مولك و سامان بدات هەتا لە دەورانی پیریدا سوودی لێ ببینێ.



هەتا ئەوکاتەی "زائربروخ" لە ژیاندا بوو، ئیرەیی کە لەناو توێژی پزیشك و نەشتەرگەرەکانیش وەکوو توێژەکانی دیکە لە ئارادایە، بووە هۆی ئەوەی کە نەشتەرگەر یان پزیشکێکی ئەلمانی سەربوردە و ئەزموونەکانی ژیانی "زائربروخ" بۆ خستنە روو و تۆمارکردنی کارە زانستی و پزیشکییەکانی تۆمار بکات. ئەو کتێبەش کە خودی "زائربروخ" ژیان و سەربوردەی خۆی بۆ "برون دروف" گێڕایەوە، بەداخەوە بەهۆی نەخۆشی و مەرگی ئەو پزیشکە بلیمەتە، بە تەواوەتی پێداچوونەوە نەکرا و چەند بەشێکی ئەو کتێبە، بەدەر لە بابەتی سەرەکی و پڕن لە رووداوی ناڕاست و نزیك بە ئەفسانە و هەتا ئێستا شیکردنەوەیەکی کامل لە کۆی کارە زانستییەکانی "زائربروخ" بە ئاگاداریی خەلك نەگەیشتووە و لە داهاتوودا دەبێ نەشتەرگەر یان پزیشکێك هەلکەوێت و ژیان و کەسایەتیی "زائربروخ" و داهێنان و زانستە پزیشکی و نەشتەرگەرییەکانی بە جۆرێك کە شایستەی هونەر و زانستی ئەوە بە خەلکی دنیا بناسێنێ.